ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری ولاوان

پرۆفیسۆر
ک . ک . کوردۆییێف

# رێزمانی کوردی



بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی وسۆرانی

دکتۆر
کوردستان موکریانی

لەزمانی روسیەوە وەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی

١٩٨٤

ـه بلاوكراوه‌كانى
ـيندارێتى‌ى گشتى ڕۆشنبيرى‌و لاوان
ـچه‌ى كوردوستان
ـنيره (٤)

# پرۆفيسۆر

# ك.ك. كوردۆيێڤ

# ڕێزمانى كوردى

# به كه‌ره‌سته‌ى دياليَكتى كرمانجى‌و سۆرانى

دكتۆر
كوردستانى موكريانى
له زمانى روسيه‌وه وه‌رى‌گێراوه‌ته سه‌ر زمانى كوردى

هه‌ولێر
١٩٨٢

# پێشەکی وەرگێر

گرنگی ئەم ڕێزمانە لە جۆری بابەتەکەی دایە ، کە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردەلۆژیدا لەسەر بناخەیەکی زانستانە بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروودا لە زۆربەی هەرە بەشی فۆنۆلۆژیو مۆرفۆلۆژی زمانی کوردی دەکۆڵدرێتەوە .

سەرباری ئەوەی ئەم بەرهەمە سەدان کێشەی زمانەوانی روون دەکاتەوەو چەندین باری رێزمانیو تایبەتێتی زمانەکەمان دەخاتە روو ئەنجامی بەراوردکارییەکەی دەمانگەیەنێتە یەکبونو لێکچوونو یەکێتی تەواوی رێزمانی کوردی .

نووسەری ئەم رێزمانە پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆیە ، کە هەموو ژیانی خۆی بۆ راژەکردنی زمانو ویژەو مێژوو و فۆلکلوری کوردی تەرخانکردووەو دەیان لێکۆڵینەوەو پەرتووکی دەربارەی رێزمانی کوردی داناوە ، کە ئەمەیان لە هەمووان دەوڵەمەندترو تازەترە .

وەرگێرانەکەم بەپێ دەسکاریکردووە ، هەوڵمداوە بیری نووسەر بە زمانێکی پاراوو ئاسان بگەیەنمە خوێنەر ، تەنانەت ناوی دیالێکتەکانیشم هەر وەکو دانەر خۆی نووسیوە ، کە نێوی (کرمانجیو هێندیك جار ژووروو) بەرامبەر بە دیالێکتی ژووروو و (سۆرانی وەیا خواروو) بەرامبەر بە کرمانجی خواروو بەکارهێناوەو هەر دیاردەیەکی رێزمانیش ، کە سەرنجی تایبەتی خۆم بەرامبەری هەبووبێ لەپەراوێزدا روونکردۆتەوە .

ئەم بەرهەمە گرنگەی دکتۆر قەناتی کوردۆ پشتگیری ئەو رێبازە دەکا ، کەوا چەند رۆشنبیرێکی کورد هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هەوڵیان بۆداوە وەکو ، تەوفیق وەهبی ، گیوی موکریانی ، دکتۆر جەمال نەبەز دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول ، دکتۆر کامل بەسیر ، سادق بەهادینی ئامێدی ، حەمە ئەمین هەورامی ، دکتۆر وریا عومەر ئەمینو وەرگێری ئەم رێزمانەو کەسانی دی .

لەو باوەرەدام لە وەرگێرانەکەمدا چەند خزمەتێك پێشکەش بە خوێنەری بەرێز دەکەم ، یەکەمیان : تێگەیشتن لە بەرهەمێك ، کە بە زمانی رووسی نووسراوە ، دووەمیان : روونکردنەوەی یەکبوونی هەردوو دیالێکتە سەرەکیەکەی زمانی کوردی ، سێیەمیان : بوونی ئەم بەرهەمە بە کەرەستەیەك بۆ لێکۆڵینەوەکانی رێزمانی داهاتوومان .

هەولێر ١٩٨٢/١١/٢٠

# پێشەکی

سەرەتای لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیو دیالێکتەکانی لە ئەوروپادا پێوەستە بە پەیدابوونی یەکەمین ڕێزمانی کوردی (١٧٨٧) ، کە لە لایەن م . گارزونی‌یەوە نووسراوە نووسەری ئەم بەرهەمە مسیونێرێکی کاثولیکی بووە ، هەژدە ساڵ لەنێو کوردانی نێوچەی ئامێدی‌دا ژیاوەو فێربوونی زمانیان یارمەتی نووسینی ئەم کارەی داوەو گەیاندوویەتە مەبەست .

لە پێشەکی‌یەکەی‌دا دەڵێ : بۆیە ئەم ڕێزمانەی نووسیوە ، تاوەکو کاری مسیۆنێری بۆ ئاسان بێت ، لە کاتی پێوەندیو هەڵسو کەوتی‌دا لەگەڵ کورداندا .

ئەم ڕێزمانە بریتی‌یە لە کورتەیەك ئەلفوبێ ، ناوی ژمارە ، ناو ، کار و هێندێك بەشانی دی ئاخافتنو فرێزو ووتووێژی (باوکمان) و (سلاوی مریەمی) ، لەکۆتایی ڕێزمانەکەدا فەرهەنگۆکێکی ئیتالی – کوردی قەوارەی (٢٢٠) لاپەرەیی هەیە .

لە بەشی ئەلفو بێ‌دا نووسەر دەنووسێ : زمانی کوردیو فارسی بەرادەیەك لێك‌نێزیكن دەتواندرێ بە ئاسانی ئەلفو بێ‌ی فارسی بۆ زمانی کوردی بەکاربێت ، کە لەلایەن نووسەرەوە فارسی زمانێکی ویژەیی‌یە .

ئەم بیرورا بێ‌بنجو بناوانە لەگەڵ باری فیلۆلۆژی ئێرانی ئەمرۆدا ڕێك‌ناکەوێت . لە کاتێك‌دا کاری م . گارزۆنی ، کە نێزیکەی دوو سەد ساڵ لەمەوبەر بلاوکراوەتەوە . تاماوەیەکی زۆر واتاکەی هەر کاریگەر بوو . پ . لیرخ دەنووسێ : « ڕێزمانی م . گارزۆنی هانی زانایانی ڕۆژئاوای‌دا بۆ ئەوەی لە زمانی کوردی بکۆڵنەوە . فیلۆلۆژی ئێرانی پێویستی بە لێکوڵینەوە لە تایبەتێی ڕێزمانی کوردی هەیە ، چونکە ئەم لێکۆڵینەوانە یارمەتی روون‌کردنەوەی هێندێك دیاردەی زمانی ئاڤێستا دەدەن .»

دوای کارەکانی م . گارزۆنی تا نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەم ، هیچ کارێکی ڕێزمانی تایبەت بە زمانی کوردی‌یەوە نەهاتە ئارا ، لە سەرەتای نیوەی سەدەی نۆزدەم‌دا هێندێك ووتارو باسی گەرۆکان ، کە دەربارەی زمانی کوردیو دیالێکتەکانیو شوێنی زمانی کوردی لەنێو زمانە ئێرانی‌یەکان‌دا بوو چاپ‌کرا . ئەمانە بەرهەمی گ . خیورنل ، ی . ریودیگەر ، ئا . پۆت . ئا .خودسکو ، ی . بیریزن و هی دی بوون . نێوەرۆکی ئەم کارانە لەنێو بەرهەمی کوردناسی ڕووس – (پ . لێرخ) هاتوون (٣٨ ، ١ ، ٣٤ ، ٤٣) .

گ . خیورنل ماوەیەکی دریژ لەنیو کوردانی نیوچەی جیاجیای کوردستان‌دا وەکو مسیۆنیر ژیاوە و فیرە زمانی کوردی بووە . لە سالی ١٨٣٦ و ١٨٣٧ دا ژمارەیەك ووتاری ئیتنۆگراف دەربارەی کورد وبەشە دیالیکتەکانی زمانی کوردی چاپ کردووە (٣٨ ، ١ ، ٣٧ ، ٣٨) .

نووسەر دەلی : « دیالیکتی ژووروو و خواروو زۆر لیك‌جیان ، بەلام هیندیك بەشە دیالیکت خزمایەتیکی نیزیکیان لەگەل یەك‌دا هەیەو هۆزەکانی ئەم دیالیکتانە بە ئاسانی لیك دەگەن لەگەل ئەوەش‌دا گ . خیورنل دانی بەیەك بوونی زمانی کوردی‌و فارسی ناوە سەربەخۆیی زمانی‌کوردی‌و نیزیك بوونی لە زمانی فارسی‌یەوە و خزمایەتیان لەگەلی‌دا لەلایەن ئەم لیکۆلەوەرانەوە دانی‌پیدانراوە ، کە لەسەر بناخەی ئەو کەرەستە زمانەوانی‌یانەوە بووە ، کە لەلایەن م . گارزۆنی ، گیولدینشتید ، کلاپرۆ ، ریچ هەروا ئەو لیستە وەرگیراوانەی ، کە لە زمانی فارسیەوە بۆ سەر زمانی کوردی‌بووە و لە لایەن گ . خیورنل‌و زانایانی ئەلمانی ی . ریودیگەر و ئا . پۆت ئامادەکراون‌و زنجیرەی ووتارەکانی خۆیان ، کە دەربارەی زمانی کوردی بووە چاپ کردووە (٧٨)

بەراوردکردنی ووشەی فەرهەنگی گیان‌داران‌و کشت‌وکالان لەگەل ووشەی فەرهەنگی زمانی‌دی ئیرانی (فارسی کۆن ، ئاڤیستا ، فارسی نوی و هی دی) ئەوەی بۆ ی . ریودیگەر و ئا . پۆت روون‌کردەوە ، کەوا زمانی کوردی لەرووی ووشەو ریزمانەوە بە زمانیکی سەربەخۆی ئیرانی دەژمیردریت . ئەم نووسەرانە بۆ ئەوە چوون ، کەوا زمانی کوردی‌و زمانی فارسی لە کۆن‌دا لەیەك زمانەوە (زمانی دایك) پەرەیان سەندووەو لیکیش جیابوونەتەوە ، بەواتا دیالیکتی لیك نیزیکی یەك زمان بوون ، بەلام لە دوایی‌دا لە ئەنجامی پرۆسیسی پەرەسەندن‌دا لیك جیابوونەتەوە . ئەم پەرەسەندنەیان بووە هۆی لیك دوورکەوتنەوەیان‌و پەیدابوونی زمانیکی سەربەخۆ .

نووسەران بۆ وینە روونی دەکەنەوەو دەلین : زمانی کوردی زیتر گۆرانی بەسەردا هاتووە ، وەك کورت بوونەوەی ووشە ، تیکدانی بزوین ، کەم‌کردنەوەی گەردان‌کردن ، زمانی پاشگوی ووشەی داریژەر ، نەمانی کاری سادەو گۆرینیان بە کاری یارمەتی‌دەری جۆراجۆر ، جا ئەوسا وەکو زمانی فارسی بوو بە زمانیکی ویژەیی‌و تایبەتیتی خۆی پاراست‌و بەریگەی تایبەتی خۆی پەرەی‌سەند . ( ٣٨ ، ١ ، ٤١) .

بەم جۆرە باسکردنەی پ .لیرخ ، کە لەلایەن (ی . ریۆدیگیر و ئا .پۆت)ەوە روون‌کراوەتەوە . ئەم زانایانە لەکارەکانیان‌دا شوینیان بۆ زمانی کوردی لەنیو زمانانی ئیرانی‌دا بەدیار خستووەو ئەمە بووە هۆی رووتیکردنی ئیرانی ناسان بۆ لیکۆلینەوە لە زمانی کوردی‌دا .

له ساڵی ۱۸۵۳دا ئا .خودسکۆ – فیلۆلۆژی ئێرانی ناس سوودی له بوونی خۆی له پاریس دا وەرگرت ، بۆ ئەوەی به یارمەتی ئەحمەد خان ، که له هۆزی بابان (نیۆچەی سلێمانی) بووه ، خۆی فێره زمانی کوردی بکات . له ئەنجامی کارکردنی ئا . خودسکۆ لەگەڵ ئەحمەدخان دا کەرەستەیەکی زۆری نووسیوەو کورتەیەکی ، ڕێزمانیشی خستەپاڵەوه ، که تەنیا بەشه دیالێکتی نیۆچەی سلێمانی دەگرێتەوه (٦٢) له کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دا لێکۆڵینەوه سەبارەت به کوردو زمانی کوردی یەوه له ڕووسیادا لەلایەن زانایانی ڕووسەوه دەستی پی کرا . پێشڕەوی ئەم کاره ف . دیتیل ، خ . ئەبۆڤیان ، ی . بیریزین ، پ . لێرخ و هی دی بوون .

ف . دیتیل ، که ماوەی سێ ساڵ بەگەڕۆکی لەکوردستان دا بووه توانیویەتی کەرەستەیەکی زۆری ئەتنۆگرافی و فۆلکلۆری کۆبکاتەوه ، که دەربارەی چەند هۆزێکەو لەگەڵ زمانەکەیان . نووسەر ئەم بەرهەمەی خۆی له ووتارێك دا ، که به ناوی سەرنجی سێ ساڵەی گەڕۆکی لەرۆژهەلاّت دایه بلاّو کردۆتەوه (۱۹) .

ف . دیتیل تێبینی به کەڵکی لەسەر تایبەتێتی کوردستان و زمانی کوردی و دیالێکتەکانی داوه .

ف . دیتیل دەنووسێ : « تێپەڕبوونم به دیاربەکر ، تاسنووری سووریا هێندێك سەرنجی پێوەندی جوگرافی و ئەتنۆگرافی پی بەخشیم . ڕێگەکەم ماردین ، دیاربەکر ، نەسیبین و ئورفەی گرتۆتەوه . ئەم نێوچانەی ، که من پێیان دا تێپەڕیم به پارچەیەکی کوردستان دەژمێردرێن ، بەلاّم کەم ناسراون . ئێمه تا ئێستا هیچ نووسراوێکمان نییه ، که سەبارەت باری ئەتنۆگرافی ئەم هۆزانەی نێوچەی ئاسیابن . بۆ فراوان کردنی لێکۆڵینەوه له دیالێکتی نوی دا بایەخێکی تایبەتیم بەو کەرەستانه داوه ، که تەواوکەری ئەم بەشەی جوگرافی یه ، وەدەست خستنی ئەم جۆره زانیاریانه به بەشێکی گەورەی کاری خۆم و هەوڵ دانم دژمێردرێت . من ئەم بەرهەمەی خۆم له (۳۰۰) سێ سەد هۆزی کوردی کۆکردۆتەوه و لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژ دەربارەی کوردستان لەوانەیه تیشك بخاته سەرباری دێرینی ئەم هەرێمانەی تورکیا (۱۹ ، ۹) . دەربارەی زمانی کوردان نووسەر وای نووسیوه : « من وام بۆ دەرکەوت ، کەوا دابەش دەبێته سەر کۆمەڵێك دیالێکت ، که تائێسته کەس هیچی دەربارەیان نەنوسیوه هەرێمی کوردەواری بەشێك له تورکیا دەگرێتەوه بۆیه کاریگەری زمانی تورکی بۆ سەر زمانی کوردی ئاشکرایه .

له زمانی کوردانی فارس دا کاریگەری فارسی بۆسەرزمانی کوردی هەیه . زمانی عەرەبی کاریگەری بۆسەر زمانانی تورکی و فارسی هەیه . که تا له زمانی کوردی وبێژەبیش دا کاریگەری دیاره» (۱۹ ، ۹) هەروا دیسان دەنووسێ : « لەك به زمانێك قسەدەکەن ، که لەگەڵ لورو

بەختیاریدا جیاوازە و زمانی وێژەیی خۆیان هەیە . ئەم بەشە دیالێکتە کوردیانە لەگەڵ بەشە دیالێکتی سێیەم ، کە لەلایەن منەوە کوردین بە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکانی من دەژمێردرێن .»
(١٩ ، ٩) .

ف . دیتیل وای دانابوو ، کەوا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی بە مێژوو و زمانو و دیالێکتی کورد چاپبکات ، بەلأم کۆچی دوواییکردنی بووە هۆی تەواونەکردنی ئەم کارەی .

لە ساڵی ١٨٤٨دا لە سەر لاپەرەکانی رۆژنامەی قەفقازدا ، کە لە تبلیس دەردەچوو ، خ . ئابۆڤیان لەژێر ناونیشانێکی گشتیدا (کوردان) (١) چەند ووتارێکی بلأوکردەوە ، کەلەنێویاندا زانیارییەکی بە کەڵکی دەربارەی مێژوو و ئەتنوگرافییانی کورد پێشان داوە ، هەروا تایبەتێتی کۆمەڵی کوردەواری دەخاتەروو لە پێوەندی خێزانی ، شێوەی ژیانیان ، خوورەوشتو دابو نەریتو زمانەکەیان (٢٢) . لە کۆتاییدا زمانی کوردی دابەش دەکاتە سەر زازاو کرمانجی داوای لە زانایانی گێتی کردووە ، کەوا روو لە لێکۆڵینەوەی ئەم گەلە خانەدانەو زمانەکەشیانبکەن ، چونکە کارکردن لەنێو ئەم خاکەدا بە پیتو دەوڵەمەندەدا لەوانەیە چاوەرێی سوودێکی زۆری لێبکرێ بۆبابەتی مێژوو و زمانەوانی(١ ، ژمارە - ٤٧) .

ی . بیریزین پرۆفیسۆری زانکۆی کازان لە کاتی گەرۆکی خۆی بە هەرێمی رۆژهەلأتی نێزیکدا فێری دیالێکتی خوراسانو بەشە دیالێکتی کرمانجی موسلبوو ، یەکەمیان لە تارانو دووەمیان لە موسل .

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی لە ساڵی ١٨٥٣دا چاپکرد . ئەو زانیارییە رێزمانییەی ، کەری . بیریزین دەربارەیبەشەدیالێکتەکانی زمانی کوردی پێشکەشی کردوون زۆرکەمو هەژارن . بەکورتی باسی ناو ، ئەوەڵناو و کاتەکانی کاری کردووەو بۆ وێنەش رستەی جۆراوجۆری بەشە دیالێکتەکانی خوراسانو موسلی هێناوەتەوە . ی . بیریزین دەربارەی خزمایەتی و جیاوازی زمانی کوردیو فارسی بەو جۆرە روونی دەکاتەوە هەروەکو پ . لێرخ (تەماشای پێشووبکە) باسیکردووە . ئەم نووسەرە دەڵێت : « زمانی کوردی زمانێکی زیندووەو قسەی پێ دەکرێتو ژمارەیەکی زۆریش لەووشەو شێوەی رێزمانیو کەتیگۆری ئێرانی کۆنی پاراستووە» لەنێوان ئەو زانایە رووسانەی ، کە لە زمانیکوردیو ئەتنۆگرافی کوردیان کۆڵیوەتەوە ، پ . لێرخ- رۆژهەلأتناسیمەزن جیا دەکرێتەوە . نێوبراو سێ بەرگە لێکۆڵینەوەی دەربارەی کوردی ئێران نووسیوەو لە سالأنی ١٨٥٦ ، ١٨٥٧ - ١٨٥٨ دا لەپیتربورگدا بلأویکردۆتەوە .

پ .لێرخ بەنێرراوی لەلایەن کۆڕی زانیاری ڕۆسلۆڤەوە بۆ لای دەست بەسەرانی کوردەوە نێرراوە . نێوبراو سێ مانگی لە نێوانیاندا بردۆتەوەسەر ، ئەمانە سەر بە هەرێمی ماردین ، جەزیرە ، دەرسیم ، موش ، دیاربەکر ، ئورفە ، خەرپووت ، بەگەسن ، مالاتە ، مەدینە ، ئاربیکرو ئەرزەرووم بوون . ژمارەیان لە (٥٠) پەنجا کەس زێتربوو زۆربەیان بە دیالێکتی کرمانجی و هێندێکیشیان بە زازا دەدوان . پ . لێرخ لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی‌دا ئەوانەی دەربارەی کوردو زمانەکەیانە ، بە دوورو درێژی لەسەر مێژووی کورد ، زمانی ، بەرهەمی میللی و ئەتنۆگرافی نووسیوە (٣٨ ، ١١) .

پ . لێرخ زمانی کوردی دابەش کردۆتە سەر پێنج دیالێکت کرمانجی ، لوری ، کەلهوری ، گۆران و زازا . لەوانەدا بۆی هەڵکەوت ، کەوا لە کرمانجی و زازا بکۆڵێتەوەو لە هەرسێ بەرهەمەکەی خۆی‌دا تێکستو فەرهەنگی کوردی – ڕووسی بلاوکردۆتەوە .

دەربارەی دیالێکتی کرمانجی دەنووسێ ، کەوا لە هەموو بەری ڕۆژئاوای کوردستان‌دا بلاوبۆتەوە ، لەموسڵەوە تا ئاسیای بچووک و سلێمانی . نووسەر هێندێك ئەو ووشەو ئەو بارە ڕێزمانی‌یە جیاوازانە دەخاتە ڕوو ، کە لە نێوان هۆزەکانی ژووروو و خوارووی فورات‌دا هەن . دەربارەی پێوەندی نێوان زازاو کرمانجی‌دا دەڵێ بۆ بەراوردکردنی کرمانجی لەگەڵ زمانەکانی دی ئێرانی‌دا لەبەر تایبەتێتی دەنگ و شێوەی دەتواندرێ ناوی ئیدیۆمی سەربەخۆی ئێرانی لێ بنێیت .

لێرەدا ئەویش لەو باوەڕەدایە ، کەوا زازا لە دیالێکتی کرمانجی‌یەوە سەری هەڵداوە (٣٨ ، ١١ ، ٢٢) پ . لێرخ هەروەکو ئا . پۆت دانی بەوەدا ناوە ، کەوا زمانی کوردی بەزمانێکی سەربەخۆی گرووپی ئێرانی دەژمێردرێت ، دەربارەی ئەمە پ . لێرخ دەنووسێ : (من هیچ هۆیەك شك نابەم ، بۆ ئەوەی لەم رایە لادەم ، کە لەلایەن پرۆفیسۆر ئا . پۆتەوە بە بەڵگە چەندین جار باسکراوە ، کەوا زمانی کوردی شوێنێکی سەربەخۆی هەیە لەنێوان گرووپی زمانانی ئێرانی‌دا (٣٨ ، ١١ ، ٢٢) و زمانەکەیان لەنێو جەرگەی کوردستان‌دا پارێزراوەو بەسەربەخۆیی لە زمانی فارسی‌یەوە پەرەی‌سەندووەو خزمایەتێکی زۆر نێزێکیشی لەگەڵ‌دا هەیە (٣٨ ، ١ ، ٣٣) .

نووسەر دەربارەی گەلی کوردەوە دەڵێ چەند هۆزێکن لە نێوەراستی کوردستان و هۆزی دیش لە خوارووی ڕۆژهەلات‌دا هەن ، بەواتە لوری . شێوە دیالێکتەکانی بەری خوارووی ڕۆژئاواو ژووروی ڕۆژئاوا تێکەڵە بە زمانی گەلانی دی وەکو گورجی ، ئەرمەنی وعوسمانی ، بەلام زمانی کوردی لەم بارانەدا هەمیشە هەر ئەو دەسلاتتربووە (٣٨ ، ١ ، ٣٣) .

ئەم سەرنجانەی ، کە تایبەتێتی زمانی کوردی دەست‌نیشان دەکەن لەکاتێك‌دا ووتراون ، کەوا هیچ لایەنێکی زانستانە لێك نەدرابوونەوەو هێندیك زاناش زمانی کوردی‌یان بە دیالێکتی زمانی فارسی ژماردووە . لێکۆڵینەوە لەم کارەگرنگەدا تەنیّو سەربەخۆ نەکراوە بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی لەبواری ئێرانی ناسی‌دا کراوە . دەربارەی ئەمە پ . لێرخ تێبینێکی راستی کردووە ، کاتی‌گوتوویەتی ، کەوا بەراوردکردنی زمانی کوردی لەرووی رێزمان‌و ووشەی فەرهەنگی‌دا لەگەڵ زمانانی دی ئێرانی ئەمڕۆدا یەکسەر بە شێوەیەکی فراوان ناکرێ (٣٨ ، ١ ، ٤٢) هەروا ووتوویەتی لێکۆڵینەوەیەکی بنچینەیی دیالێکتەکانی زمانی کوردی‌و سەرنجی راستی ئەو جیاوازی‌یە ووردانەی نێوانیان هەتا ئێستە تەواو نەبووە (٣٨ ، ١ ، ٣٣) .

کارەکەی پ . لێرخ ، کە دەربارەی فەرهەنگی کوردی‌و تێکستی کوردی‌یەو بە زمانی رووسی روون‌کراونەتەوە دەورێکی گرنگیان لەرووسیاو ئەوروپادا گێراوە بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی‌دا لەدوای ئەودا .

زانای نەمساوی – ف . میوللەر لە ساڵی (١٨٦٤ – ١٨٦٥)دا لەسەر بنچینەی بەرهەمەکانی ی . بیریزین‌و پ . لێرخ‌دا کورتەیەکی رێزمانی دەربارەی کرمانجی‌و زازای بلاّوکردۆتەوە ، کە لەگەڵیان‌دا نووسینی فۆنەتیکی زمانی فارسی نویّو شێوەی ناوو ئاوەڵناوو کاریشی داوە (٧٥ – ٧٦) .

ف . میوللەر لە لێکۆڵینەوەی دیالێکتەکان‌دا هەڵەی شێوەی رێزمانی زۆر گرنگی کردووە . بۆوێنە ئامرازی خستنەسەری (ا ، – یّ ، ی) کە لە کرمانجی‌دا رەسەن پێشان‌دەدات ، نووسەر وەکو بگر (affix)ی تەماشا کردووە ، کە بەرامبەر بەو نیشانانە لە دۆخی خستنەسەری ناودا لە زمانانی دی ئێرانی‌دا هەن . شێوەی دارشتنی کاری رابردووی تێپەر لەباری ئەری‌دا لەگەڵ کاری نەرێی زمانی فارسی لەیەك رێژەدا داناوە . لەپێشەکی کورتە رێزمانەکەی خۆی‌دا نووسیویەتی کەوا زمانی کوردی بە هیچ بارێك لە زمانی فارسی‌یەوە پەرەی‌نەسەندووە .

دارشتنی رێزمانی کوردی لەگەڵ ئەوەی لە زۆربەی یاساو رێزمانی فۆنەتێکییەوە لە فارسی دەچێت ، بەلاّم ئەو (زمانی کوردی) لە هێندیك پێوەندی‌دا بە شێوەیەکی سەربەخۆ پەرەی سەندوو . لەنێو زمانی کوردی‌دا کۆمەڵە ووشەیەك هەیە ، لەرووی ژمارەوە کەم نین ، کە لەنێو زمانە ناسراوەکانی دی ئێرانی‌دا نین .

ف . میوللەر بۆ لێکۆڵینەوە لە زانستی زمانەوانی ئێرانی بایەخێکی تەواو بە زمانی کوردی دەدات و دەڵێ : ( رووبەکردنەوەی زمانانی ئێرانی تەواو نابێت ، گەر لە فۆنەتیك‌و دارشتنی ووشەی زمانی کوردی نەکۆڵدرێتەوە (٧٥ – ٧٦) .

ئا . ژابا لە ساڵی ١٨٦٠ دا کۆمەڵێك چیرۆکی کوردی لەگەڵ سەرنجو روونکردنەوەی وێژە کوردی بلاّوکردۆتەوە . ئەم کۆمەڵە چیرۆکە هەتا ئەمرۆش بە سوودە بۆ کوردناسان لە رووی مێژوو ، ئەتنۆگرافیو زمانی کوردانی کوردستانی تورکیا . چیرۆکەکان سەر بە بەشی ژووروو و رۆژهەلاّتی دیالێکتی کرمانجین .

ئا . ژابا بە یەکەمین فەرهەنگدانەری فرێزیۆلۆژی کوردی دەژمێردرێت ، کە ژمارەی فرێزەکانی (١٥) پازدە هەزار ووشەن ئەم فەرهەنگو تێکستە کوردییانەی ئا . ژابا دەورێکی بالاّیان بۆ لێکۆڵینەوە لەزمانی کوردیدا بینیوەو هەتا ئەمرۆش نرخو واتای گرنگی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوە لە وێژەو فۆلکلۆری کوردیدا لە دەست نەداوە .

مسیۆنێری ئەمریکی – س .ریّ لە ساڵی ١٨٧٢دا رێزمانێکی کورتی بلاّوکردۆتەوە . نێوبراو ماوەی (١٤) چواردە ساڵ (لە ١٨٥١) تا (١٨٦٥) لەنێو کوردانی هەکاریدا ژیاوە .

قەوارەی ووتارە رێزمانییەکەی س .ریّ پەنجا لاپەرەیەکە ، کە باسی فۆنەتێكو لە مۆرفۆلۆژیشدا باسی ناو ، ئاوەڵناو ، ژمارە ، جیّناوو کاری تێدایە فەرهەنگۆکێکی کوردی – ئینگلیزی بیست لاپەرەیی کردووە بە پاشکۆی رێزمانەکەی . ئەم ووتارەی س . ریّ . رایەکی باش بەدەستەوە دەدات . لە نێویدا گەردانکردنی شێوەکانی کاری تێپەرو تێنەپەرو کاتەکانی ، دۆخی راستەوخۆو تیانی ناوو جیّناوی پێشانداوە .

ف . یوستی ، کە یەکێکە لە ئێرانی ناسە مەزنەکان لە ساڵی ١٨٨٠دا رێزمانێکی زانستی کوردی بلاّوکردەوە . کەرەستەی ئەم رێزمانە کارەکانی گەرۆکان : م . گارزۆنی ، ئا . خۆدسکۆ ،س .ری ،پ .لێرخو ئا . ژابا بووە .

ف . یوستی لە پێشەکی بەرهەمەکەیدا باسێکی گشتی کورد و زمانەکەیو مێژووی دەکات .

بەشی یەکەمی رێزمانەکەی دەربارەی فۆنەتیکەیە ، سەبارەت بە تایبەتێی فۆنیمی بزوێن نووسەر گەیشتۆتە هەبوونی بزوێنی کورتو درێژ بۆیە ژمارەی بزوێن لەلای ئەودا زۆر لەبوونی خۆی زێترە .

لەنێو نەبزوێنیشدا دەنگی گەرویی ك ،پ ،ت ودەنگی لەرزۆکی چ و دەنگی لەرۆکی رِ تۆمارنەکردووە .

نووسەر کەتیگۆری رێزمانی کوردی لەگەڵ زمانانی دی ئێرانیدا بەراوردکردووەو هەروا پلانێکی دوورو درێژی مێژووی فۆنۆلۆژی زمانی کوردی ، هۆی گەردانکردنی کاری تێپەرو تێنەپەرو شێوەکانی ناوی داوە . لەبەر ئەوەی ف . یوستی هەوڵیّ داوە ئەم دیاردانەی سەرەوە لە زمانانی دی ئێرانیشدا روونبکاتەوەو لەگەڵیاندا بەراورد بکات نەیتوانیوە بگاتە مەبەستو

دەستورێکی ڕێزمانی کوردی ڕاستی نەخستۆتە ڕوو . بۆ وێنە گەردان کردنی کاری ڕابردووی زمانی کوردی وەکو دارشتنێکی نادیار تەماشا کردووەو تێبینی جیاوازو شێوەو واتای ناوو ئاوەڵناوی نەکردووە ، کە دەوری نهاد ، بەرکار لەگەڵ کاری ڕانەبردوو و ڕابردوودا دەگێڕێ .

جیاوازی نێوان زمانی کوردی ئەمڕۆو زمانی فارسی نوێ بۆ دەنگەکانی جۆراوجۆری فارسی کۆن دەگەڕێنێتەوە . لەم بارانەدا جیاوازی نێوان شێوەکانی خستنەسەر ( ـا ، ـێ ، ی ، ـە)و شێوەکانی دۆخی تیان (ـی ، ـێ) دانەناوە . تێبینی جیاوازی نێوان ڕەسەنو ژمارەی نەکردووە ، بەڵکو هەروەکو دیاردەیەکی فۆنەتیکی تەماشای کردووە . لەبەشی ووشەی دارێژراودا سنووری لەنێوان ئەو ڕەگەزانە دانەناوە ، کە ووشەی گۆڕاوو ووشەی دارێژراوپێك دەهێنن (٦٩ ، ١٠٢ ، ١١٦) کەم و کورتی بەرهەمەکەی ف . یوستی لەڕووی یە لێکوڵینەوە بەراوردکاریەکەی دایە ، کە لەسەر بنچو بناوانی زمانی فارسی کۆنو نوێو زمانی دی ئێرانی لەگەڵ زمانی کوردیدا کردووە . نووسەر بایەخێکی زۆر بەو ووشە بیانیانەی داوە ، کە لەنێو زمانی کوردیدا هەنو هەوڵیداوە ئەوە پێشان بدات ، کەوا زۆربەی ڕێزمانی کوردی دیاردەی ڕێزمانی زمانانی دی ئێرانی یە . لەگەڵ ئەوانەشدا هەموو بەرهەمەکەی ف . یوستی بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیدا ، تا ئەمڕۆ بە تاکە کاری بەراوردی مێژوویی دەژمێردرێت هەر بۆیەیە هەتا نهۆ نرخی خۆی لە بواری کورناسیدا لە دەستنەداوە .

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا ئا . سوتسین (٨١) ووتارێکی کورتی ڕێزمانی بلاوکردەوە ، کە لەسەر کەرەستەی زمانی کوردییەوە دارێژرابوو . نێوبراو کەرەستەکەی بە هاوکاری لەگەڵ ی . پرایمدا کۆکردبۆوەو بە جوتە چاپیان کردووە . لەم ووتارەدا بە کورتی باسی فۆنەتیك و بەشەکانی ئاخافتن – ناو ، جێناو و کار دەکات .

ف . یوستی ڕوون دەکاتەوە . بۆ وێنە پاشکۆی ئامرازی پێوەندی (ڕا) لە لایەن نووسەرەوە وەکو نیشانەیەکی دۆخی بەرکاریو دۆخی مەبەست باس دەکرێت هەروەکو (ڕا)ی زمانی فارسی ، بێ ئەوەی تێبینی تایبەتێتیو واتای (ڕا) لە زمانی کوردیدا بکات . لە بەشی کاردا کورتەیەکی تایبەتێتی دارشتنی بناخەی کارو شێوەکانی داوە . لەدوای ئەمەدا پێویستە ئەم کۆمەڵە تێکستانە بێنینەوە یاد ، کە لە لایەن (ئا .سوتسین)ە لە کاتی گەڕانیدا بە کوردستاندا کۆی کردوونەتەوەو دەربارەی ئەتنوگرافیاو فیلۆلۆژیو ناوچەی بەشە دیالێکتی تورابدینو بوهتانە دەگرێتەوەو وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئەلمانیو فەرهەنگۆکێکی کوردی – ئەلمانی شەست لاپەرەیی بۆ کردووەو ووشە کوردیەکانیشی بە ئەلفوبێی عەرەبیو بە لاتینی نیشانە دەنگیەکانی پێشانداون .

س . ئا . یەگیزراروّف (٢٠) لە ووتارە ئەتنوّگرافی‌یەکەی خوّی‌دا زانیاری‌یەکی بەسوود دەربارەی ڕێزمانی کوردی‌و فەرهەنگی کوردی‌یەوە پێشکێش دەکات . لەم ووتارەدا باسی باری ژیان ، خووڕەوشت‌و بیروباوەڕو باری کوّمەلاّیەتی کوردانی پشت قەفقاس دەکات . لە ووتارەکەی‌دا تێکستە کوردی‌یەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی . ئەم تێکستانە بە شێوەی بەشە دیالێکتی کرمانجی کوردانی ڕەوان (یەریڤان) نووسراوەتەوەو فەرهەنگوّکێکی کوردی —ڕووسی (٦٠) شەست لاپەڕەییشی لەگەل‌دا هەیە .

لە سالّی ١٩١٣ دا کتێبێك بەنێوی ڕێزمانی کوردی لە لایەن (٨٠) (ی . سوّن) ، ەوە نوسراو چاپکرا . نێوبراو هەولّی‌داوە سنوورێك لە نێوان دیالێکتی ژووروو و خوارووی زمانی کوردی لەرووی موّرفوّلوّژی و لێکسیکوّلوّژی دابنێت .

نووسەر لەپێشەکی بەرهەمەکەی‌دا دەنووسیّ ، کەوا زمانی کوردی دابەش دەکرێتە سەر چوار دیالێکت ، کرمانجی ، گوّران ، لوری‌و زازا . دیالێکتی یەکەم دابەش دەکاتە سەر دوو بەشە دیالێکت ژووروو و خواروو ، زمانی کوردانی نێوچەی هەکاری ، ئەرزەرووم‌و بایەزید بەر بەشە دیالێکتی ژووروو دەکەون‌و بەشە دیالێکتی موکری‌و بابان‌و سلێمانی بەر بەشە دیالێکتی خواروو دەکەون .

ڕێزمانی ی . سوّن لەنێو ئەو کارانەی دەربارەی زمانی کوردی‌یەو لەمەوبەر باسمان‌کردن لەرووی قەوارەو کەرەستەوە بەسەرکەوتوترین کار دەژمێردرێت . تەنیّ ڕێزمانەکەی ف . یوستی لیّ دەربچێت . لەم بەرهەمەدا هەول‌دراوە بەراوردیك لەنێوان دیالێکتی ژووروو و خواروو بکرێت ، بەلاّم لەسەر بنچینەیەکی ناڕاست بنیات نراوە . زوّربەی ئەو کەرەستەیەی ، کە بەکارهاتووە دەربارەی دیالێکتی ژوورووە . زوّربەی ئەو بەلّگە ڕێزمانی‌یانەی بەکارهاتوون ناڕاستن .

لە سالّی ١٩١٩ دا ل . وّ . فوّسووم (٦٥) ،کە میسیونێریکی ئەمریکی بووە ڕێزمانێکی کوردی لەمیناپولیس‌دا چاپ‌کردووە . لەم بەرهەمەدا گەردان‌کردنی کاری لەسەر شێوەی ڕێزمانی ئینگلیزی کردووەو چەند شێوە کار لە ئینگلیزی‌دا هەیە ئەوەندە شێوەشی لە کوردی‌دا داناوە .

نووسەر تێبینی ڕەسەنی لە موکری‌و کرمانجی‌دا نەکردووە . ڕێزمانەکەی لەبناخەوە لەسەر کەرەستەی موکری هەرێمی مەهاباد دانراوە ، بەلاّم لەنێو وێنەکانی‌دا کەرەستەی کرمانجی ژوورووشی تێدا بەدی‌دەکرێت . لەبەشی موّرفوّلوّژی‌دا لیستەیەکی گەورەی کاری لێکدراو ، کە بەیارمەتی پێشگری سادەو دارێژراوەوە دارێژراوە نوسیوەتەوە هەروا فەرهەنگوّکێکیشی بوّ داناوە .

ر . جاردین لەساڵی ۱۹۲۲ دا لەبەغدا ڕێزمانێکی کورتی چاپ کردووە ، کە دەربارەی بەشە دیالێکتی نێوچەی موسڵە (٦٨) باوەکو ڕێزمانەکەی ر . جاردین کورتە ، بەلاّم بەباشترین ڕێزمانی کرمانجی هەرێمی موسڵ دەژمێردرێت . لەم بەرهەمەدا باسی ڕەسەن بەیارمەتی خستنە سەری‌کردووە . باسی جیاوازی گەردان‌کردنی کاری تێپەرو تێنەپەری لە ڕابردوودا ڕوون‌کردۆتەوە هەروا شێوەکانی دۆخی ڕاستەو خۆوتیانی جێ‌ناوی کەسی لەکاتی گێرانی ڕۆلی نهادو بەرکاری ڕاستەوخۆدا لەگەڵ کاری تێپەردا پێشانداوە . نووسەر گەردان‌کردنی ئۆیێکتی کاری تێپەر لە شێوەی ڕابردوودا وەکو باری نادیاری زمانی فارسی کۆن تەماشا کردووە . لە لایەن نووسەرەوە شێوەی تیانی ناو لەگەڵ هێندێك بەشی گرنگی ڕێزمانی کوردی دی‌دا لەیاد کراوە .

میسیونێری فەرەنسی – پۆل بیدار لە ساڵی ۱۹۲٦ لە پاریس‌دا ڕێزمانێکی کورتی کوردی بلاّوکردۆتەوە . کەرەستەکەی بەشە دیالێکتی نێوچەی موسڵە . لەنێوی‌دا بە کورتی باسی جێ‌ناوی کەسی ، ناو و ئاوەڵناو دەکات‌و زۆر بە کورتی باسی کاتەکانی کار دەکات . دیاردە ڕێزمانی‌یەکان بە پەندی کوردی ڕوون‌کراونەتەوە . پ . بیدار بەشێکی تایبەتی بۆ لێك‌چواندنی زمانی کوردی لەگەڵ بە زمانی فەرەنسییەوە تەرخان کردووەو وای بۆجووە ، کەوا زمانی کوردی لەگەڵ زمانی فەرەنسی‌دا زمانی فەرەنسی‌دا لەڕووی هێندیك ووشەی فەرهەنگی‌و هێندێك نیشانەی ڕێزمانی‌یەوە هاوبەشن ، لەگەڵ ئەوەش‌دا نووسەر سەبارەت بە نەژادو دەوڵەمەندی شێوەی تایبەتێی ڕێزمانی کوردی دەنووسیٚ : « زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە بە سوودو خۆش‌و ئاوازەدارو ئاسان‌و دەوڵەمەندو فراوانەکانە ، فێربوونی سووك‌و ئاسانە ، ئەم زمانە تەلیسماوی‌یەو زۆر شاعری‌یەو هەموو هۆنراوەکانی ڕەنگ دانەوەی سروشتن ) (٤٢، ۲۲۷) .

لەدوای ڕێزمانەکەی پ . بیدار لەلایەن کوردناسانی دەرەوەدا قۆناخی بێ دەنگی دەستی پی‌کردووە .

قوناخی نویٚ لە مێژووی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی‌و دیالێکتەکانی‌دا لە ساڵانی (۳۰) سی‌ی سەدەی بیستەم‌دا دەست پی‌دەکات ، لەو کاتەدا کە بزووتنەوەی نەتەوەیی – ئازادی حوازانی کورد بە شێوەیەکی فراوان بلاّوبۆتەوە . لەسەر لاپەرە چاپکراوەکان‌دا بە زمانی کوردی بایەخێکی زۆر بە مافی نەتەوایەتی دراوە .

بە تایبەتی لەم کاتەدا کێشەی پێویستی نووسینی ڕێزمانی کوردی‌و فەرهەنگی کوردی بەتەواوی سەری‌هەڵداوە . گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی (گەلاوێژ ، ژین ، نیزار ، هەتاو ، هیوا ،

دەنگی گێتی تازە) ، کە لە عیراق‌دا دەردەچوون ، گۆڤاری (هاوار ، رۆژانوو ، ستێر) ، کە لە سوریاو لوبنان چاپ‌دەکران زنجیرەیەك ووتاریان دەربارەی رێزمانی کوردی بلاّودەکردەوە .

هەرئەوسا پەرتووك بۆ قوتابیانی قوتابخانەکان بە زمانی کوردی دادەندرا . بەکەلکترین کار لەنێو ئەم بەرهەمانەدا ، کە دەربارەی رێزمان‌و فەرهەنگی زمانی کوردین ، پێویستە کاری زانایانی نێوداری کۆمەلاّیەتی‌و وێژەیی گەلی کورد – جەلادەت بەدرخان ، کامەران بەدرخان ، تەوفیق وەهبی ، سەعید کابان ، نوری عەلی ئەمین‌و هی دی تێبینی بکرێ .

لە سالی ١٩٢٧ دا رێزمانە کورتەکەی سەعید کابان (٩٢) چاپ‌کرا . و لەسالی ١٩٢٩ دا رێزمانەکەی تەوفیق وەهبی (٩٣) ، هەردوو رێزمانەکە دەربارەی دیالێکتی خوارووی زمانی کوردین . لە هەمان کات‌دا زنجیرەیەك ووتاری رێزمانی لەلایەن جەلادەت بەدرخانەوە لە گۆڤاری هاواردا ، کە لە سوریا چاپ دەکرا بلاّوکراوەتەوە ، لە سالاّنی جەنگی دووەمی جیهانی‌دا جەلادەت بەدرخان لەنوێوە زنجیرە ووتارە رێزمانی‌یەکانی خۆی لەسەر لاپەرەی هەمان گۆڤاردا بلاّوکردۆتەوە . (٨٤)

بەشەکانی سەرەکی رێزمانی دیالێکتی کرمانجی خوارووبەدرێژی لەنێو هەرسێ بەرهەمە رێزمانی‌یە قوتابخانەیی‌یەی نوری عەلی ئەمین (٩٠) نووسراووەتەوە . بەشەکانی سەرەکی رێزمانی دیالێکتی کرمانجی بەشی ژووروی رۆژ ئاوای نێوچەی جەزیرەو دیاربەکرو سەرووی سوریا لەلایەن دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان ، کە پرۆفیسۆری ئامۆژگەی پاریسە بۆ زمانی زیندووی رۆژهەلاّتی (٧٠) . ئەو کارە رێزمانی‌یانەی ، کە لەلایەن نووسەرانی کوردەوە نووسراونەتەوە دەربارەی دیالێکتی کرمانجی خواروون‌و کەم‌و کورتیش بە شێوەیەکی گشتی تێدا بەدی دەکرێت ، بلررس رهن رێزمانەکەیان لەژێر کاریگەری دەستووری زمانی عەرەبی‌و ئینگلیزی نووسیوە ، کە زمانی کوردی جیاوازییەکی تەواوی لەگەلّ ئەو زمانانەدا هەیە ، هەروا بابەتەکەیان بەشێوەیەکی سادە نووسراوەتەوەو دیاردە رێزمانی‌یەکانیان بە روونی‌و ئاشکرایی باس‌کراون ، لەم رووەوە رێزمانە قوتابخانەیەکانی نوری عەلی ئەمین بەسوودن .

لێکۆڵینەوەی بە پیتی دووەم لەبواری زمانی کوردی‌دا لەوولاّت‌دا لە سالاّنی سی‌دا دەست پی‌دەکات ، دوای ئەوەی لە ئامۆژگەی لینینیگرادا ئەندامی کوری زانیاری یەکێتی سوڤێت ئا . ئا . فریمان و ئەندامی کوری زانیاری ی . ئا . ئوربیل یارمەتی هاتنە کایەی کادری بەتوانایان داوە .

لێکۆڵینەوەکانی یو . یو . ئاڤالیانی لەنێو کوردناسانی یەکێتی سوڤێت‌دا ، کە دەربارەی کاتەکانی کارو کاری لێکدراوو فریزیۆلۆژی‌کارە تێبینی‌دەکرێت . هەروا کارەکانی ج . ح .

بەکاییف ، کە دەربارەی بەشە دیالێکتی تورکمەنستانو ئازربایجانە ، ووتارەکانی ی.ی تسوکرمان ، کە سەبارەت بە رەسەنو گەردانکردنی ناوو کارو شێوەکانیانە ، و هێندێك کاری نوسەرو ئەم چەند دێرانەش ، کە دەربارەی لێکۆڵینەوەیە لە چۆنیەتی دارشتنی رێزمانی کوردی .

زانای گەورەی کورد - تەوفیق وەهبی لە ساڵی (١٩٥١)دا نەخشەی دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی بلاوکردۆتەوە (٨٣ ، ٣١ - ٣٣) ، کە هەموو هەرێمە جۆراو جۆرەکانی کوردستانی لەرووی دیالێکتەکانییەوە دەگرێتەوە .

نەخشەی دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لەلایەن تەوفیق وەهبییەوە



تەوفیق وەهبی زمانی کوردی دابەش دەکاتە سەر چوار دیالێکت : کرمانجی ، لوری ، گۆرانو ، زازا ، کرمانجیش دابەش دەکاتە سەر ژووروو و خواروو . زمانی کوردانی سەر بە نێوچەی یەریڤان ، قارس ئەرزەرووم ، مالاتیە ، مەرعش ، ئیسکەندەروونەو نێوچەی گۆمی وان تا رووباری دجلە دەخاتە سەر کرمانجی ژووروو و کە ئەم بەشە دیالێکتانە بایەزیدی ، بۆتانی ، ئاشیتەیی ، هەکاری‌و بادینانی دەگرێتەوە .

نووسەر زمانی کوردانی هەرێمی خوارووی رۆژهەلاتی گۆمی وان هەتا کرمانشاە ، خانەقین‌و رووباری دجلە بۆ کرمانجی خواروو دەگەرێنیتەوە . بەشە دیالێکتی موکری ، سۆرانی ، سلێمانی‌و سنەیی دەخاتە پال کرمانجی خوارووەوە . نووسەر لەو باوەرەدایە ، کەوا لوری لەم هەرێمەدا بلاو بۆتەوە ، کە دەکەوێتە نێوان سولتان ئاباد ، دەولەت ئاباد ، کرمانشاە ، خانەقین لە ژووروودا هەتا ئەو هێلەی ، کە بە شیوازەو قازەروو هەتا کەنداوی عەرەبی لە خواروودایە ، دیالێکتی گۆران ئەو نێوچەیە دەگرێتەوە کە لەو هێلەوەیە ، کە سنە لە خوارووی – رۆژئاوا هەتا دۆلی سنووری ئێرانە . نووسەر زازا دەخاتە سنووری هەرێمی ئەرزەرووم ، خەرپووت ، بتلیس ، دیاربەکر . هەروا لەو باوەرەدایە ، کەوا زازا لە دیالێکتی گۆرانەوە نێزیکە .

لە سالی ١٩٥٨ دا لە نیویورك‌دا رێزمانی کوردی ی .ن . مەکاروس کە دەربارەی بەشە دیالێکتی سلێمانی‌یە چاپ‌کرا (٧٣) . لە پێشەکی‌دا بە شێوەیەکی گشتی باسی زمانی کوردی‌و ئەو لێکۆلینەوانەی ، کە دەربارەی کراوە کردووە . . هەروا بەکورتی باسی هێندیك زانیاری لەسەر چۆنیەتی نووسینی زمانی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، باسی فۆنۆلۆژی ، مۆرفۆلۆژی‌و ووشەی دارێژراوو سینتاکس دەکات . بێجگە لەوەش لە بەرهەمەکەی‌دا لیستەیەکی بۆکار لە زمانی کوردی‌دا کردووەو هەروا فەرهەنگۆکێکیشی بۆ کردووە .

کاری کوردناسی ئینگلیز – د .ن . مەکەنزی ، کە دەربارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی‌یە بە بەرهەمێکی تەواو دەژمێردرێت .

کتێبەکەی د .ن . مەکەنزی بە یەکەمین لێکۆلینەوەیەکی پتەو لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەژمێردرێت ئەو دیالێکتانەی ، کە سەربە ژوورووی عیراقن . کەرەستەکەی لەلایەن نووسەرەوە کۆکراوەتەوە ، لەو کاتەدا ، کە لە هەرێمە کوردی‌یەکانی عیراق‌دا ژیاوەو لەبەرگی دووەمی بەرهەمەکەی‌دا چاپی‌کردووە . لێکۆلینەوەکە لە بەرگی یەکەم‌دایەو دووبەش دەگرێتەوە ، یەکەمیان ئەو بەشە دیالێکتانەی سەر بەکرمانجی خواروون ، دووەمیان بەشە دیالێکتی بادینانی ، کە سەر بە کرمانجی ژوورووە .

نووسەر لە لێکۆڵینەوەکانی‌دا نێوی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارووی بە پێی نێوی جوگرافی نێو ناوە وەك ، وارماوە ، بنگرد ، پژدەر ، هەولێر ، رەواندوز و خۆشناو ، بۆ بەشە دیالێکتی بادینانیش هەر نێوی جوگرافی سورچی ، ئاکرێ ، ئامێدی ، بەرواری ژۆر ، گولی ، زاخۆو شێخانی بەکارهێناوە . لەنێوەراستی ئەو لێکۆڵینەوانانەی ،کە سەبارەت بە کرمانجی خوارووە باسی بەشە دیالێکتی سلێمانی دەکات هەروا لەو لێکۆڵینەوانانەی ، کە دەربارەی بادینانە باسی بەشە دیالێکتی هەرێمی ئاکرێ دەکات . لەهەردوو بەشەکەدا باسی فۆنۆلۆژی‌و مۆرفۆلۆژی دەکات . نووسەر جۆری فۆنێمی دیالێکتەکانی خوارووی لەسەر بەشە دیالێکتی سلێمانی داوەو بەشە دیالێکتەکانی دی بە پێی جیاوازی لەرووی دەنگەوە لە بەشە دیالێکتی سلێمانی‌دا روون کراوەتەوە . لە بەشە دیالێکتی بادینانیش‌دا هەر بەم جۆرە باسکراوەو بەشە دیالێکتی ئاکرێی کردۆتە بناخە بۆ لێکۆڵینەوە لە بەشە دیالێکتەکانی دی . نێوبراو بە شێوەیەکی رێك و پێك یاسای فۆنەتیکی بەشە دیالێکتەکانی تۆمار کردووە بە تایبەتی بەشە دیالێکتی بادینی .

لە بەشی مۆرفۆلۆژی‌دا باسی تایبەتێتی رێزمانی ناوو کار دەکات . بە شێوەیەکی ئاشکراو وورد هۆیەکانی دارشتنی ژمارە ، رەسەن‌و دۆخ روون دەکاتەوە . کار بەشی زۆری کارەکەی گرتۆتەوە .

لەم بەشەدا چۆنیەتی دارشتنی کار بە پێی کاتەکانی باسکرادووە لەدوای ئەمەدا لقێك دێت ، کە سەبارەت گونجان‌و هۆیەکانی پێکەوە بەستنی رستەی سەرەکی بە رستەی ناسەرەکی‌یەوەیە .

هەروا باسی چۆنیەتی دارشتنی ووشەش دەکات بە پێشەکییەکی کورت دەوری پێشگرو پاشگرو ئامراز روون‌دەکاتەوە . بە تەواوی تایبەتێتی مۆرفۆلۆژی بەشە دیالێکتی سلێمانی‌و بادینانی خستۆتە روو . بەلام د.ن . مەکەنزی لە پلانی یەکەمی لێکۆڵینەوەکانی‌دا لەنێو بەشە دیالێکتەکان‌دا هێندێك سیفات باس دەکات وەك باسکردنی بەشە دیالێکتی بادینانی بەرێگەیەکی جیاواز لە بەشە دیالێکتی ئاکرێ بێ‌ئەوەی هۆیەکی جیاوازی بنچینەیی لەنێوانیان‌دا هەبێت . ئەم باسکردنە جیاوازە دەبێتە هۆو بەڵگەی جیاوازی ئەم بەشە دیالێکتانە لەنێوان خۆیان‌داو بەم جۆرە هەر لەسەرەتادا تایبەتێتی جیاوازیان بۆ دادەنێت . کەچی لەراستی‌دا ئەم جیاوازییانەی ، کە باسیان دەکات نینەو بناخەشیان نیە . ئەمەش لە بەرهەمەکانی م . گارزۆنی . ئا . سوتسین‌و ر . جاردین دیارەوئاشکرایە و ئەم نێوبراوانە لە بەشە دیالێکتی بادینانیان کۆڵیوەتەوە . لەم پێوەندی‌یەدا ئەوە روون دەبێتەوە کەوا بۆ لە کوردەلۆژی‌دا هەرێمی

ئاکرێ . ئامێدی بامەرنی ، گولی ، زاخۆو شێخان بەجیاواز باس‌بکرێن کەچی لە واقیع‌دا ئەمانە جیاوازنین‌و بۆ یەك دیالێکت دەگەرێنەوە ، کە ئەویش کرمانجی ژووروووە ، ئەم دیالێکتە لە رووی هێندیك فۆنێمەوە ، کە لە رووی فونەتیکەوە بە دیالێکتی کرمانجی ژووروووەوە تایبەتە پێوەستە . هەروا هێندیك دارشتنی رێزمانی تایبەت بەم دیالێکتە هەیە ، کە لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا بە شێوەیەکی دی گۆدەکرێت وەیا دادەرێژرێت . هەر هەمان باسیش دەربارەی زمانی کوردانی نێوچەی سلێمانی ، هەولێر ، وارماوە ، بنگرد ، پژدەر ، موکری ، رەواندوز و خۆشناو کردووە .

ئێمە ناتوانین لەگەلٚ بیروڕای نووسەر رێك‌کەوین دەربارەی شێوەی کاری رابردووی تێپەر (لە بادینان‌و دیالیکتی خواروودا) ، کە وەکو کارێکی نادیار لە رووی واتاوە لە قەلەم‌داوە . (۷۱ ، ۱ ، ۱۹۳) .

هەروا ئەم دیاردەیەی لەنێو ئەو ووتارەی ، کە بە نێوی (کرمانجی ، کوردی وگۆران) ، (۳۹) بەرچاو دەکەوێت . ئەو وێنانەی ، کە نووسەر بۆ باری نادیاری لە بەشە دیالێکتی بادینان‌دا هێناوەتەوە نادیارنین ، بەلٚکو کاری تێپەری دیارن ، بەلاٚم لەرووی واتاوە نادیارن (بروانە ئەو بەشەی ، کە لەم بەرهەمەدا باسی ئەم دیاردەیە دەکات) .

د .ن . مەکەنزی لە ووتاری نێوبراودا ئەو سەرنجە پێشان دەدات ، کەوا لە وێژەی کوردەواری‌دا هێندیك ناتەواوی هەیە دەربارەی ناونانی دیالێکتە کوردی‌یەکان . ئەم ناتەواوی‌یانە وەکو ئەم نووسیویەتی لەو زاراوە ناوچەییانەن ، کە بەکارهاتوون (۳۹ ، ۱٦) نووسەر هەولٚ دەدات ئەم کەم‌و کورتی‌یانە بە ووشەی کرمانجی ، زازا و گۆران روون بکاتەوە . هەروا نووسیویەتی کەوا ئەوانەی بە زازایی دەدوێن بە خۆیان‌و زمانەکەیان دەلێن دیملی . زازا — تەنیا نازناوێکە کە کوردانی دراوسێیان ئەم ناوەیان لی‌ناون . ئەم ناونانە لەلایەن هەستی کوردانەوە وەکو بلێی نیشانەیەکە بۆ زمانەکەیان ، کە ئاوازەدارە . بەلاٚم لە لایەن کوردانی هەرێمی سلێمانییەوە زازا دانیشتوانی بادینان دەگرێتەوە . هێندێك بەلٚگە دژبەم قسانەی سەرەوە دەوەستن ، بەر لە هەمووان زۆر سەختە لەگەلٚ ئەو ووتەیە رێك‌بکەوین کە دەلێ بۆیە ناوی زازایان لێدراوە چونکە جوری زمانەکەیان ئەوە دەخوازێت . لەو تێکستانەی ، کە لەلایەن (ئۆ . مان ، ك . خەدەنگ ، پ . لێرخ)وە چاپ‌کراون تایبەتێی زمانەوانی ئەمانە بەرچاو دەکەوێت . هەروا دەبێ تێبینی ئەوەش بکرێت ، کەوا زازا وەنەبێ بە خۆیان هەر بلێن دیملی ، بەلٚکو کردو کوردیش دەلێن لە کۆتایی‌دا ئەوە دەبینین کەوا کوردانی نێوچەی سلێمانی‌و هەولێر زاراوەی زازا بۆنێونانی هەرێمی بادینانیش بەکاردەهێنن ، ئەگەرچی جۆری قسەکردنی بادینان ئاوازەدار نییە وەکو ئاشکرایە ئەم ناونانە لەبەر ئەم هۆیانە نییە ، کە ئەو بۆی چووە .

له سەرتادا له قۆناخه دێرینەکانی مێژوویی دا زازا دراوسێی بەری خوارووی هۆزانی کورد بوون . لێرەدا وا باشه هێندیك زانیاری مێژوویی باس بکەین . له سەدەکانی نێوەراست دا لەنێو سەرچاوه عەرەبی یەکان دا ووشەی زافزان زاوزان بەرچاودەکەوێت ، که ناوچه شاخاوی یەکانی سەرووی میسۆپۆتامیاو خوارووی ئەرمینیا دەگرێتەوه . ئەمه لەگەلٚ بیروڕای مینۆرسکی و ڤیلچیڤسکی ڕێك دەکەوێت ، نووسیویانه ، کەوا ئەم ووشەیه زۆزان (کۆچەر) لەرووی خوێندنەوەی دا بەواتا له گۆکردنی دا له زمانی عەرەبی دا ڕاست گۆنا کرێت (١٨ ، ٩٧) لێرەدا وامان بۆ دەردەکەوێت ، کەوا ناوی زازا پێوەندی یەکی مێژوویی به ووشەی (زۆزان)ەوه هەیه ، که واتایەکی جوگرافی بەخشیوه ، جا ئێستە بابزانین بۆچی کوردی سلێمانی و هەولێر به بادینیان دەڵێن زازا . ؟ . پێوەندی مێژوویی ووشەی زازا(ن)و زۆزان لەگەلٚ شێوه عەرەبی یەکەی زافزان ئەوه روون دەکاتەوه کەوا کوردی زازا(ن) له خوارووی کوردستانەوه هاتوون ، هەروا مێژوونووسان لەو باوەرەدان وەنەبێ زازا(ن) شوێنی نیشتەجێی ئەسلی و دێرینیان بەری سەرووی رۆژئاوای کوردستان بێت . لەم پێوەندی یەدا پشتگیری رایەکەی تەوفیق وەهبی دەکریت بەوەی زازاو گۆران لەیەك شوێن و بنکەوه هاتوون .

د .ن . مەکەنزی ووشەی کرمانجی لەرووی لنگویستەوه بەهەڵەدادەنێ ، بێ ئەوەی تەماشای فراوانی بەکارهاتنی له کوردستان و له بەرهەمی زانستی دا بکات .

نووسەر دەنووسی : «ئەگەر له باکووردا کرمانجی . . گ . گ . بەهۆی پێوەندی یەوه به هەڵگری ئەم دیالێکتەوه ناونرابێ ، ئەوا له شوێنانی دی دا واتای جووتیار دەگەیەنێت ، بۆیه ئەم ووشەیه نابێ وەکو زاراوەیەکی زانستی بەکاربێت» ( ٣٩ ، ١٦٥) ، بەلاٚم ئەمه قەناعەتمان پێ ناهێنێت و بەڵگه ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوه ، کەوا ووشەی کرمانج لەرووی واتای ئەتنیکی وەکو ناوی گەلێك بەرامبەر به ووشەی کورد هاتووه ، که لەسەردەمی ئەحمەدی خانی یەوه هەیەو له بەرهەمەکانی باکووردا وەکو ناوی زمانێك بەکار هاتووەو پارێزراوه . قسەکەری ئەم زمانەش کوردانی باکووری رۆژئاوای کوردستان دەگرێتەوه . وەکو ئاشکرایه ناوی ئەتنیکی و ناوی گەل هەمیشه لێك ناچن و لەگەلٚ یەك دا ڕێك ناکەون و زۆر گەل و هۆز ناوی خۆیان هەروا ئەو ناوانەشیان پێ دەڵێن ، که لەلایەن دراوسێکانیانەوه پێیان گوتراوه .

ئەم دیاردەیه له ناونان و لەناوی کوردان دا بەدیاردەکەوێت . کورد خۆی بۆ ناو و ناونان ووشەی کوردو کرمانج بەکار دێنێت ، بەلاٚم گەلانی دی بەناوی کورد ناویان دەبەن . بەم جۆره ووشەی کوردو کرمانج بۆ کورد یەك جۆره(٥) ناوەو یەك واتایەو یەك له شوێن یەکەوه

(٥) – دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد لەو ووتارەی دا ، که به نێوی «چەمکی کوردو کرمانج»ە و له ژماره ١٩٨٣ رۆشنبیری نوێ ، ساڵی ١٩٨١ دا بلاٚوی کردۆتەوه ئەم دوو ووشەی ساخکردۆتەوه .

بەکاردێن و دژبەیەکەوە دانانیان راست‌نی‌یە . . ئەوا تەوفیق وەهبی ئەم ووشانە بۆ ناونانی گەلەکە بەکار دێنێت لەو ووتارەی‌دا ، کە بە نێوی (نەژادی کوردو زمانەکەیان) ە (٨٢) . بۆ راستی هاو واتایی ووشەی کوردو کرمانج تەوفیق وەهبی پشت بە بەڵگەیەکی مێژوویی گرنگەوە دەبەستێت ، کە ئەویش ووتەکانی ئەحمەدی خانی‌یە ، نووسەری داستانی نێوداری (مەم‌وزین) ، کە لە سەرەتای داستانەکەی‌دا ئەحمەدی خانی دەڵێت :-

دا خەلك نەبێژتن کو ئەکراد
بێ مەعریفەتن بێ ئەسل‌و بنیاد

هەروا دەڵێ :-

ب فکر ژ عەرەب هەتا گورجان
کرمانجیا بوویە شوبهی بورجان

تەوفیق وەهبی لەو باوەرەدایە ، کە ووشەی کورد هاوواتای کرمانجی‌یە ، کرمانجی ، کە زۆر بەفراوانی بەکاردێت‌و زور بلاوە لە هەموو کوردستان‌دا دەتواندرێت وەکو ناوی دیالێکتی کوردی بەکاردبێت . تەوفیق وەهبی لە کاتی دابەش‌کردنی دیالێکتەکان‌دا لەژێر ناوی دیالێکتی کرمانجی‌دا زمانی کوردانی خواروو ، ژووروی رۆژئاوا ، ژووروی رۆژ هەڵاتی کوردستانی داناوەو دابەشیانی‌کردۆتە سەر کرمانجی ژووروو و کرمانجی خواروو . لوری ، گۆران‌و زازاشی بە دیالێکتی سەربەخۆی زمانی کوردی داناوە . لەووتاری پێشووی نێوبراودا د.ن . مەکەنزی چەند دابەش‌کردنێکی دیالێکتەکانی زمانی کوردی داوە . نووسەر زمانی‌کوردی دابەش کردۆتە سەر سێ دیالێکت :

١ - دیالێکتەکانی کوردی ژووروو .
٢ - دیالێکتەکانی کوردی نێوەراست .
٣ - دیالێکتەکانی کوردی خواروو .

نووسەر زازای بە دیالێکتێکی سەربەخۆو جیای لە قەڵەم داوە ، کە سەر بە زمانی کوردی‌یەوە نییە . دیالێکتەکانی کوردی ژووروی دابەش کردۆتە سەر ژووروی رۆژئاواو ژووروی رۆژهەڵات . بەشە دیالێکتی هەکاری ، بایەزیدی‌و بادینانی گێراوەتە سەر ژووروی رۆژئاوا و بۆتان و دیاربەکرو زمانی کوردانی ناوچەی ژەنگاریشی بردۆتەوە سەر ژووروی رۆژهەڵات .

چۆنیەتی دابەش‌کردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لە بناخەوە لەسەر تایبەتێتی جوگرافی بەم جۆرەی خوارەوە دابەش‌کردووە :

نەخشەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی بە پێی دابەش‌کردنەکەی د.ن. مەکەنزی

| | | |
|---|---|---|
| ژووروو | بایەزیدی<br>هەکاری<br>بادیناتی | دیاربەکر<br>بۆتان<br>ژەنگار |
| | موکری | سوران |
| نێوەراست | ئەردەلان<br>(هەورامی) | سلێمانی |
| خواروو | (گۆران)<br>کرمانشاە<br>لەك | زەنگەنە |

ئەم جۆرە دابەش‌کردنەی سەرەوە دابەش‌کردنەکەی تەوفیق وەهبی دێنێتەوە یاد ، کە ئەوەی دووەمیان زازاو گۆران لەگەڵ کرمانجی‌و لوری دادەنێت‌و وەکو دیالێکتێکی بنچینەیی ژماردووە ، بەڵام د.ن. مەکەنزی زازا بە گروپێکی سەربەخۆو جیا دادەنێت‌و هەورامی‌و گۆرانیشی لەنێو کەوانە خستووە . ئەمە ئەوە دەگەیێنێت ، کەوا ئەم دووانە (هەورامی‌و گۆران) هێژ لەلایەن نووسەرەوە بەتەواوی بریاری لەسەر نەدراوەو جێگەی گومانە . لە هەموو بارێك‌دا نەخشەکەی تەوفیق وەهبی‌و د.ن. مەکەنزی لە رووی تایبەتێتی بنچینەییەوە رێك‌کەوتوون . لێرەدا بۆ ئێمە ئەوەی گرنگە ئەوەیە ، کەوا ئەم نەخشانەی دابەش‌کردنە دیالێکتەکانی زمانی کوردی رادەی دەست‌کەوتەکانی دیالێکتەلۆژی کوردی لەم ساڵانەی دواییەدا پێشان دەدەن . لەدوای ئەمەدا د.ن. مەکەنزی نیشانەکانی جیاوازیی هەر گروپە دیالێکتە دەست‌نیشان دەکات .

گروپی دیالێکتەکانی کوردی نێوەراست ئەم نیشانە تایبەتێتی‌یانەی خوارەوەی تێدا بەدی دەکات :-

١ - پاشگری ناسیاری (-ەکە) . ٢) دارشتنی ووشەی لێکدراوی ئاوەڵە

٣ - دارستنی کاری تێپەری نادیار ٤) پاشگرەکانی جیٚناوی کەسی .

نووسەر لەژێر تێبینی‌کردنی ئەم خاڵانەی سەرەوەدا دیاردەی لێك نێزیك‌بوونەوەی دیالێکتی نێوەراستو خوارووی هەست پێکردووە لە هەمان کات‌دا دوورکەوتنەوەیان لە دیالێکتی کوردی ژووروودا هەر لە رووی پاشگرەکانی جیٚناوە کەسی‌یەکانە (٣٩ ، ١٦٥) لەدوای ئەمەدا د .ن . مەکەنزی بە دوورودرێژی باسی ئەم نیشانانە دەکات ، کە لە سەرەوە باسکراون و لەنێو زمانی وێژەیی‌دا بەکارهاتنیان باوە . نووسەر بە بەڵگە ئەوە پێشان دەدات ، کەوا لەبەشە دیالێکتەکانی بۆتان ، دیاربەکر و ژەنگار نیشانەی (-ێن) بۆ ژمارەی کۆ لە کاتی خستنەسەردا بەکاردێت ، ئەمە لە نیشانەکانی خستنە سەری کۆ (ێدی ، -ێد ،ێت) جیاوازە . ئەمانەی دوایی لە بەشی باکووری رۆژهەلاتی بایەزید ، بادینانو هەکاری بەکاردێن . نووسەر لەبەر ئەم نیشانانە دیالێکتی کرمانجی دابەش دەکاتە سەر گروپی رۆژئاواو گروپی رۆژهەلات .

دەربارەی ئەم نیشانانە پێویستە ئەمە بووترێ ، نیشانەی خستنەسەری کۆ (-ین) لەنێو بەرهەمەکانی وێژەیی سەدەکانی نێوەراست‌دا لەلایەن هەستیارانی کوردەوە بەکار هاتووەو لەنێو دیوانی مەلای جزیری‌و کارەکانی ضیاالدین ، کە یەکەم نووسەری رێزمانی کوردیە بە ئەلفوبێی عەرەبی چاپکراوە هەیە . هەروا لەنێو بەرهەمە وێژەیی‌یەکانی هاوچەرخ لە سوریەدا بەرچاو دەکەوێت . بەکارهێنانی نیشانەی خستنە سەری (-ین) لەم سەردەمانەی ئەمرۆدا وەکو باوێکی وێژەیی لیٚهاتووە هەروەکو چۆن بەشە دیالێکتەکانی کوردی هەرێمی دیاربەکرو بۆتان وژەنگار لەپاڵ نیشانەی (-ین)ی خستنە سەردا نیشانەی (-ێد ، -ێت)یش بەکار دێنن ، هەر بۆیەیە دابەش‌کردنی دیالێکتی کرمانجی بۆ سەر دوو گروپی رۆژئاواو رۆژهەلات لەبەر ئەم نیشانانە بە دابەش کردنێکی ناتەواو دەژمێردێت . تێکستەکانی ئا . سوتسینو ر . لیسکۆ ، کە بەشە دیالێکتەکانی ئەم شوێنانە دەگرنەوە پشتگیری ئەم دیاردەیە دەکەن ، چونکە لەنێو تێکستەکانیان‌دا نیشانەی خستنەسەری (-ێن) بەرچاو ناکەوێت .

یەکێك لە نیشانەکانی دیالێکتی کوردی باکوورو دیالێکتی کوردی نێوەراست ، بوونی باری نادیاری کاری رابردووی تێپەرە . نووسەر نیشانەکانی جیاوازی ئەم دیالێکتانەی دەست‌نیشان کردووە . ئەو نیشانە تایبەتی‌یەی ، کە لە دیالێکتی کوردی نێوەراستو دیالێکتی لێناوە . کە لەکاری دیارەوە (تێپەر - ك .ك .) دادەرێژرێت . لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات ، گەر لەم

گروپانەی ، کە لەنێو دیالێکتەکانی کوردیدا هەن (باری گەردان کردنی نادیاری کاری رابردوو) هەبێت ئەوسا چۆن بوونی باری نادیاری یارمەتی دەر کە لە هەمان کاری رابردووی دیارەوە دادەرێژرێت روون دەکاتەوە ؟

نووسەر نە ئەم پرسیارەی خستۆتە ئارواو نە وەڵامەکەی . ئەوەی لێرەدا دیارەو ئاشکرا شێوەی کاری رابردووی تێپەر لە دیالێکتی ژووروو و خوارووداو واتای باری نادیاری نابەخشێت‌و نییە (بروانە ئەو بەشەی کە لەم بەرهەمەدا باس‌کراوە) ، چونکە شێوەیەکی تایبەتی دارشتنی باری نادیار لەکاری تێپەردا هەیە .

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی‌و دیالێکتەکانیدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەوا زۆربەی بەشی بەرهەمە زمانەوانییەکان لە (رێزمان ، کورتەی رێزمان ، تێکست‌و فەرهەنگ) زۆربەیان دیالێکتی کرمانجی ژووروو دەگرنەوە لەوانە کارەکانی م . گارزۆنی ،ئا . سوتسین ، د .ن . مەکەنزی ، دەربارەی بادینانیشە ، بەرهەمەکانی ی . بریزین ، پ . بییدار ، ر . جاردین ، کە دەربارەی بەشە دیالێکتی موسڵە ، کارەکانی س . رێ ، کە سەبارەت بە بەشە دیالێکتی هەکارییە ، بەرهەمەکانی ئا .ژابا ، کە دەربارەی بایەزیدو ئەرزەروومە ، س . ئا . یەگیزراروٚف ، هەروا لێکۆڵینەوەکانی لێکۆڵەوەرانی سۆڤێتی – بەشە دیالێکتی کوردانی ئەرمەن ، کارەکانی ج .خ . بەکاییف – بەشە دیالێکتی تورکمەنستان‌و ئازربایجان ، بەرهەمەکان جەلات‌و کەمەران بەدرخان – بەشە دیالێکتی کوردانی سوریە ، جەزیرەو دیاربەکر .

بەواتا لێکۆڵینەوە لەباری زمانەوانی کرمانجی خوارووو لەچاو کرمانجی ژووروو کەمترەو لەنێو کارەکانی ئا . خودسکۆ – بەشە دیالێکتی سلێمانی ، لە کورتەی رێزمانی ئۆ . مان کە دەربارەی موکری ، کارەکانی د .ن . مەکەنزی ، کە باسی هەموو بەشە دیالێکتەکانی زمانی خوارووی کوردانی ژووروی عیراقی کردووە .

یەکێك لە کەم‌و کورتیەکانی ئەم بەرهەمە رێزمانییانەی ، کە دەربارەی زمانی کوردی‌و دیالێکتەکانی کراون بە شێوەیەکی ئاشکرا کەم‌و کوری لە روون کردنەوەی بەشەکانی مۆرفۆلۆژی‌و هێندێك جار چەند بەشێکی مۆرفۆلۆژی هەر باس‌نەکراوە هەروا دیاردەی رێزمانی کوردی‌و هۆیەکانی دارشتنی دۆخە رێزمانییەکانیش بەرچاو ناکەون . لەم بەرهەمانە ، کورتەی رێزمانی م . گارزۆنی ، ئۆ . مان ، ی . بریزین ، ف ، میوللەر ، ئا . سوتسین ، پ . بییدارو هی دی . هێندیك لێکۆڵەرەوە لەکانی لێکدانەوەی دیاردە رێزمانییەکانی کوردی گەیشتونەتە ئەنجامێکی هەڵە لەوانە ف . یوستی ، ئی . سۆنن ، ل . فۆسۆم ، ی . بریزین ، ف . میوللەر ، ئا . سوتسین . ئەمانە لەسەر بناخەی رێزمانی زمانانی دییەوە لەزمانی کوردیان

کۆڵیوەتەوە . لەگەڵ ئەونەش‌دا پێویستە دان بەوەدا بنێین ، کەوا بەرھەمی ئەم لێکۆڵەوەرانە دەربربارەی زمانی کوردی بە بناخەی دامەزراندن‌و دانانی ڕێزمانی بەراوردکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی ھاوچەرخ دەژمێردرێن . پێویستی زانستی و پراکتیکیش ھەر لەکۆنەوە سەری ھەڵداوە . ھەروەکو چۆنْ بەرژەوەندی خەباتی ئازادی خوازی نەتەوەیەتی کورد داوای ڕێکخستن‌و بلاْوکردنەوەی ڕۆشنبیری گەلی کورد لەسەر پێوانەیەکی فراوان‌دا دەکات‌و کە لە پێشی ھەمووانەوە بەدی ھێنانی زمانێکی یەکگرتووی کوردیە . چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بە نووسینی ڕێزمانێکی بەراوردکاری ھەردوو دیالێکتی سەرەکی زمانی کوردی‌یەوە پێوەستە .

لەدوای شۆرشی عیراق (١٩٥٨) جوولاْنەوەی بلاْوبوونەوەی ڕۆشنبیری بۆ بەدی‌ھێنانی زمانێکی یەکگرتووی وێژەیی گەلی کورد زیاتربوو بۆ ئەم مەبەستە لە عیراق‌دا ، لەشاری شەقلاْوەی کوردەواری‌دا . دوو کۆنگرە گیرا ، کە مامۆستایان و زانایان و وێژەوانانی کورد بەشداریان تێدا کرد . لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٦٠دا چەند چارەسەرێکی گرنگ بۆ ئەم کێشەیە دەست نیشان‌کرا (٩٤) . نووسینی ئەم کارە بەراوردکاری‌یە لەسەر دیالێکتە سەرەکیەکانی زمانی کوردی زۆر پێویستە ، چونکە زمانی کوردی شوێنێکی گرنگ لەنێو زمانانی ئێرانی ی گرێتەوە .

لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی‌و دیالێکتەکانی یارمەتی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری مێژوویی زمانانی ئێرانی دەدات . زۆری بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردی ھەبوونی وێژەیەکی کلاسیکی و ھاوچەرخی کوردی ھەروا زیادبوون‌و پەرەسەندنی جوولاْنەوەی ئازادیخوازانی نەتەوەی کورد وا لە لێکۆڵەوەران دەکەن ، کەوا لە کەلچەرو مێژووی کوردیش بکۆڵنەوە . وامان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا ئەم کارەمان ، کە وێژەی کوردی ئەمرۆی پێ دەنوسرێتەوە ، تا ڕادەیەك ئەم داخوازی‌یەی تێدا ڕەنگ بداتەوە .

لەم کارەمان‌دا ، کە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری نێوان دیالێکتی ژووروو و خوارووە . ئێمە زاراوەی (کرمانجی) وەیا (دیالێکتی ژووروو) بۆ بەشە دیالێکتەکانی ژووروی ڕۆژئاواو ژووروی ڕۆژھەلات بەکاردێنین و زاراوەی (سۆرانی) وەیا (دیالێکتی خواروو) شش بۆ بەشە دیالێکتەکانی خواروو و خوارووی ڕۆژھەلاْت بەکار دێنین .

لە وێژەی زانستی‌دا لە بریتی دیالێکتی خواروو بەھەڵە نێوی کوردی بەکار دێنن . ئەم زاراوەیە وەنەبێ ھەر دیالێکتێك بگرێتەوە بەڵکو زمانی کوردی بە ھەموو دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی دەگرێتەوە . (کوردی) واتای (زمانی کوردی) دەگەیەنێت ، بۆیە بۆ ناونانی دیالێکتی خواروو و بۆ جیاکردنەوەی لە دیالێکتی ژووروو ، کە کرمانجی‌یە بەکاردێنن . زاراوەی

سۆرانی بەواتای (بەشە دیالێکتەکانی کوردی خوارووی عیراق‌و ئێران) زۆر بەفراوانی لە نێوان گەلی کورددا بلاْوەو بەکاردێت . ئەگەرچی ئەم ووشەیە (سۆرانی) لە رووی مێژوویەوە واتای یەکێتی هۆزەکانی هەرێمی هەولێرو رەواندز دەگەیەنێت ، کەوا ئەمارەتی سۆرانی لەسەدەکانی نێوەراستدا لێ دامەزراوە . بەبیروڕای ئێمە زاراوەی سۆرانی بەم واتایەی ، کە لەنێو بەرهەمەکانی کوردی دەرەوەدا بەکاردێت ، زور راسترو سەرکەوتووترە لە زاراوەی (کوردی) .

کوردانی تورکیا (هەرێمی دیاربەکر ، ماردین ، هەکاری ، تبلیس ، موش ، وان ، ئەرزەرووم ، بایەزید ، ئەرزینجیان‌و خەرپوت) ، ئێران (لە خوراسان‌و نێوچەی لای رۆژئاوای گۆمی رەزاییە) ، عیراق (هەرێمی موسلْ ، ئاکرێ ، زاخۆ ، ئامێدی ، دهۆك وكێوی ژەنگار) و کوردانی یەکێتی سۆڤێت بە کرمانجی دەدوێن ، هەروا کوردی دانیشتووی دەرسیمیش بەم دیالێکتە قسە دەکەن ، ئەگەرچی زمانی دایکی ئەوان بەشە دیالێکتی زازایە .

کوردی ئێران (مەهاباد ، سەقز ، بۆکان ، بانەو سنە) لە عیراق (رەواندز ، هەولێر سلێمانی ، . . . و هی دی) بە سۆرانی دەدوێن کرمانجی و سۆرانی لەم کاتەدا وەکو دوو زمانی وێژەیی گەلی کورد دەژمێردرێن .

نووسینی کوردی لە سەرەتادا لەسەر ئەلف‌و بێی عەرەبی‌دا پەرەی سەندووە ، کە ئەوسا لەگەلْ تایبەتێتی فۆنەتیکی زمانی کوردی‌دا رێك دەکەوت .

کۆنترین یادگارێك ، کە بە زمانی کوردی نوسرابێتەوەو بۆمان مابێتەوە دەگەرێتەوە سەدەی دەیەم و یازدەم . لەدوای ئەمەدا وێژەی کلاسیکی سەدەی نێوەراست دەست پێدەکات ، کە لەسەر بناخەی ئەمەدا دیالێکتی ژووروو (کرمانجی) پەرەی‌سەندو بەرهەمی هونەری ، وێژەیی ، فەلسەفی و ئایینی بە هۆنراوە بەم دیالێکتە نووسراوەتەوە .

ئەمانەی خوارەوە بەرهەمی خۆیان بەم دیالێکتە نوسیوەتەوە :—

فەقێ تەیران (١٣٠٢—١٣٧٥) ، مەلای جزیری (١٤٠٧—١٤٨١) ،

ئەحمەد خانی (١٥٩١—١٦٥٢) ، ئیسماعیل بایەزیدی (١٦٤٢—١٧٠٩) ،

پەرتەو بەگی هەکاری (لە ١٨٠٨ دا کۆچی دوایی کردووە) ، مەلا بایەزیدی (سەرەتای سەدەی نۆزدەم) وهی‌دی .

بەرهەمی وێژەیی بەسۆرانی درەنگتر نوسراوەتەوە ، کە بەرهەمی ، بێسارانی (١٧١٤—١٨٠٢) ، نالی (١٧٩٧—١٨٥٥) ، کوردی (١٨٠٩—١٨٤٩) وهی‌دی پێ نوسراوەتەوە .

بەرهەمی کوردی دیالێکتی سۆرانی بەتایبەتی لە سالأنی سی سەدەی بیستەمدا پەرەی‌سەند ، لەوکاتەدا ، کە لە کوردستاندا جوولأنەوەی ئازادی خوازی نەتەوەیی بە شێوەیەکی فراوانتر بلأوبۆوە .

لەم قۆناغەدا یەکەمین هەولدانی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی دەستی پی‌کرا .

بەشە دیالێکتی سلێمانی بوو بە بناخەی زمانی ویژەیی کوردی عیراق ، ئەگەرچی لە پەرەسەندنی زمانی ویژەیی‌دا بەشە دیالێکتەکانی دی هەرێمەکانی خوارووی کوردستانیش بەشداری دەکەن‌و هەروا تا رادەیەك تایبەتێتی ناوچەیی بەشە دیالێکتەکانی دیالێکتی خوارووی تێدا بەدی دەکرێت .

لە سالی ١٩٣١ دا کوردی سوریە دەستیان بە بەکار هێنانی لاتینی تورکی کرد و هێندێك نیشانەشیان خستەسەری ، کە تایبەتە بەزمانی کوردی‌یەوە . لەنێوان سالأنی ١٩٣١ تا ١٩٤٧ دا بەرهەمی ویژەیی کوردی پیێ دەنووسراوە ، هەروا گۆڤاری ویژەیی‌و کۆمەلأیەتیشی پیێ چاپ‌دەکرا . بەرهەمی ویژەیی کوردانی سوریەو لوبنان بەردەوام بوون لەسەر پاراستن‌و پەرەسەندنی دەستوور پێوانەی زمانی کلاسیکی هەرێمی جەزیرە .

لە سالی ١٩٢٩ دا کوردی ئەرمینی‌یای سوڤێتی گەیشتنە پلەی نووسین‌و لەسەر بناخەی گرافی لاتینی ئەلفوبێیەکی کوردیان داناوە و چەندین کتێبی قوتابخانەیی ، هونەری ، رامیاری‌و ویژەییان بە کرمانجی پیێ چاپ کردووە . لە سالی ١٩٤٦ دا لەسەر گرافی رووسی ئەلفوبێیەکی کوردیان دانا .

کورد دانیشتووی خاکی گەورەی کوردستانە ، کە لە نێوان تورکیە ، ئێران ، عیراق‌و سوریەدا دابەش‌کراوە . ئەمە لە ئەنجامی دابەش‌کردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و دامەزراندنی میری نویێ – عیراق‌و سوریە رووی‌دا . ئەو شارانەی ، کە بەر تورکیە دەکەون بە کوردستانی تورکیە نێو دەبرێن ئەمانەن ، (دیاربەکر ، موش ، وان ، بتلیس ، خۆرات ، مەدینە ، جەزیرە ، ئەرزەرووم و هی‌دی) شارەکانی ئێران بە کوردستانی ئێران ئەم هەرێمانەن ، (مەهاباد ، سەقز ، بانە ، بۆکان ، سنە ، کرمنشاە ، هەرێمی بەری رۆژئاوای گۆمی رەزاییە و هی دی) . شارەکانی عیراق – کوردستانی عیراق ئەمانەن : (موسل ، کەرکوك ، هەولێر ، سلێمانی ، رەواندز ، کۆیە ، ئامێدی ، زاخۆ ، ئاکریێ ، کێوی ژەنگار وهی دی) .

ئەم شوێنانەی سەر بە سوریەن (قامشلی ، حەسەکە ، کورداگ ، بەری ژووروری – رۆژهەلأتی هەرێمی سوریا) . بێجگە لەمانە کورد لە ناوچەی شیراز دەوروبەری قەزوین بەدرێژایی لێواری خوارووی زەریای قەزوین (خەزەر) هەروا بەری رۆژهەلأتی ئێران لە

خۆراسان (ناوچەی کوجان ، بوجنور و هی دی) هەن . کورد لە شاری موسل ، بەغدا ، شام‌و تارانیش دادەنیشن . تێکەڵاوی کوردو تورك دانیشتوانی نێوچەی بەری خواروری – رۆژهەلاتی سێواس‌و رۆژئاوای ئەنقەرەی پێك هێناوە .

سەرژمێری گشتی کوردان کە لە ساڵی ۱۹۷۱دا لە دەرەوەدا کراوە لە ٥ر۷ حەوت‌ونیو تا ۱۲ دوانزە ملیون کەسە .

کورد لە یەکێتی سوڤێت‌دا لە ئەرمینیادا بە تایبەتی لەبەری خوارووی کێوی لە ئازربایجان – لاچین ، کەلبەرجارو کۆتورلین لە گورجستان – بەشێوەیەکی سەرەکی لەشەاری تبلیس ، لە تورکمەنستان لە ماری‌و باگیردا هەن .

بێ لەمانە هێندیك شوێنی جیاجیا کوردیان تێدا نیشتەجێ بوون وەك لە ئۆزبەکستان (نێزیکی تاشقەندو دەشتی گوڵودنی) ، لە گرگیزی (ئۆش و جەلال ئاباد) ، لە کازاخستان (نێزیکی ئەلمەئەتا) بە پێی سەرژمێری سالی ۱۹۷۰ لە یەکێتی سۆڤێت‌دا نێزیکەی (۹۰) نەوەد هەزار کورد هەیە .

زمانی کوردی بەر گرووپی ئێرانی رۆژئاوایی دەکەوێت‌و زمانێکی سەربەخۆیەو لە قوناغی ئەخمینی‌یەوە (هەخامەنشی)وە هەیە (۲۹) گەر بەراوردێك لەنێوان زمانی کوردی‌و زمانانی هاوچەرخی زیندووی ئێرانی دی بکەین هەروەکو کوردناسان بۆیان روون‌بۆتەوە زمانی کوردی زۆر شێوەی رێزمانی پاراستووە ، کە نێزیکی دەکاتەوە لە زمان‌و دیالێکتەکانی کۆنی ئێرانی ، ئەگەرچی لە رووی ئەو مێژووە درێژەی پێیدا تێپەریوە زۆر گۆرانی بەسەردا هاتووە . کاریگەری زمانانی دراوسێ بۆ سەر زمانی کوردی کەمەو تەنێ ووشە دەگرێتەوە . (پ . لێرخ دەنووسێ‌و دەڵێ : « زمانیان لە نێوجەرگەی کوردستان‌دا سەربەخۆیی خۆی پاراستوەو لەرووی شێوەی بەرەسەندنیەوەش هەر سەربەخۆ پەرەی سەندووە ، بێ‌ئەوەی زمانی فارسی ، کە خزمایەتێکی نێزیکی لەگەڵ‌دا هەیە کاری تێ‌بکات») .

هەروا لێرخ ئەو تێبینە پێشان‌دەدات ، کەوا ئەو ووشە بیانی‌یانەی کە هاتوونەتە نێو زمانی کوردی‌یەوە کاریگەرێکی ئەوتۆیان لەسەر نێوەرۆکی دارشتنی رێزمانی نەکردووە (۳۸ ، ۳۳ ، ٤۱) ، دیسانەوە ل .پ زاگۆرسکی و س . ئا . یەگیزاروف ، ئا . ژابا . و لێکۆڵەروانی دی رووس دانیان بەم بیرورایە هێناوە کە زمانی کوردی هاوچەرخ زمانێکی سەربەخۆیە لە زمانانی دی ئیرانی لەرووی تایبەتێتی فۆنۆلۆژی ، مۆرفۆلۆژی ، سینتاکس‌و ووشەی فەرهەنگی‌یەوە جیاوازە . ئەم تایبەتێتیانەی ، کە لە دیالێکت‌و بەشە دیالێکتی زمانی کوردی‌دا هەن وەکو زمانێکی یەکگرتوو لەنێو خێزانی زمانانی ئێرانی‌دا بەدیاری دەخەن .

ئەم لێکۆڵینەوە زانستی‌یە بە ئەنجامی ئەرکی کارکردنی چەندین ساڵ دەژمێردرێت لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی‌دا ئەم دەسکەوتەی لە دابەشکردنو رێك‌خستنو بۆچوون و ئەنجامی دیاردەکانی رێزمانی لەنێو ووتارەکانی ئێمەدا بەرچاو دەکەوێتو بە شێوەیەکی زۆرترو فراوانتر لەنێو ئەو بەرهەمە رێزمانی‌یانەی ، کە بەزمانی کوردی بۆ قوتابیان چاپ‌کراون .

لە ساڵی ١٩٥٧ دا لەلایەن نووسەرەوە بەرهەمێکی رێزمانی بەنێوی زمانی‌کوردی ، کە بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی نووسیوێەتی بلاوکراوەتەوە. لەم بەرهەمەدا هێندیك بابەتی بەراوردکاری لەنێو بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارووداخراوەتە روو .

لەدوای ئەمەدا لە ساڵی ١٩٦١ دا یەکەمین بەرهەمی بەراوردکاری زمانی کوردی بە کەرەستەی کرمانجی‌و سۆرانی ، کە دەربارەی بەشەکانی سەرەکی ئاخافتنی ئەم دوو دیالێکتەبوو بلاوکرایەوە .

لەم لێکۆڵینەوەیەماندا ئەم ئەرکانەمان خستۆتە پلانی کارکردنمان :-

١ - دانانی دەمکاتێکی (صیفەیەکی) گشتی بۆ رێزمانی هەردوو دیالێکتەکە .

٢ - پێشان‌دانو دەرخستنی قۆناغەکانی پەرەسەندنی دەمکاتی رێزمانی دیالێکتی ژووروو و دیالێکتی خواروو .

٣ - پێشان‌دانی تایبەتێتی رێزمانی .

لەم بابەتەمان‌دا پێرەوی ئەم رێگەیەمان کردووە لە لێکۆڵینەوەدا :- پێشەکی بۆ هەر بەشێك کورتەیەك لە مێژوو و رادەی لێکۆڵینەوە لە کەتیگۆری رێزمانی کوردی دەدرێ ، جا نووسینی کەتیگۆری رێزمانی کوردی‌و شێوەی دارشتنیان ، کە گشتی بێ بۆ کرمانجی‌و سۆرانی . گەردان‌کردنی دیالێکتەکان لە رووی دەستووری گشتی‌یەوە ، هۆیەکانی‌جیاوازی دارشتن کەتیگۆری رێزمانی یان لەگەڵ نووسینی شێوەکانی رێزمان‌دا کەوا باس‌کراوە ، وەیا بەجیا روون‌کراوەتەوە . ئەمە لەکاتێك‌دا بووە ئەگەر لەرووی رۆهێنانو تایبەتێتی دارشتنی زمانەکەو دیالێکتەکانی گرنگ بووبێ .

هەموو بابەتە روون‌کراوەکە لە بەرهەمی چاپ‌کراوی دیالێکتی کرمانجی‌و دیالێکتی خواروو وەرگیراوە . بە پیتی لاتینی نووسراوەتەوە ، کە لەلایەن کوردی سوریەو یەکیتی‌و رێکخراوی کوردی لە ئەوروپاو مەڵبەندو کۆری زانستی بۆ دیالێکتی کرمانجی‌خوارووداو لە سەعید محەمەد عەلی ، کە لە تەمەنی چل ساڵی دابوو و خەلکی شاری سلێمانی بوو ، هەروا خوێندکارانی خوێندنی بالای ئامۆژگەی رۆژهەلات‌ناسی سەر بە ئەکادیمیەی زانستی لە شاری مەهاباد . کاوس قەفتان لە سلێمانی ، مارف خەزنەدار لە هەولێر وەرگرتووە .

هەموو وێنەکانی ئەم کارە لەسەرچاوەی چاپکراوو تۆمارکراوی کوردی‌یەوە وەرگیراون ، تەنیّ هێندێك وێنە نەبن ، کە تۆمار نەکراون ، بەلاّم لە هەڵگری دیالێکتی کرمانجی خواروو – کاوس قەفتان ، مارف خەزنەدارەوە وەرگیراون . ك . قەفتان و م . خەزنەدارو نەسرین فەخری بە گەردانکردنی ڕێزمانی دیالێکتی کرمانجی خوارودا چوونەتەوە بۆ ئەم کارەیان سوپاس بژێرم .

# فۆنەتیك

١ – فۆنەتیكی زمانی كوردیو دیالێكتەكانی تا ئەم كاتانەی دوایی بە ڕێگەی تاقیكردنەوە لێی نەكۆڵدراوەتەوە ، هەر بۆیە بوو فۆنێمەكانی زمانی كوردی تا ماوەیەكی زۆر بە شێوەیەكی جیاواز لەیەك باسكراون . لەو كاتەوەی ، كە ڕێزمانی ف . یوستی (١٨٨٠) تیشكی ڕووناكی بەركەوت ، تا كورتەی ڕێزمانی ر . جاردین (١٩٢٢) چاپكرا . لێكۆڵەرەوەكان لەم ماوەیەدا بەرامبەر بە كێشەی فۆنەتیك لە زمانی كوردیدا بیروڕای دژ بە یەكو جیاوازیان هەبووە . بزوێن لەلایەن ف . یوستی (٦٩)و لەدوای ئەودا س . یەگیزاروٚف (٢٠) پازدە فۆنێم بووە ، ی . سۆن (٨٠) و ر . جاردین (٦٨) دە فۆنێم بووە ، س . یەگیزاروٚف بیستو نۆ ، ی . سۆن بیستو شەش ، ر . جاردین بیستو پێنج ، د .ن . مەكەنزی بیستو حەوت بۆ دیالێكتی خواروو و بیستو هەشت بۆ بادینان (٧١ ، ١ ، ١ – ٤٩) بووە .

جیاوازی ژمارەی دەنگ لەزمانی كوردیدا ، كە لەلایەن نووسەرانی لەسەرەوە نێوبراودا بەرچاودەكەوێت ئەوە ڕوون دەكاتەوە كەوا وەنەبێ ئەم جیاوازیە لەبەر ئەوە بێت ، كە لە دیالێكتی جیاوازی زمانی كوردیان كۆڵیبێتەوە ، بەڵكو بۆ جیاوازی تێگەیشتنیان لە پێكهێنانی فۆنێم دەگەڕێتەوە بۆ وێنە نووسەرانی ڕێزمانی كوردی بەرامبەر تایبەتێتی دەنگی بزوێن ، دەنگی درێژو كورتی بزوێنیان لێك جیاكردۆتەوە ، وەكو فۆنێمیكی سەربەخۆیان لەقەڵەمداوە ، ئەگەرچی ئەم بەرامبەر بە یەك دانانەو سەربەخۆییان لە زمانی كوردیدا بوونی‌نییە .

بۆ دیارخستنی ژمارەی نەبزوێنیش نووسەران لە بیروڕایاندا هەمیشە یەك ناگرنەوە .

ف .یوستی ،ی .سۆن ، ر .جاردین دەنگی گەرووی (ئەوكی) (t, p,k) و دەنگی لەرزۆكی نەرمی (C)و دەنگی لەرۆكی گرانی (r) یان لێك جیانەكردۆتەوە ، بەڵام س . یەگیزاروٚف بە پێچەوانەی ئەم نووسەرانە ئەم دەنگانەی لێكجیاكردۆتەوە .

٢ – هێندێك پێشكەوتن بۆ دیارخستنی ژمارەی ڕاستو گشتی فۆنێمی بزوێنو نەبزوێن ، كە لە زمانی ئەمرۆی كوردیدا هەیە بە دانانی ئەلفو بێیەكبوو ، لە لایەن كوردانی سوریە (١٩٣٠-١٩٣١) و كوردانی ئەرمینیای سۆڤێتی (١٩٢٩) (٦٥ ، ١١٦ ، ١٢٠) . ئەو ئەلفو بێیەی لەلایەن كوردانی ئەرمەنستانەوە داندرابوو لەو ئەلفو بێیە لاتینیە وەرگیرابوو ، كە بۆ پەیداكردنی نووسین بۆ كەمەنەتەوایەیتەكانی یەكێتی سۆڤێت بەكار دەهات . ئەلفوبێیەكەی

کوردانی سوریه له ئەلفـو بێی لاتینی تورکی وەرگیرابوو . لەگەڵ ئەوەش‌دا ژمارەی فۆنێمی بزوێن لەم دوو ئەلفـو بێ‌یەدا وەکو یەکن‌و ژمارەکەیان هەشت فۆنێمی بزوێنە . دیفتۆنگ (بزوێنی دوولانە) لەنێو هەردوو ئەلفـو بێ‌یەکەدا جیانەکراوانەتەوە . ئەمەش راستە چونکە لە زمانی کوردی‌دا دیفتۆنگ فۆنێم نییە .

ژمارەی فۆنێمی نەبزوێن لە هەردوو ئەلفـو بێ‌یەکەدا وەکو یەك‌نین ، لەنێو ئەلفـو بێی کوردانی سوریەدا (٢٥) بیست‌و پێنج فۆنێمی نەبزوێن و لە ئەلفـوبێی کوردانی ئەرمەنستان‌دا (٣٠) سی فۆنێمی نەبزوێن هەیە . ئەم جیاوازی‌یەش بەمە روون دەکرێتەوە کەوا لەنێو ئەلفـو بێی کوردانی سوریەدا دەنگی ئەوکی (ť, p̌, ǩ) دەنگی لەرزۆکی (c)و دەنگی لەرزۆکی گرانی (r̄)یان تۆمار نەکردووە . ئەم جیاوازی‌یە بە هیچ جۆرێك بۆ زمانەکە خۆی و تایبەتێتی بەشە دیالێکتی کوردانی ئەرمەنستان ناگەرێتەوە . لەدوایی‌دا لێکۆڵینەوە ئەوەی بۆ روون‌کردینەوە ، کەوا هەردوو بەشە دیالێکت سەر بەیەك دیالێکتن ، کە ئەویش زۆورووەو لەرووی ژمارەی فۆنێمی نەبزوێنەوەش یەکن . رەشید کورد ئەم راستی‌یەی خستۆتە روو لەو بەرهەمە رێزمانی‌یەی ، کە لە سوریە ، کە جەلادەت بەردخان دایناوە دەنگی ئەوکی (ť, p̌, ǩ) ی و دەنگی لەرزۆکی (c)ی و دەنگی لەرۆکی (r) کەمە .

ب .ف . میوللەر (٤٠) ووتاریکی دەربارەی فۆنەتیکی زمانی کوردی نوسیوە ، کە لە بابەتەکانی ئەلفـوبێی لەسەرەوە نێوبراودا بەم جۆرە باس نەکراوەو ئەمانەی خستۆتە سەر ، دەنگی گەروویی (ئەوکی) (h) ، خوارووی گەروویی (h) ، دەنگی لەرۆکی (r) ، دەنگی لەرزۆکی (c) ودەنگی گەروویی t, p, k و دەنگی گرانی (i) . لە ئەنجامی چاو پیێ خشانێك بەم بەرهەمەی زمانی کوردی ب .ف .میوللەر دەکاتە ئەنجامی ئەوەی ، لە زمانی کوردی‌دا جووتێك فۆنێم هەیە :

گەروویی (ئەوکی) و ناگەروویی (ǩ,p̌,ť) و (i) نەرم و (ا)ی گران ، لەرۆکی گران (r) ، لەرۆکی سووك (r) ، دەنگی سەرووی گەروویی (h) و خوارووی گەروویی (h) بیروورای ب . ف .میوللەر لەگەڵ بیروورای نووسەری رێزمانی کوردی رەشید کورد رێك دەکەوێت .

ف .س .سۆکۆڵۆڤا لەو کارەی‌دا ، کە سەبارەت بە فۆنەتیکی زمانانی ئێرانی‌یە بەرێگەی تاقیکاری ژمارەی فۆنێمی بزوێن‌و نەبزوێن لەبەشە دیالێکتی تورکمەنستان‌دا (٤٩) چل‌و نۆ فۆنێمی داوە . هەر لێرەش‌دا ئەو خشتەیەی ، کە لە لایەن ی .ی . تسوکرمانەوە بۆ دەنگە بزوێنەکانی بەشە دیالێکتی ئەرمەنستان داندراوە دووبارە دەکاتەوە . ف .س . سۆکۆڵۆڤا نۆ فۆنێمی بزوێن‌و سیێ فۆنێمی ، کە بۆ ئەلف وبێی کوردانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی بەدیارخرابوون‌و

تۆمارکرابوون . ئەمە لەکاتێك‌دا گەر فۆنێمی (–ی) نەژمێردرێت ، کە هۆی پەیدابوونی لەزمانی کوردی‌دا بۆ کاریگەری زمانی تورکمێنی بەسەر زمانی کوردی‌دا دەگەڕێنێتەوە . دوا کارێکی ، کە لە فۆنەتیکی زمانی کوردی دەکۆڵێتەوە ، بەرهەمی ئینگلیزی کوردناس – د .ن .مەکەنزی‌یە . لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی‌دا ، کە دەربارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی‌یە لەو بەشەی ، کە دەستووری فۆنەتیکی بەشە دیالێکتەکانی کوردی ژووروی عیراق دەگرێتەوە . نووسەر نۆ فۆنێمی لە بەشە دیالێکتی سلێمانی (دیالێکتی خواروو) (i,i,e,a,a,o,u,o) و هەشت فۆنیمیش بۆ بادینان (l,i,u,e,a,a,u,o) (٧١ ، ١٥١ ، ٣٠) تۆمار کردووە .

نووسەر سستێمی فۆنەتیکی بەشە دیالێکتەکانی سەر بەدیالێکتی ژووروو لەگەڵ بەشە دیالێکتی سلێمانی‌دا بەراورد دەکات و بەشە دیالێکتەکانی بادینانیش لەگەڵ بەشە دیالێکتی ئاکرێ . نێوبراو جیاوازی دیالێکتی بۆ کۆمەڵێك تایبەتێتی‌و باری تایبەتی هەر بەشە دیالێکتێك دەگەڕێنێتەوە . هەروا ئەوە تێبینی دەکرێت ، کەوا نووسەر زۆر بەرێك‌و پێکی‌و بە ووردی لە سستێمی فۆنەتیکی بەشە دیالێکتەکانی کۆڵیوەتەوە ، بۆیە تایبەتێتی‌و ژمارەی فۆنەتیکی بەشە دیالێکتەکانی بە تەواوی‌داوە ، بەڵام لەبەرامبەر بەیەك دانانی فۆنێمی بزوێنی درێژو کورت بێ بەڵگەو بناخەبووە .

هەروەکو ئاشکرایە فۆنێمی بزوێنی درێژوکورت لە زمانی کوردی‌دا بە نیشانەیەکی جیاوازیکەر ناژمێردرێت لە فۆنێم‌دا ، ئەگەرچی فۆنێمی بزوێنی هێزدار لە فۆنێمی بزوێنی بێ‌هێز درێژترە (٤٩–٨٠) گەر ئەو هەموو بارانە بخەینە بەرچاوو بیانژمێرین ، ئەوا ژمارەی گشتی فۆنێمی بزوێن لە هەردوو دیالێکتی ژووروو خوارووی زمانی کوردی‌دا یەکن . لە دیالێکتی خوراوودا هەشت فۆنێمی بزوێن هەیە ، هەروا هەمان ژمارەش لە دیالێکتی ژووروودا – بەشە دیالێکتەکانی ئەرمەنستان ، تورکمەنستان ، سوریە ، بادینان‌و هەکاری دەگرێتەوە ئەمە لەبارێك‌دا گەر لە ئەرمەنستان‌و سوریەدا دیاردەی نەژمێرن هەروا بزوێنی لەبەشە دیالێکتی سلێمانی‌دا نەژمێرن .

ژمارەی نەبزوێنیش لەسەر بیروڕای لێکۆڵەوەران وەستاوە ، کە بەردەوامی لەسەر ساخ‌کردنەوەی بوون وەیا نەبوونی دەنگی ئەوکی (ť, p̌, ǩ)و دەنگی لەرزۆکی (c) لە سورانی‌دا .

ئا . خودسکۆ ، ئۆ .مان ، ئی . سۆن هەروا د .ن . مەکەتری ، کە لە بەشی دیالێکتی خوارووییان کۆڵیوەتەوە ئەم دەنگە نەبزوێنانەیان وەکو فۆنێمی سەربەخۆ دانەناوە ، بەڵام زانای کورد – تەوفیق وەهبی لەو بەرهەمەی‌دا کە دەربارەی ئەلف‌و بێی کوردی‌یەو لەسەر بناخەی ئەلف‌و بێی لاتینی داناوەو بۆ کوردانی عیراقە نەبزوێنی ئەوکی (t , p , k)یش ژماردووەو ئەم نیشانانەی بۆ داناون ، (th , ph , kh) .

ئێمە لایەنی بیروڕای تەوفیق وەهبی دەگرین‌و دەڵێین نەبزوێنی ئەوکی (ť,p̌,ǩ) و نەبزوێنی نەرزۆکی c لە دیالێکتی خوارووودا هەیە ، بەڵام لەنێو ئەلفەو بێی عەرەبی‌دا نیشانەیان نییە . بەم جۆرە ئەم بناخەیە هەیە بۆ ئەوەی بتوانین بڵێین ، کەوا یاسای دەنگی نەبزوێن لە دیالێکتی خواروو و ژووروودا وەکو یەکن .

بەڵام بوونی کارێکی تاقیکاری بۆ فۆنەتیکی دیالێکتی ژووروو و خواروو زۆر پێویستە بۆ دەست نیشانکردنی تایبەتێتی فۆنێمی زمانی کوردی هەروەکو چۆن لەنێو ئەلفەو بێی کوردی‌دا تۆمارکراوە ، لەگەڵ ئەوەش‌دا ئێمە چەند سەرنجێك دەربارەی جۆری تایبەتێتی فونێم کە لە ئەنجامی پرۆسێسی فۆنەتیکی‌یەوە سەری هەڵداوە دەخەینە روو :-

**بزوێن**

٣ - بزوێن لە زمانی کوردی‌دا ئەم فۆنێمانە دەگرێتەوە : أ ، ە ، ێ ، ی ، بزرۆکە ، ۆ ، و ، وو ، کە لە رووی سازگەی دارشتنیانەوە دابەش دەبنە سەر بزوێنی ریزی پێشەوە ، نێوەراست‌و پشتەوە .

**بزوێنی ریزی پێشەوە**

٤ - بزوێنی ریزی پێشەوە فۆنیمی (ی ، ێ) دەگرێتەوە ، جیاوازیان لە رووی پلەی کرانەوەو بەرزی جووڵانەوەی زمان بۆ پێشەوەیە .

ی - لێو هاوبەشی گۆکردنی ناکات‌و بەر بزوێنی ریزی پێشەوە دەکەوێت‌و وەکو دەنگی (u)ی رووسیە لە ووشەی (HuTu)دا

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| ئیزن | ئیزن |
| ئیش | ئیش |
| پیر | پیر |
| هری | خوری |
| دەرزی | دەرزی |
| دیتن | دیتن ، بینین |
| کرین | کرین |

ێ – بزوێنی ڕێزی پێشەوەیەو سەرووی زمان هاوبەشی گۆکردنی دەکات ، بەڵام لێو هاوبەشی ناکات .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| درێژ | درێژ |
| ڕێز | ڕێز |
| ئێڤار | ئێوار |
| ئێش | ئێش |
| پێ | پێ |

بزوێنی ڕێزی نێوەراست

٥ – بزوێنی ڕێزی نێوەراست برێتیە لە (–ە ، بزرۆکە ، وو) .

هـ – گەر ئەم بزوێنە بکەوێتە سەرەتا ، نیوە ڕاست وەیا کۆتایی ووشەوە لەرووی چۆنیەتی یەوە ناگۆرێت‌و لێو هاوبەشی گۆکردنی ناکات .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئەڤ | ئەم |
| ئەیلۆ | هەیلۆ |
| هەڤیر | هەویر |
| دەنگ | دەنگ |
| وەرە | وەرە |

بزرۆکە (i) بزوێنێکی سووکی ڕێزی نێوەراستەو لێو هاوبەشی گۆکردنی ناکات‌و دەکەوێتە نێوەراستی ووشەوە (دەربارەی تایبەتێتی ئەم بزوێنە بروانە بری ٣٧) .

| کرمانجی | | سۆرانی | |
|---|---|---|---|
| من | min | من | min |
| شیرن | Sirin | شیرین | Sirin |
| کرن | Kirin | کرین | Kirin |
| بزن | bizin | بزن | bizin |
| برا | bira | برا | bira |

و – بزوێنی ڕیزی نێوەڕاستەو لێو هاوبەشی گۆکردنی دەکات ، لە کرمانجی‌دا دوو شێوە (و) هەیە : یەکەمیان ، کە لە دوای ت ، د ،ت ، ك ، ڬ ، گ ، دێت وەکو (o)ی تورکی گۆدەکرێت ، بەلاّم کە لەدوای خ ، ق ، غ دێت هێندیك ئاوەڵەتر گۆدەکرێت کە زۆر لە گۆکردنی دەنگی w نێزیکە . ئەم بزوێنە چ لە سەرەتاو چ لە کۆتایی‌دا بێت ، چۆنیەتی خۆی دەپارێزێت . لە سۆرانی‌دا فۆنێمی «و» تەنیٚ لەنێوەڕاستی ووشەدا دێت‌و هەمان چۆنیەتیشی هەیە :–

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| تورك | تورك |
| دوروست | دوروست |
| گور | گورگ |
| کورِ | کورِ |
| کون | کون |
| قوربان | قوربان |
| خولام | خولام |

بزوێنی ڕیزی پشتەوە

ا – بزوێنی ڕیزی پشتەوە ئەم فۆنێمانە دەگرێتەوە : ا ، ۆ ،وو

أ – بزوێنی ڕیزی پشتەوەیەو لێو لە گۆکردنی‌دا کەمێك بەشداری دەکات‌و لە گۆکردن‌دا نێزیکی (a)ی فارسیە :–

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئاڤ | ئاو |
| ئانین | هێنان |
| مار | مار |
| باڤ | باو |
| برا | برا |
| چرا | چرا |

ۆ – بزوێنێکی ریزی پشتەوەیەو لێو هاوبەشی گۆکردنی دەکات ، کەمێك لە (ە)ی رووسی بێ هێزترە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| کۆم | کۆمەڵە |
| مۆر | مۆر |
| رۆژ | رۆژ |
| ئۆدە | هۆدە |
| بوستان | بۆستان |
| بۆ(نا) | بۆ |

وو – لێو لە گۆکردنیدا بەرەو پێشەوە دەروات و لە یەکتر نێزیك دەبنەوەو کەمێك ئاوەڵە دەبێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| زوو | زوو |
| روو | روو |
| دوور | دوور |
| کوور | قوول |
| چوون | چوون |
| بچووك | بچووك |
| وولاٌخ | وولاٌخ |

٧ – لە زمانی کوردیدا و بە تایبەتی لە کرمانجیدا لەکاتی گۆکردنی هێندێك دەنگی بزوێندا دەنگێکی دی گەروویی لەگەڵدا گۆ دەکرێت ، بۆ ئەم جۆرە دەنگانە نیشانەی (،)ی بۆ داندراوە .

کە لە سەرەتای ووشەدا دەبێت لەگەڵ دەنگی (a , o , e , i, i,) بەم جۆرە دەبێت : aciz , orin , intin , ani لە بەشە دیالێکتی ئەرمەنستاندا بۆ گۆکردنی دەنگی گۆراوی (e) دەنگێکی نێزیك لە دەنگی (ع)ی عەرەبی‌یەوە پەیدا دەبێت کە لەگەڵ (أ)دا دێت : ereb , erebe , eyar , eware , ezman , ewir , ers .

که لەنێوەراستی ووشەدا دەبێت ، دەنگەکە لەنێوان بزوێنی (e)و دەنگی گەروویی (h)و بزوێنی (a) دا دەبێت :

أ – ber لەگەڵ behir) – سۆرانی) ، jer لەگەڵ jehr)–سورانی) ، tel لەگەڵ tehil) –سۆرانی) ، pen لەگەڵ pan) – سۆرانیو pehin – کرمانجی خواروو) بەراوردبکە .

ب – mer لەگەڵ mar) –سورانی ، nalو nel لەگەڵ nal) –سۆرانی) ، tavو tev لەگەڵ hetaw) – سورانی) ؛ cav و cev لەگەڵ caw) – سورانی بەراوردبکە .

لەبەر رۆشنایی تێکستە چاپکراوەکان و کارە رێزمانییەکاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ،کەوا ئەم دیاردەیە وە نەبێ لەهەموو بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیدا هەبێت ، هەر بۆیەیە ئێمە ئەم بارانە لەنێو بەرهەمەکانی ف . یوستی ، ی .سۆن و ر . جاردین نابینین ، کەچی بە پێچەوانەی ئەمانە جەلادەت بەدرخان و نووسەرانی دی کورد ئەوانەی لە کرمانجییان کۆڵیوەتەوە نیشانەی (،) یان بۆ ئەم دیاردەیە داناوە .

لە سۆرانیدا ئەم بارەی دەنگ نابیسرێ ، بەلاّم لە ووشەی بیانی (عەرەبی)دا ، کە دەکەوێتە سەرەتاوە دەنگی (h) بە دەردەکەوێت :

| عەرەبی | سۆرانی |
| --- | --- |
| عرب | hereb |
| عطار | hetar |

پێویستە لە زمانی کوردیدا ئەوە تێبینی بکرێت ، کەوا هەر چ ووشەیەکی دەنگی (ع)ی تێدایە هەر بە هەمان ئەلفو بێی عەرەبی دەنووسرێتەوە ، بەلاّم لە نووسینی کوردانی سوریەدا بە تایبەتی ئەوانەی لاتینی بۆ ئەم دیاردە فۆنەتیکییە وەکو کوردانی ئەرمەستان نیشانەی ( ، ) لە لای راستی دەنگە بزوێنەکە دادەنێن .

### نەبزوێن

٨ – سستێمی فۆنێمی نەبزوێن لە بنەرەتەوە لە هەردوو دیالێکتەکەدا کرمانجیو سورانی وەکو یەکن ، لێرەدا هێندێك تایبەتێتی دیالێکتی خواروو دەخەینە روو :

١ – کاتێ کە دەنگی پشتەوەی زمانی (گ) دەکەوێتە پێش بزوێنی (ێ ،ی) ئەوسا وەکو دەنگی (چ)ی پێشەوەی زمانی گۆ دەکرێت ، بۆ وێنە : جێرانەوە (گێڕانەوە) ، جێلاس (گیلاس) ، جیسین (گیسن) .

٢ – له بریتی ئەو (أ)یەی ، کە دەکەوێتە نێواراست‌و کۆتایی ووشەوە (١) پێشەوەی زمانی بەکاردێت .

٣ – بەکار نەهاتنی دەنگی لێوی – زمانی (ڤ) و بەکارهێنانی (و) لە بریتی ئەو .

٩ – دەنگی نەبزوێن لە زمانی کوردیدا لەرووی هۆیەکانی دارشتنیەوە دابەش دەکرێتە سەر :

| | |
|---|---|
| obstrnent | تەگەرەیی |
| Frscative | خشەیی |
| Resonant | زرنگەیی |
| Obstrnent | تەگەرەیی |

١٠ – دەنگی تەگەرەیی دابەش دەبێتە سەر لێوی ، پێشی زمانی ، پشتی زمانی‌و مەلاشوویی .

١١ – دەنگی ب ، پ ،پَ ، م بۆ لێوی دەگەرێنەوە .

ب – دەنگێکی لێوی ئاوازەدارە :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| بۆ ،بۆنا | بۆ |
| رەبەن | رەبەن |
| کتێب | کتێب |
| بەندیخانە | بەندیخانە |

پ – دەنگێکی لێوی کپە :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پار | پار |
| سپی | سپی |
| پیر | پیر |
| چەپ | چەپ |

پَ – دەنگێکی لێوی قورگی کپەو بەشێوەیەکی گشتی لە سەرەتای ووشەدا دێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| پێ | پێ |
| پرا | پرد |
| پۆر | پۆر |

م – دەنگێکی لێوی ئاوازەدارە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| مێڤان | مێوان |
| مال | ماڵ |
| زەمان | زەمان |
| رم | رم |
| چەم | چەم |
| سمێل | سمێڵ |

١٢ – دەنگی لەرزۆکی پێشەوەی زمان برێتیە لە ج ، چ ، چٚ .

جـ – دەنگێکی لەرزۆکی ئاوازەدارە وەکو دەنگی (ج)ی فارسییە ، لەنێو ئەلفەو بێی ئەرمەنستاندا ، کە لەسەر ئەلفەو بێی لاتینی (١٩٢٩) داندراوە پیتی (ج) تێدا نییە ، لەو ئەلفەو بێ‌یەی ، کە لەسەر نووسینی رووسی رێك‌خراوە پیتی (W)ی بۆ داندراوەو پر بە پریشی نییە ، لەنێو ئەلف وبێی کوردی سوریەو عیراقدا پتی (C) بۆ داندراوە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| جار | جار |
| جۆت | جووت |
| جی | جێ ،جێگا |
| تاج | تاج |

چ – دەنگێکی لەرزۆکی کپە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| چۆل | چۆل |
| چ | چ |
| باخچە | باخچە |
| چیێ ، چاك | چاك |

چ̆ – ئەم دەنگە لەچاو (چ)دا نەرمترە . لەکاتی گۆکردنیدا کۆتایی زمان بە سەرووی قورگەوە دەنووسێو بەتیژی بۆ پاشەوە دەگەڕێتەوە ، لەنێو ئەلفـو بێی کوردانی سوریەو عیراق‌دا هیچ نیشانەیەکێ تایبەتی بۆ ئەم دەنگە دانەندراوە ، بەڵکو هەر (چ)ی بۆ بەکاردێت ، باوەکو لەکاتی قسەکردنی کوردانی سوریەدا هەست بە سەربەخۆیی ئەم فۆنێمە دەکرێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| چەرم | چەرم |
| چرا | چرا |
| پرچ | پرچ |
| چیرۆك | چیرۆك |
| کەچ | کچ |

١٣ – دەنگی پێشەوەی زمانی ئەمانەن : د ، ت ، تَ ،ن .

د – ئاوازەدارە .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| دار | دار |
| دەست | دەست |
| دراندن | دراندن |
| دەرد | دەرد |

ت – دەنگێکی کپی هێزدارە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| تیر | تیر |
| تری | تری |
| گۆتن | گۆتن |
| پەراستن | پاراستن |

ثَ – دەنگێکی کپی هێزداری قورگییە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئسی | تسی |
| ئێر | تێر |
| تتوون | تتون (تووتن . وەرگێر) |
| تەمام | تەواو |

ن – دەنگێکی زمانی پێشەوەیەو وەکو دەنگی (ن) رووسی گۆ دەکرێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| نان | نان |
| نێزیك | نزیك |
| هەنار | هەنار |
| کانی | کانی |
| سینگ | سینگ |

١٤ – دەنگی – ك ،ڵك ، گ – بەردەنگی تەگەرەیی پشتەوەی زمانی دەکەون .

ك – دەنگێکی کپی هێزدارە و قورگی نییە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| کەچ | کچ |
| کەو | کەو |

| | |
|---|---|
| کراس | کراس |
| سەرەك | سەرەك |
| شكل | شكل |
| چەك | چەك |

ك – دەنگێکی کپی هێزداری قورگیىە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| کێر | کێرد |
| کەر | کەر |
| کار | کار |
| کلیت | کلیل |
| کەسك | کەسك |

گ – دەنگێکی ئاوازەداری هێزدارە :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| گا | گا |
| گور | گورك |
| گرتن | گرتن |
| جەگەر | جەگەر |
| ئەگەر | ئەگەر |

١٥ – دەنگی ـڨ ق – بۆ بەشی تەگەرەیی مەلاشوویی دەگەرێتەوە ، کە لە ئەنجامی بەیەك گەیشتنی پشتەوەی زمان بەزمانی بچکۆڵەوە دەردەبرێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| قاوە | قاوە |
| قەومین | قەومان |
| قومری | قومری |
| قەلەم | قەلەم |

## خشەیی

١٦ – ئەم دەنگانە بەر دەنگی خشەیی دەکەون ، (ف ،ڤ) ، کە لێوی – دانین ، (س ،ز ،ش ،ژ) ، کە بەر پێشەوەی زمان دەکەون و لە دەربرین دا کپن ، (خ ،غ) مەلاشوویین ، (ل ،ڵ) پێشەوەی زمانین و ئاوازەدارن ، (ی – y ) نێوەراستی زمانی یەو ئاوازەدارە ، (و – w) لێویەو ئاوازەدارە ، (ح ،ج) گەروویین .

١٧ – دەنگی ف ،ڤ لێوین ، ف کپە ، ڤ ئاوازەدارە . دەنگی ف –ی کپ .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| فرۆکە | فرۆکە |
| بەرف | بەفر |
| ڕەف | لافاو |

ڤ – ٧ دەنگێکی لێوی ئاوازەدارە بەزۆری لە کرمانجی دا بەکاردێت و لە سۆرانی دا دەنگی و –ـ لێوی ئاوازەدار لە بریتی ڤ بەکاردێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئاڤ | ئاو |
| باڤ | باو |
| هەڤیر | هەویر |
| شەڤ | شەو |
| ئێڤار | ئێوار |

١٨ – دەنگی س ،ز ،ش ،ژ پێشەوەی زمانین .

س – کپی فیکەدارە :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| دەست | دەست |
| سم | سم |
| کەس | کەس |

ز – ئاوازەداری فیکەدارە

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| زین | زین |
| بازار | بازار |
| رەز | رەز |

ش – کپی فیکەدارە

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| شیرن | شیرین |
| رەش | رەش |
| باش | باش |
| شل | شل(تەر ، وەرگێر) |

ژ – ئاوازەداری فیکەدارە

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| ژار | هەژار |
| رۆژ | رۆژ |
| مێژوو | مێژوو |
| بژارتن | هەڵبژاردن |

١٩ – خ ،غ مەلاشووبین

خ – کپە

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| خوون | خوێن |
| خوەرن | خواردم |
| تەختە | تەختە |
| بەخت | بەخت |
| بەرخ | بەرخ |
| خوار | خوار |

غ – ئاوازەدارەو لەچاو دەنگی (خ)ی کپترو قووڵتر گۆدەکرێت و ئەم دەنگە بەرامبەر بە (غ)ی عەرەبی‌یە .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| باغ | باغ |
| ئاغا | ئاغا |
| قەدەغە | قەدەغە |
| داغ | داغ |

٢٠ – دەنگی ل ، ڵ ،ی –ع ، و – ث خشەیی ئاوازەدارن .

ڵ – ئاوازەدارەو بە یارمەتی پێشەوەی زمانەوە دەردەبرێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| سال | سال |
| لاو ،لاووك | لاو ،لاووك |
| ئالی | لا |
| پلنگ | پلنگ |

ڵ – ئەم دەنگە تەنێ لە سۆرانی‌دا هەیە(*) و لەنێوەراست و کۆتایی ووشەدا بەرچاو دەکەوێت ، لەکرمانجی‌دا بۆ بەرامبەرەکەی .

–ل– بەکاردێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| دل | دڵ |
| بەلاڤ | بڵاو |
| هەلبرین | هەڵبرین |

(*) – وەنەبێ دەنگی (ل)ی گران لە کرمانجی ژووروودا هیچ نەبێت ، بەڵکو لە هێندیك ووشەدا بەگرانی گۆ دەکرێت هەروەکو کرمانجی خواروو ، بۆ وێنە لە ووشەی : لاّم // کولّم ، لێلّ ، پلاّڤ // پلاّو ، سالّ ، چل وهتد ، وەرگێر .

ی – ع– ئاوازەدارەو لەنێوەراستی زمانەوە گۆدەکرێت :

| | سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|---|
| heywar | حەیوان | حەیوان |
| dayk | دایك | دایك |
| Jiya | چیا | چیا |
| dinya | دنیا | دنیا |
| seytan | شەیتان | شەیتان |

و – W– ئاوازەداری لێویە ، کە لە سەرەتاو نێوەراستی ووشەدا دەبێت بەهێز گۆ دەکرێت (هەردوو لێو خر دەبن و بۆ پێشەوە دەچن) ، کە لە کۆتایی ووشەدا دەبێت و لەدوای دەنگی بزوێن دێت دەربرینی پێویست بەهێزانا کات :

| سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|
| وەرە | وەرە |
| وەخت | وەخت |
| خەو | خەو |
| دەوار | دەوار |

٢١ – دەنگی گەرووی هـ لە دەربرین دا بەر خوارووی دەکەوێت و ح بەر سەرووی دەکەوێت .

هـ – دەنگێکی کپە بەرامبەر بە (هـ) فارسیە و بەنەرمی گۆ دەکرێت :

| سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|
| هاتن | هاتن |
| هەرە (برۆ–وەرگێر) | هەرە |
| بەهار | بهار |
| هەوال ، هاورێ | هەوال |

ح – دەنگێکی کپە لە (ح)ی عەرەبی‌یەوە نێزیکە .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| حش | هووش (هۆش–وەرگێر) |
| رحان | رحان (رەیحان –وەرگێر) |
| روح | روح |
| حکومەت | حکومەت |
| حەڤت | حەوت |

## زرینگەیی

۲۲ – دەنگی زرینگەیی دەنگی ئاوازەداری (ر ،ڕ) دەگرێتەوە .

ر – دەنگێکی لەرۆك نییە ، تەنیّ لە نێوەراست‌و کۆتایی ووشەدا دێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| بار | بار |
| دەرەو | درۆ |
| باران | باران |
| کرن | کردن |

ڕ – دەنگێکی لەرۆکی گرانە لە سەرەتاو نێوەراست‌و کۆتایی ووشەدا دەبێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| کوڕ | کوڕ |
| کڕین | کڕین |
| بڕین | بڕین |
| ڤەکەرین | گەڕانەوە |
| ڕۆژ | ڕۆژ |
| ڕووت | ڕووت |
| ڕێ | ڕێ |
| فڕندە | فڕندە |
| چیرۆك | چیرۆك |

## هێندێك پرۆسێسی فۆنەتیکی و تایبەتێی دارشتنی

٢٣ – لەنێو رێنووسی کوردی‌دا نووسینی جیاواز جیاوازی کۆمەلیك ووشەو شێوەی رێزمانی بەرچاو دەکەوێت ، ئەمە وەنەبێ هەر نیشانەی تایبەتێی دیالێکتەکان بێت ، بەڵکو پرۆسێسی فۆنەتیکیش پێشان دەدات .

٢٤ – ئەگەر دوو دەنگی نەبزوێنی وەکو یەك وەیا لێکچوو کەوتبوونە کۆتایی ناوو سەرەتای پاشگر وەیا پاشکۆی ئامرازەوە ، ئەوا یەکێك لەو نەبزوێنانە لەنێو دەچێت : – بلنتر > بلند + تر ، کورتر > کورت + تر ، دگوندا > گوند + دا ، ژکورا > ژکور + را .

٢٥ – لەنێو زمانی کوردی هاوچەرخ‌دا بەتایبەتی لە دیالێکتی ژووروودا دیاردەی یەکخستنی هەردوو دەنگی گەرووی h و ħ لەیەك دەنگ‌دا هاتۆتە ئارا ، کە وەکو دەنگێك لە خوارووی گەرووەوە دەربچێت وایە تەنێ لەو بارانەدا نەبێت ، کە بوونی هەردووکیان دەبێتە هۆی گۆرینی واتای ووشەکە لەو بارانەدا دەنگەکان پارێزراون و ماون :–

هەسپ // حەسپ ، هەردوو // حەردوو ، هەیف // حەیف

بەلاّم لەم ووشانەدا هەردوو ماون ، چونکە هەبوونیان هۆی گۆرینی واتایە :–

حش // هش ، حوور // هوور

٢٦ – دیاردەی یەکخستنی دەنگی (خ ،غ) لەیەك دەنگ‌دا بەرچاو دەکەوێت :
ئاخا// ئاغا ، باخ // باغ ، تاخ //تاغ ، داخ // داغ ، کاخەز // کاغەز .

٢٧ – پاشگری –تی (–یەتی ، – ایەتی – سۆرانی) لەگەڵ دەنگی تَ گەرووی یەك شێوەی هەیە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| براتی //براتی | برایەتی // برایەتی |
| دۆستیتی // دۆستێتی | دۆستایەتی // دۆستایەئی |

٢٨ – لە زمانی کوردی‌دا دوو دەنگی نەبزوێن وەیا زێتر یەك لەدوای یەك نایەن ، بەڵکو نیمچە بزوێنی ،عز ٹلله یان دەکەوێتە نێوانی . کاتێ دوو دەنگی بزوێنی وەکو یەك یان لێك نێزیك دەگەنە یەك لە یەکگرتنیان‌دا دەبن بە یەك دەنگ .

٢٩ – لە دیالێکتی ژووروودا بە زۆری لەنێوبردن وەیا لەنێوچوونی یەکێك لە دەنگە بزوێنەکان لەکاتی بە یەکگەیشتنی وەیا پێوەلکانی ناوی کۆتایی هاتوو بە دەنگی نەبزوێن بە نیشانەیەکی رێزمانی دەژمێردرێت :

١ – لەبەشێك لە بەشەکانی دیالێکتی ژووروودا دەنگی بزوێنی (ە) نیشانەی نەناسیاری (–ەك)دا ، کە لەگەلّ ناوێك‌دا لێك دەدات و کۆتایی بە دەنگێکی بزوێن هاتیّ لەناو دەچێت ، بەلاّم لە دیالێکتەکانی دی‌دا لەم جۆرە بارەدا نیمچە بزوێنی (y)ی دەکەوێتە نێوان هەردوو بزوێنەکەدا ، باری یەکەم لەزمانی کوردی ئەرمەنستان‌دا بەرچاو دەکەوێت ، باری دووەم تایبەتە بە زمانی کوردی سوریەو تورکمەنستان‌دا .

أ – لەبەشە دیالێکتی ئەرمەنستان‌دا(*) :

براك > برا + – ەك ، خانیك > خانی + – ەك ، رێك > ریّ + – ەك هتد . .

ب – لە بەشە دیالێکتی کوردی سوریەو تورکمەنستان‌دا .

زارویەك > زارو + – ەك ، خانی‌یەك > خانی + – ەك ریّیەك > ریّ + – ەك ، ئۆدەیەك > ئۆدە + – ەك ئەم دوا دیاردەیە تایبەتە بە دیالێکتی کرمانجی خواروو (بروانە بەندی ژمارە – ٣٢) .

٢ – لە دیالێکتی ژووروودا کاتیّ ناو کۆتایی بە بزوێنی –ە ، –ۆ ، –آ دێت‌و ئامرازی خستنە سەری (– یّ ، آ)ی دەچێتە سەر ئەوا لەو بارەدا بزوێنەکە لەنێو دەچێت : عەرەبامە>عەرەبە +آ+ مە ، بالتیّ گران> بالتە + یّ + گران ، پەرامە > پەرۆ +آ+ مە .هتد .

٣ – هەر لە هەمان دیالێکت‌دا کاتیّ ناوی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (–ە)

أ – نیشانەی کۆ (–آن)

ب – نیشانەی ناسیاری –آ ،آنا

ی – دەچێتە سەر ئەوە بزوێنی (ە)ی کۆتایی ناوەکە لەنێو دەچێت :–

أ – عەرەبان > عەرەبە + –آن ، مێشان >مێشە + – آن .

ب – ئەڤ‌پالا > ئەڤ پالە + –آ ، ئەڤ ئۆدانا > ئەڤ ئۆدە + – آنا .

٤ – لە کرمانجی‌دا ئەو بزوێنەی بە کۆتایی پێشگری di , bi ونیشانەی نەرێی نە ، نا ، مە وەکاوە کاتیّ لەگەلّ ئەو کارانەدا بەکاردێن ، کە بە بزوێنی (–آ) دەستیان پی‌کردووە ئەوە (آ) ی سەرەتای کارەکە شوێنی بزوێنەکە دەگرێتەوە :–

---

(*) لە بەشە دیالێکتی ناوچەی هەولێر و کۆیەو رەواندزیش‌دا لە زمانی ئاخافتن‌دا ، ئەم دیاردەیەی لەنێوچوون هەیە ، بەلاّم نەك بزوێنی نیشانەی نەناسیاری ، بەلکو بزوێنی کۆتایی ناوەکە ، بۆ وێنە . خانێك > خانی + –ێك ، نامێك > نامە + – ێك ، پارچێك > پارچە +–ێك . . . هتد . وەرگێر .

bavîta < bi + avîta , navît < ne + dallast avîta < di + alast

نافیت < نه + ئافیت ، نافێژه < نه + ئافێژه ، مافێژه < مه + ئافێژه .

٣٠ – له بەیەك گەیشتنی یوو دەنگی بزوێن دا هەردوو دەنگ لەیەك دەنگدا لێك دەدەن .

١ – ئەو بزوێنەی لە کۆتایی ناودایە لە بەیەك گەیشتنی بە بزوێنی سەرەتای نیشانەی ڕێزمانی لێك دەدەن و دەبن بەیەك :–

چرا < چرا + آن ، بران < برا + آن .

٢ – بزوێنی کۆتایی هاتووی کاری رابردووی تێپەر لەگەڵ نیشانەی (–ی) ناوی بکەردا لێك دەدەن :–

بری < بری + ری ، کری < کری + ری ، رەڤی رەڤی + ری . .هتد .

٣١ – لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا نیمچە بزوێنی (y–) لەم کاتانەدا بە دیاردەکەوێت :

١ – لە لێکدانی ناوی کۆتایی هاتوو بە رێ ، –ی لەگەڵ (–ێ) نیشانەی دۆخی تیان بۆ باری تاك و (–ان)ی نیشانەی کۆ و –ا (–انا)ی نیشانەی ناسیاری :

أ – rîyan < rê + –an , dîyan < dê + –an , pîyan < pê + – an.

لێرەدا بزوێنی (–ێ) لەژێر کاریگەری نیمچە بزوێنی y– تەسك دەبێتەوەو دەگۆرێ بە (–ی)

ب – Welatê sosîalîstîyê < sosîalîstî : ew qencîyê dike < qencî.

جـ –

av xanîyan < ev xanî + – an , ev mîya < mî + –a, ev mîyana < ev mî + ana

٢ – لە لێکدانی نیشانەی ناوی بکەر (–ی) لەگەڵ کاری یارمەتی دەری کەسی سێیەمی تاك بۆ کاتی رانەبردوو (–ە) :

min kirîye < kirî +e , ewî anîye < ewî anî + e , te gotîye < gotî + e...

٣ – لەنێوان ناوی کۆتایی هاتوو بە دەنگی بزوێن و ئامرازی خستنە سەری –آ . –ێ دا :

serkarîya me < serkarî + a me , rîya min < rê + a min.

٤ – لە لێکدانی بناخەی کاری کۆتایی هاتوو بە دەنگی بزوێنی (آ ،وو) لەگەڵ نیشانەی ناوی بکەری (–ی) :

Kutayî < kuta + î , kolayî < kola + î , pvayî < pîva + î ,

buyî < bu + î, cuyî < cu + î

٥ – بەدەرکەوتنی نیمچە بزوێنی (y–) لەنێوان دوو بزوێن‌دا لە ووشەی بیانی‌دا هەر لەسەر هەمان پێوانە دادەرێژرێت :

Sosiyalizm , imperyalizm.

٣٢ – لە دیالێکتی خواروودا بەکارهێنانی نیمچە بزوێنی (– w,y–) بە شێوەیەکی فراوانە . نەنێوچوون وەیا لێکدانی دەنگی بزوێنی چوون یەك کەمتر بەرچاو دەکەوێت .

لە سۆرانی‌دا نیمچە بزوێنی (y–) لەم بارانەدا بەدیار دەکەوێت :–

١ – لە نێوان ناوی کۆتایی هاتوو بە بزوێن‌و نیشانەی نەناسیاری –ێك ونیشانەی ناسیاری –ەکە ، –ەکان :

mêseyek < mêse + – eke , cuĺeyek < cuĺe + – ek.

kursîyek < kursî + – ek , birayeke < bira + – eke.

rûyeke < rû + – eke , coyeke < co + – eke.

dêyekan < dê + – ekan......

٢ – لە لێکدانی ناوی کۆتایی هاتوو بەدەنگی بزوێن‌و نیشانەی کۆی –آن :

mêsyan < mêse + – an, dêyan < dê + – an.

Kursîyan < kursî + – an....

٣ – لە نێوان ناوی کۆتایی هاتوو بە بزوێن‌و نیشانەی ناسیاری (ە–)

em mamostaye < mamosta + e....

نیمچە بزوێنی (W–) لە سۆرانی‌دا لەم بارانەی خوارەوەدا بە دەردەکەوێت :

١ – لەنێوان ئەو ووشانەی کۆتاییان بە بزوێنی (وو) هاتووە لەگەڵ نیشانەی کۆ (آن)دا لە هێندێك بەشە دیالێکت‌دا نیمچە بزوێنی (y–) و لە هێندیکی دی‌دا نیمچە بزوێنی (w–) بە دیاردەکەوێت .

Xanûyan وەیا Xanûwan , Parûyan وەیا Parûwan,.

Pêskawtûwekan î nsan, Pêskawtûyekan î î nsan....

٢ – بە یەکگەیشتنی ناوی بکەری کاری رابردوو لەگەڵ کاری یارمەتی‌دەری کەسی سێیەمی تاك (ە–)

hatûwe وەیا hatûye < hatû + e , zîndûwe وەیا zîndûye < zîndû + e ,

birdûwe وەیا birdûye < birdû + e.

٣٣ – له به یەکگەیشتنی بزوێن‌دا یەکێك لەم دوو بزوێنانه بەدەردەکەوێت :
١ – له دیالێکتی خواروودا ئامرازی خستنه سەری (اَ–) له دوای بزوێن‌دا به نیمچه بزوێنی (y–) دەگۆڕیٚ :

bi – ray ew < bira + î , kureky min < kureke + î , kursîy to < kurs + î to

٢ – جیٚ‌ناوی لکاوی کەسی سیٚ‌یەمی تاك (اَ–) ، که لەگەڵ ناوی کۆتایی هاتوو به بزوێن دێت لەگەڵی‌دا لێك دەدات و به نیمچه بزوێنی (y–) دەگۆڕێت :

ew biray bird < bira + – î

٣ – له سۆرانی‌دا کۆتایی ئامرازی پێوەندی له ، به لەگەڵ بزوێنی سەرەتای جیٚ‌ناوی نیشانەدا لێك دەداتو دەبن به یەك :

Lem < Le + em , beman < be + eman , lewan < le + ewan

٣٤ – بزرۆکه (i) به پێی ئەو دەنگانەی ، که لەدەوروبەرینه دەگۆڕێت ، له گۆ کردن‌دا جیاوازه . لەوانەیه وەکو هەر دەنگێکی بزوێنی بیٚ‌هێز گۆ بکرێت ، پەیدابوون‌و لەنێوچوونی به پێی باری فۆنەتیکی هێزو تایبەتێی دیالێکتی ووشەکەیه .
١ – بزرۆکه لەنێو برگەی داخراودا لەگەڵ گۆرانی هێزدا لەنێو دەچیت ، ئەمه لەوکاتەدا روو دەدات ، که هێزی کۆتایی برگه لەگەڵ خستنه سەردا تێکەڵ دەبێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| bizna baş | biznî baş |
| setla mazin | setlî gewre |
| hatna me | hatnî eme |
| ketna dar | kewtnî dareke |

٢ – بزرۆکه له کرمانجی‌دا له دوا برگەی ناوی خاوەنی لەنێودەچیٚت . لێرەدا هێز لەگەڵ نیشانەی دۆخ‌دا تێکەڵ دەبێت :

Ser î biznê (bizin) , sîtlê bînê (sîtil)

٣ – هیندیك جار وا روودەدات ، ئەو بزرۆکەی له ووشەیەکی دیالێکتێك‌دا هەیه وەکو (u) گۆدەکرێت :

| سۆرانی | کرمانجی |
| --- | --- |
| dirust, durust | dirust, durusi |
| zilm , zulm | zilm , zulm |
| bilbil, bulbul | bilbil , bulbul |
| hirmê , hurmê | hirmê , hurmê |

٤ – له بەشه دیالێکتی ئەرمەنستاندا ئەم جۆره دیفتۆنگانەی بزرۆکه هەیه :–

أ – بزرۆکه لەژێر کاریگەری دەنگی (w)ی لێوی به (u) دەگۆڕێ :

Lawik – Lawuk , Sewtîn – Sewutîn , Zewicîn – Zewucîn , qewimîn – qewumîn.

ب – بزرۆکەی نیشانەی کاری di , bi که بەر برگەی یەکەمی ووشه دەکەوێت به بزوێنی (u) بلێوی دەگۆڕێ :

duxum لەبریتی dixum, buxum لەبریتی bixum, bukujim لەبریتی bikujim...

٣٥ – له دیالێکتی خوارووی بزوێنی سەرەتای هێندیك ووشه به دەنگی (ه) دەگۆڕێ :

| سۆرانی | کرمانجی |
| --- | --- |
| هەور | ئەور |
| هینی | ئینی |
| هەتیم | ئتیم |
| هێنان | ئانین |
| هاویشتن | ئاڤیتن |
| هەرزان | ئەرزان |

٣٦ – ئەم پرۆسیسه فۆنەتیکییانەی خوارەوه لەگەڵ ووشەی بیانیدا بەرچاو دەکەوێت :

١ – لەو ووشه بیانییانەی ، که دوو نەبزوێن وەیا دوو بزوێن به تەنیشت یەکەوه هاتبن ، لەزمانی کوردیدا یەکێك لەناو دەچێت :

کۆمونییست – کومونیست ، گراماتیکا – گراماتیکا ، کۆپێراتیف – کۆۆپیراتیف ، پاراڵێل – پاراللیل ، پرۆسێس – پرۆسیسس . . .

٢ – دەنگی کپی تەگەرەیی له ووشەی بیانی فارسی ، عەرەبی ، تورکیدا به یارمەتی دەگۆڕێن به دەنگی گەرووی K̆ . P̆. ť :

p̌ere (P̌are – سۆرانی), ̄temam ( ťewaw – سۆرانی ) p̆arce, ťẹze , ǩitêb , meǩťeb , ǩuc̆e , diǩan , ̄titŭn ,huǩmet

٣٧ – بەپێی هێندێك دەستووری فۆنەتیك‌دا ، لەنێو هەردوو دیالێکتەکان‌دا چەند دەنگێك هەن ، کە بەرامبەر بەیەك دەوەستن لەیەك جۆرە ووشەدا :

١ – بەرامبەر بە (–ی) کرمانجی ، (وو)ی سورانی لە هێندێك ناودا بەرچاودەکەوێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پاری | پاروو |
| خانی | خانوو |
| هەفتی | هەوتوو |
| رۆژی | رۆژوو |
| کولی | کولوو |
| تووزی | کووزوو(*) |

٢ – کەچی دیاردەی بە پێچەوانەی ئەم بارەی سەروو بەرچاو دەکەوێت ، بەرامبەر بە (وو)ی کرمانجی لە سۆرانی (–ی) بەکاردێت :–

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| تووژ | تیژ |
| شوور | شیر |

٣ – لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا ناوی بکەری کاری کاتی رابردوو کۆتایی بە بزوێنی (آ–) دێت ، بەرامبەرەکەی لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا (ū–) ، کە بۆ دارشتنی کاری رابردووی نێزیکیش بەکاردێت :–

---

(*) لە هێندێك ناوچەی دیالێکتی خوارووش‌دا وەك هەولێر ، کۆیە ، رەواندز (–ی) لە هێندێك ووشەدا بەرامبەر بە (–وو) بەکاردێت هەروەکو کرمانجی ژووروو ، بۆوێنە : دەڵێن خانی ، رۆژی ناڵێن خانوو ، رۆژوو . . . (وەرگێڕ)

| کرمانجی (*) | سۆرانی | |
|---|---|---|
| هاتی | هاتوو | له(هاتن) ەوە |
| گرتی | گرتوو | له(گرتن) ەوە |
| بری | بردوو | له (بردن) ەوە |
| مری | مردوو | له(مردن) ەوە |
| زیندی | زیندوو | له(زیندن) ەوە |
| خواری | خواردوو | له (خواردن – خواردن) ەوە |
| کەتی | کەوتوو | له(کەتن –کەوتن) ەوە |
| کری | کردوو | له(کرن – کردن) ەوە |

٤ – له سۆرانی‌دا دەنگی لێوی – دانی (ڤ) نییه ، بەرامبەرەکەی نیمچه بزوێنی ئاوازەداری (w) بەکاردێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| چاڤ | چاو |
| هاڤین | هاوین |
| هەڤال | هەوال |
| هەڤیر | هەویر |
| شەڤ | شەو |

٥ – له زۆر ووشەدا ، که بۆ هەردوو دیالێکتەکه گشتین ، بەرامبەر دەنگی بزوێنی (–ە)ی کرمانجی ژووروو له کرمانجی خوارووداو بزرۆکه بەکاردێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| قەنج | قنج |
| چەنگ | چنگ |

(*) له هێندیك ناوچەی دیالێکتی کرمانجی خوارووش‌دا وەك هەولێر ، کۆیه ، رەواندز ، هەر (–ی) بۆ ئەم جۆره ، دیارده رێزمانی‌یه بەکاردێت ، بۆ وێنه دەڵێن مردی ، زندی ، کەتی ، هاتی . . وەرگێر.

| | |
|---|---|
| هنەك | هەندیك |
| هل | هەڵ |

٦ – هێندێك جار وا رێك دەكەوێت لەو وشانەی دیالێكتی ژووروو ، كە بزوێنی (u) ی تێدایە ، لە كرمانجی خواروودا بۆ بەرامبەرەكەی بزرۆكە بەكاردێت :–

| كرمانجي | سۆراني | |
|---|---|---|
| كورم | كرم | Kirm |
| گور | گر | gir |
| گوری | گروو | giru |

٧ـ لە هنیندیك زوشەی دیالێكتی ژووروودا دەنگی تەبزوێن – هـ – بەرامبەرەكەی لە كرمانجی خواروودا بزوێنی ئاوازەداری (W) دەبێ :

| كرمانجي | سۆرانی | |
|---|---|---|
| هشك | وشك (*) | wisk |
| هورر | ورد | wird |
| هشیار | وشیار | wisyar |

ئەم سەرنجە ناوێزانەی لە پرۆسێسی فۆنەتیكی دیالێكتی كرمانجی خواروو و كرمانجی ژووروودا خراونەتەروو هەرگیز نابنە رەنگدانەوەی ئەوەی ، كە سستێمی فۆنەتیكی زمانی كوردی یەك نەبێت . جیاوازی گۆكردنی هێندێك دەنگ لە هەردوو دیالێكتەكەدا بۆ پرۆسیسی پەرەسەندنی زمانی كوردی دەگەرێتەوە . لە ئەنجامدا بە شێوەیەكی گشتی ژمارەی نەبزوێن و بزوێن لەهەردوو دیالێكتەكەدا بە ئەندازەی یەكن .

(*) لە دیالێكتی كرمانجی خوارووش‌دا هیشك ، هورد و هۆشیار دەڵێن ، وەرگێر .

# مۆرفۆلۆژی

## بەشەکانی ئاخافتن

٣٨ – لە زمانی کوردی ئەمرۆدا ئەم بەشانەی ئاخافتن هەن :– ناو ، ئاوەڵناو ، ژمارە ، جیٚناو ، کار ، ئاوەڵکار ، ئامرازی پێوەندی ، ئامرازی لێکدەر و گەیەنەرو بانگکردن .

## ناو

٣٩ – ناو – بەشێکە لە بەشەکانی سەرەکی ئاخافتن . بە یارمەتی کەتیگۆری ڕێزمانی ناسیاری ، نەناسیاری ، ڕەسەن ، ژمارە و دۆخ واتای شت دەبەخشێت . ناوی دارێژراو بە هۆی پێوەلکانەوە دادەڕێژرێت .

کە ناو لە دەوری سینتاکسی‌دا دەبێ بە نیهادو بەرکار دۆخەکەی لەشێوەی ڕاستەو خۆو تیان‌دا دەبێت‌و ڕەسەن‌و ژمارەش تێدا بە دیار دەکەوێت ، ژمارەی تاکی ، بەرامبەر تاکەیەتی کۆمەڵێك شتەو ڕەسەنێکی ڕێزمانیش پێشان دەدات ، نێر وەیا مێ .

ژمارەی کۆش کۆمەڵێك شت دەست نیشان دەکات‌و ڕەسەنیش ناگرێتەوە . ناو لەڕستەدا دەوری نهاد ، بەرکاری ڕاستەو خۆو تیان ، دیارخەرو ئادڤێربل دەگێڕێ . لە بناخەی دۆخی تیانەوە دۆخی دووەمینی ناو دادەڕێژرێت . شێوەی دۆخی تیان‌و دۆخی دووەمین کە لە ڕووی ژمارەوە تاکن بە ڕەسەن‌و ئەرکی سینتاکسی ناوەوە لە ڕستەدا پێوەستن .

ناو لە دۆخی ڕاستەوخۆدا ڕەسەن‌و ژمارە بەدیار ناخات . ژمارە ، ڕەسەن ، ناسیاری و نەناسیاری ناو لە کاتی ئاخافتن‌دا بەیارمەتی شێوەکانی دۆخ ، نیشانەو شێوەکانی خستنەسەر دەردەبڕێت .

## نیشانە

٤٠ – لە زمانی کوردیدا نیشانە هۆیەکی پێویست‌و هەمیشەیی نی‌یە بۆ ناو وە ڕەسەن پێشان بدا ، هەروەك لە زمانە هیندو – ئەورووپیەکانی بەرچاو دەکەوێ .

بەڵکو نیشانە کەتیگۆری ژمارە ، ناسیاری و نەناسیاری ناو پێشان دەدا . تایبەتێتی نیشانە لە زمانی کوردیدا لە ڕووی بارو پێوەندی‌یەتی بە ناوەوە . کە هێندێکیان بە کۆتایی ناوەوە دەلکێن وە هێندێکیشیان دەکەونە پێشەوەی ناوەوە .



## نیشانەی نەناسیاری

٤١ – نیشانەی نەناسیاری لەو کاتانەدا بەکاردێت کە لە شتێك وەیا کەسێکی نەناسراو دەدوێت ، بۆ جیاکردنەوەی شتێك وەیا کەسێك لەنێوان کۆمەڵێکی وەکو خۆیدا بەکاردێت .

نیشانەی نەناسیاری ئەم شێوانەی خوارەوەی هەیە بۆ تاك : (ەك) . . .

( –ێك) لە سۆرانیدا وەبۆ کۆ (–ن)

نیشانەی نەناسیاری (–ەك // –ێك) بۆ ژمارە (یەك) دەگەڕێتەوە وە (–ن)یش بۆ جێ ناوی چەندی (هنە) (هەندێك «سۆرانی») دەگەڕێتەوە .

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا نیشای نەناسیاری (–ەك) هەیە کە لە هەندێك جاردا ئەم شێوەیەی دەبێ .

(ne , ine)

لە دیالێکتی خوارووداا نیشانەی نەناسیاری (–ێك) هەیە کە لە هێندێك ناوچەدا کورت دەکرێتەوەو دەبێ بە (–ێ) لەو نیشانە نەناسیاریانەی ، کە لەباری کۆدا بەکاردێن تایبەتن بە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا .

٤٢ – نیشانەی (–ەك) (–ێك – سورانی) واتای تاکایەتی و نەناسیاری دەبەخشێت . هیچ گەردانی ناکرێ و دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە گەر ووشەکە ئامرازی خستنەسەری پێوەلکابوو ئەوە نیشانەی نەناسیار ، دەکەوێتە پێش ئامرازەکەوە شوێنی نیشانەی نەناسیاری لەگەڵ ئەو ووشانەی کە لە دۆخی ناڕاستەو خۆ دان دیسان هەر لە پێش نیشانەکانی دۆخە .

**کرمانجی :**

ژ بۆ هەر یەك خەلاتەك لازمە (مەلا بایەزیدی – ١٠١–)

موویەکی ئەز ژ تە نادم ، داستانا مەمێ ئالان ،

تاسەکێ تژی ئاڤێ دکن . (مەلا بایەزیدی ٢٧٩)

کاغەزەکی بشینە ، ئەز بخونم (ئەمینێ ئاڤدەل ، ٣٥٧)

چاڤەکە خێرێ مندا هاتیە (ئەمینێ ئاڤدەل ، – ٣٦٦)

شەرتەکی داتینن ( مەلا بایەزیدی – ٣٤)

**سۆرانی :**

لێیدا ڕۆیی ڕێگەی کەوتە ئەشکەوتێك (مەکەنزی ، ٦٤) ڕۆژێك مەلا مەزبور ، قازێك ئەبرژێنێ (مەکەنزی ٧٨) کابرایەك ئەبێ چەند ساڵ لەمبەر . ( هەڵبەست بۆ قوتابییان – ٣٦)

ڕۆژێك ئەبێ قەدری بگرن (هەڵبەست بۆ قوتابیان - ٦٢)

٤٣ - لەناوی لێکدراودا نیشانەی نەناسیاری (-ەك // -ێك) واتای جیاوازی کردن دەگەیەنێت بە واتای یەکێك لە . . . .

**کرمانجی** :-

هەڤالەکی من

ڤیزەکە ئەلۆ لە مەکتەبێ هین دبە .

**سۆرانی** :-

هاورێیەکی من

کچێکی مەمۆ لە قوتابخانەدا فێردەبێ .

٤٤ - نیشانەی نەناسیاری کۆ (in,n-) . . . .بۆ (هن) دەگەڕێتەوە کە ئەمەش کورتکراوەی (هنە > هنەك > هەندەك)ە .

ئەمانەش لە جێناوی چەندی (هند) وەرگیراونو داڕێژراون (-ەك) و (ە) لێیان قرتێندراونو تەنیا (in) و (n) ماونەتەوە .

شێوەی (هنەوهن) لە دیالێکتی کرمانجیدا دەوری دیارخەری دەگێڕێ لەگەڵ بەخشینی واتای کۆی نەناسیاری :

هنە زارو گازێت تژی بەر ملا دفرۆتن (عەرەب شامیلۆڤ ٢٩٨)

هن خەڵك راست بە راست د شکەفتان دە ڕوودنین (هاوار ، ژمارە ٣٤)

(هن) هەمیشە دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە ، نەدیتراوە بکەوێتە دوایەوە . لەوانەشە جاران کەوتبێتە دوای ناوی دیارخراوەوە وە کورتبووبێتەوەو تەنیا شێوەی (-in -n) لێمابێتەوە کە ئەمڕۆ بە نیشانەی نەناسیاری کۆ دەژمێردرێن .

نیشانەی ناسیاری کۆ (in) و جێناوی چەندی (هنە -هن) لەڕووی واتاوە یەکن ، لەم وێنەیەدا ئەم دەورەی هەردووکیان بەدیاردەکەوێ

من هنە سێڤنە گر کرین .

لە دیالێکتی خوارووودا یەك هۆی نەناسیاری کۆ هەیە کە جێناوی چەندی (هەندە - هەندەك) بووێنە :

هەندە نەمام لەچەمەکەدا ئەڕوێنم (نووری عەلی -١٣٢)

٤٥ - نیشانەی نەناسیاری کۆ (in -n) بۆ جیاکردنەوەی کۆمەڵێك شت بەکاردێت لەنێو

شتێکی زوردا – ئەم نیشانەیە لە بەشە دیالێکتەکانی هاوچەرخدا لەلایەن کوردەکانی ئەرمەنستانو سوریادا بەکاردێت .

هەروا لەناو نووسراوەکانی (ا – ژابا) کە هی دیالێکتی ژووروە بەرچاودەکەوێت .

١ – نیشانەی نەناسیاری کۆ (in ,–n) لەگەلْ ئامرازی خستنەسەری (–ە) لێك دەدات و دەوری نیشانەی کۆ دەگێڕێ لەگەلْ ناوی دیارخراودا :

ا – دلاوانیا خوە دا من گەلەك گونە هنە بچووك و مەزن کرنە . (کامەران بەدرخان ١١–١٤١) .

قەوی زێدە تشتنە سپەهیو نەدیتی دگەل هەبووە (ا –ژابا –١١٢) ئەو گیایینە دەرمان دگەریان (ستگو کاندەر –٥٩)

ب – مەرڤن هاتن گوند (هاوار ، ژ – ٣٣ – ١٩٤١)

من سێڤن خوارن (جگەرخوێن – ١٦١)

من کالن دێتن ، زارو ل وان هێورینە (هاوار – ژ – ٣٢ ، ١٩٤٠) .

٢ – نیشانەی نەناسیاری (in–) لەهێندێ بەشە دیالێکتی کرمانجی خوارووا بەرچاودەکەوێ وەك ناوچەی بنگردو بژدەر . . .

پار بەهارێ مالن بارکر بۆ کوێستانی دارشمان (مەکەتری – ١٧٠)

لەوێ فەرشمان لێراخستن ، دانیختین ئیسراحەتن کرد (مەکەتری ١٧٠)

٤٦ – لەو وێنانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ روون بووە ، کەوا نیشانی (in–) لەهەردوو دیالێکتدا هەن و رێگەی پەیدابوونی لەهەردوو دیالێکتدا یەکەو هەمان واتاش دەبەخشن .

نیشانەی نەناسیاری (–ەك //ێك) لە ناوی ژمارە و (یەك) دارێژراوە و وەرگیراوە رێگەی ساغکردنەوەش هەر بەم شێوەیە ، کە لە in–) و (n– داپێرەومانکرد .

باوەکو شێوەی (هنە . . .in) لە دیالێکتی ژوورودا و هێندێ کرمانجی خواروودا نەختێك جیاوازە ، بەلاّم ئەرکی رێزمانیان یەکەو ، واتاشیان یەکە .

– **نیشانەی ناسیاری** –

٤٧ – لە ئەرکی رێزمانی نیشانەی ناسیاریدا لە زمانی کوریدا جیٚناوی نیشانەی ئەڤ (ئەم – سۆرانی) ، (ئە) ڤان – (ئەمان – سۆرانی) ئەو (ئەو – سۆرانی) ، (ئە) وان ، (ئەوان – سورانی ، کە بە کۆتایی ناوی تاكو کۆوە دەلکێت .

شێوەی ئەڤ ، ئەڤان ،ڤان (ئەم – سۆرانی) بۆ نیشانە کردنی شتو کەسی دوور لەرووی کاتو ماوەوە بەکاردێت .

گەرچی ناوی نیشانە لەسەرەتای رستەدا بوو ، ئەوە شێوەکەی بەدەنگی بزوێن دەستپێ‌دەکات .

بۆ دارشتنە ناوی‌ناسراو لە هەردوو شێوەدا جی‌ناوی نیشانە دەکەوێتە پێش ناوەوە و نیشانەی ناسیاری (–ە)ی دەچێتەسەر .

**تاك**

| سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|
| **ئەم ژن** –ە | **ئەڤ**–ا–ژن–ا |
| **ئەو دارە** –ە | **ئەو(ا)**دار (ا) |

**کۆ**

ئەڤ (ان) // ئەڤ + ان + ا)مالانە ئەم مالانە

ئەو (ان) // ئەو + ان + ا) دارانە ئەم دارانە

لە دیالێکتی ژووروودا شێوەیەکی دی ئەم دارشتنە هەیە ، کە لەگەلّ دیالێکتی خوارووودا یەکە .

| سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|
| **ئەم** +**مالّ** + **ان** +ە | **ئەڤ** + **مال** +**ان** +ا |
| **ئەو** –**دار**–**ان** –ە | **ئەو** + **دار** +**ان** +ا |

٤٩ – باسکردنی بەکارهێنانی جی‌ناوی نیشانە لە بریّتی نیشانەی ناسیاری س .ا ئیگزارۆف (٢٠) لێی‌دواوە : « ئەگەر هەر چ شتێك زۆرتر ناساندراو بەرادیەك هەر چ شکێکی لێ‌دەکرا لابردرا . کەوا ئەو شتەی باسی دەکرێت مەبەست هەر ئەوە نەك شتێکی دی ، لەوکاتەدا (i) دەخرێتە سەر (ئەو) وەکو هێزێکی گەرمۆنی (ایقاع) یاسای نەبزوێنان ، هەر ئەم (i)خراوەتە سەر ووشەی (mer) یش .»

نووسەر لە تێبینێکانی بەردەوام دەبێ‌و دەلێ : (نەبزوێنی (ا) کە بە ناوو جی‌ناوی نیشانەوە دەلکێت لەو کاتەدا بەکاردێت ، کە واتای ناساندنێکی زۆر مەزن دەبەخشێت) . س .ا . ئیگزارۆف لەدوای ئەم سەرنجانە دەنووسێ کەوا :

١ – جیٚناوی نیشانە لە زمانی کوردیدا ئەرکی ناساندن دەگێڕێت ،
٢ – بەخستنەسەری بزوێنی (i) و (a) بۆسەر جیٚناو واتای ناساندنێکی زۆر دەگەیەنێت .
٣ – بەدەرکەوتنی بزوێنی (i) لە کۆتایی ناودا کاتیٚ کە جیٚناوی نیشانەی لەگەڵ هاتووە ئەمە یاسای گەرمۆنی بزوێن دەگەیەنێت .

ئەم بارە لەلایەن لێکۆڵەوەرانی کوردناسی سۆڤێتیدا زێتر بایەخی پیٚدرا ، کە شێوەی جیٚناوی نیشانەیان لەگەڵ گەردان کردنی ناو لە بەشە دیالێکتی ئەرمەنستان دا تەماشا کردووە . گەیشتنە ئەو روونکردنەوەیەی داهاتووە ، کاتیٚ ، کە (â–) و (ê–) بە جیٚناوی نیشانە وەیا ناوەوە دەلکێن لەبەرئەوە نییە کە یاسایەکی گەرمۆنی پێك دەهێنن هەروەکو س .ا . بەگیزارۆڤ بۆی چووە بەڵکو رێك کەوتنی ناوو جیٚناو نیشانەیە لەرووی ژمارەو رەسەنەوە (٥٢ ، ١٢١–١٢٤ ، ٨٧ ، ٣٧–٤٣ ، ٢٦ ، ٨٥–٨١) .

ئەو بزوێنە (a–) یەی ، کە س .ا . بەگیزارۆڤ بەدەکا بەوەی بەجیٚناوی نیشانەی ئەڤ . نەڤان ، ئەو ئەوانو بە ناوەوە دەلێت ، دوورنییە ، کە بۆ جیٚناوی نیشانەی (هان) بگەرێتەوە (لەگەڵ (/ان)ی فارسی بەراوردیکە) .

جیٚناوی (هان) لە شێوەی تەواو و کورت کراویشیدا لە دیالێکتی ژووروی ئەمرِودا ئەرکی ئەتروبوتیڤ (وەسفی) دەگێرێتو لەگەڵ ناوو جیٚناویش دێتو نیشانەی خستنەسەری (ا– ، –یٚ) بە کۆتایی جیٚناوەکەوە دەلکێت : ئەڤ هان ، ئەڤیٚ هان ، ئەوا هان ، ڤیٚ رۆژاها میڤاندار گەلەك جۆمێری نیشاندا (ستك و کاندەر–ك) ئەز باوەر بووم ، کو ئەو کاریٚ هان شوندا مابە (ستك –٧) .

زۆر دوورنییە ، کەوا نیشانەی (ا) لە دیالێکتی ژووروو و نیشانەی (–ە) لە دیالێکتی خوارووداا ، کە هەرووکیان لە رووی ژمارەوە بیٚلایەنن لە ئەنجامی پێوەلکانی شێوەی کورت کراوەی جیٚناوی نیشانەی ها ، هە (لەهان)ە بە ناوی دیارخراوەوە پێك هاتبێت .

کەواتە ، لە زمانی کوردیدا دوو شێوە جیٚناو ئەرکی نیشانەی ناسیاری دەگێرن : یەکەمیان – جیٚناوی نیشانەی ئەڤ ، ئەو ، ئەم هتد . . کە واتای خۆیان لەدەست نەداوەو دەکەونە پێش ناوەوەش ، دووەمیان – جیٚناوی نیشانەی هان (ها ،هە) ، کە واتای خۆی لەدەستداوەوشێوەشی گۆراوەو دەکەوێتە دواوەو لەشێوەی نیشانەی ناسیاریدا دەبیت : (–e, –a

ئەڤ – ا ژن – ا هات (ئەم ژن –ە هات – سورانی)

ئەوان –ا کوردان ا هین دبن (ئەو کوردان –ە هیندبن – سورانی سولتان مەحموو ئەو شەوە خەوی لیٚنەکەوت ، مەکەنزی – ٣٦ .

٤ - جیٚناوی نیشانه لەگەڵ نیشانەی ناسیاری یەکە لەم دۆخانەدا بەکاردێت :

١ - لە دۆخی راستەوخۆدا بەکاردێت ، کە لەهەردوو دیالێکتدا ژووروو خواروو یەکە :

عەجیبە ئەم ژنە بۆ کامەیان ئەبێ ؟ (مەکەتری –٤٠)

عەجیبە ، ئەڤ - ا ژنا نها وێ ببە یا کیژانی (کرمانجی ژووروو)

ئەم قسانە هەمی حەم من بهایێ وان فلەکە (کرمانجی ژووروو)

ئەم قسانەلای من هەمووی بایێ فلسێکە . (مەکەنزی ، ٢) .

ئەڤ قسانە هەمی جەم من بهایێ وان فلسەکە (کرمانجی ژووروو) .

٢ - لە دۆخی ناراستەوخۆ (تیان)دا جیٚناوی نیشانەی تاك لە کرمانجی ژوورووودا دەوری نێرخەری دەگێڕێ ، کە لە رووی رەسەندا لەگەڵ ناودا رێك دەکەون ، وە نیشانەی (–ا) لە دۆخی ناراستەوخۆدا دەبێ .

لە کرمانجی خوارووودا جیٚناوی نیشانە ناگۆڕێ ، بەواتە بەپێی جۆری ناو رەسەنی تێك دەچێت . نیشانەی –ە – بە کۆتایی ناوەکەوە دەلکێ :

تو ڤێ بزنێ بفرۆشە (کامەران –٢٨)

ئەوێ رۆژێ من ب خو ، ژ بیرا کر .

دڤ شاری دە زۆرا ژاپۆنان چوو (هاوار –٤٥ ، ١٩٤٥) .

ئەو ساڵە منتان لەگەڵ نەبووم (مەکەتری –٧٠)

ئەم پاشایە ، لەو رۆژەوە ئەو ژنە بچکۆڵەی هێناوە (مەکەتری –٤٢)

بە پاشا بڵێن ، ئەو کورەم ئەوێ ، کە چوو ، بۆ هەنار (مەکەتری ٥٤)

لەو وەختە رادیۆ نەبوو (مەکەتری –٧٤)

٣ - نیشانەی کۆ لە دۆخی تیاندا لەگەڵ نیشانەی دۆخی راستەوخۆدا یەك چین ، نیشانەی ناسیاری –ا (–ە) لە باری کۆش‌دا لەگەڵ ناودا دێو بهتایبەتی لە دیالێکتی کرمانجی‌دا و جیٚناوی نیشانەی کۆش (–ا)ی دەچێتەسەر :

ئەڤان – ا کتێبانا ژمنرا بشینە کرمانجی – (ژووروو)

ئەم کتێبانە بۆم بنێرە (کرمانجی خواروو)

ئەڤان – ا کتێبانا کەتن (کرمانجی ژووروو)

ئەم کتێبانە کەوتن (کرمانجی ژووروو)

لە دیالێکتی خوارووودا تەنێ یەك جۆرە دارشتن هەیە ، بەتایبەتی لەگەڵ نیشانەی کۆی لەگەڵ ناو بەگارهاتوو :

ئەم سێوانە نجۆ .
٤ – کاتێ جیٚناوی نیشانە بە پێش ووشەی لێکدراوی دیارخەریدا دەکەوێ ، کە لە دۆخی خستنەسەردایە ئامرازی خستنەسەر دەچێتە سەر ووشەی یەکەمی ووشە لێکدراوەکە . ئەمە لە دیالێکتی ژووروودا ، بەلاّم لە دیالێکتی خوراوودا ئامرازی خستنەسەر دەکەوێتە دوای نیشانەی (–ە)ەوە ، کە ئەمەشیان بە کۆتایی ووشەی یەکەمی ووشە لێکدراوەکەوە لکاوە :
ئەڤ لاوا قارەمان ل ناڤ شاردا هاتنە کوشتنێ
ئەم لاوانەی قارەمان لەناو شەڕدا کوژران . (سۆرانی)
وایە ئەم مێوانەی ئێمە زور موسلّمانە (مەکەتری –٦٤)
وایە ئەڤ میڤانێ موسلمانەکی زۆرە (کرمانجی)
٥ – کاتێ نیشانەی ناسیاری لەگەلّ ووشەی لێکدراودا دێ دەکەوێتە کۆتایی دوا ووشە . بڕوانە :
لەڤان دەشتو چۆلانا مەگەرە (کرمانجی)
لەم دەشتو چۆلانە مەگەرە (سۆرانی)
٥٠ – لە سۆرانیدا نیشانەی تایبەتی ناسیاری هەیە ، کە ئەویش (–ەکە)یە لە تاکدا وە (–ەکان) لە کۆدا ، کە لە نیشانەی ناسیاری (–ەکە) ونیشانەی کۆ (–ان) پێك هاتوون :
ژنەکان ئیش ئەکەن .
شاعیرەکەمان دلّو دەروونی بۆ کورد تەرخان کردووە .
لە ناوی لێکدراوی دیارخەریدا نیشانەی ناسیاری (–ەکان) بە دیارخەرەوە دەلکێ . جا دیارخەرەکە برێتی بێ چ لە ناو وەیا ئاوەلّناو .
گولّە جووانەکەی گەرمیانو کوێستان (هیوا ، ژ – ١ – ١٩٥٧)
پیاوە گەورەکانی کورد (ماروف قەرەداغی –٦٨)
٥١ – بوونی جوری دووەمی نیشانەی ناسیاری (–ەکە) بۆ تاكو (–ەکان) بۆ کۆ جیاوازی واتای ڕێزمانی لەگەلّ ئەم نیشانانەدا هەیە ، ئەم . . . ە ، ئەم . . انە ، چونکە ئەمانە شتێك بەدیاردەخەن ، کە لەبەرچاوی قسەکەر بێت ، بەلاّم نیشانەی (–ەکە) ، (–ەکان) واتای شتێکی نێزیکی دەوروبەر وەیا کۆمەلّە شتێکی هەمان جۆر ، کە تا کاتی قسەکردن ناسراوە .
٥٢ – لە زمانی کوردیدا ژمارەی تاكو کۆ هەیە ، کە لە دۆخی راستەوخۆدا دەبن ، بەلاّم دارشتنێکی روونو ئاشکرای نییە ، ژمارە بۆی هەیە لە ئامرازی خستنە سەردا . کۆتایی کەسی کارەکان ، نیشانەکان و لە شێوەکانی دۆخی تیاندا (ناراستەوخۆ) وە دۆخی بانگکردندا ڕێك بکەوێ . بەلاّم هێندێك جار ژمارە تەنێ لەکاردا بەرچاودەکەوێ .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| ژن هات | ژن –ەکە هات |
| | ژن هاتن//ژنان‌هاتن |
| | ژن–ەکان //هاتن |

کرمانجی

پاله چوون شەهرێ بەغدانێ (فۆلکلۆری کرمانجی –٥٧٤)

خان دەرکەوتنە حەوشێیە (فۆلکلۆری کرمانجی –٥٧٧)

سۆرانی :

ئەگەر چووم تەماشام کردن ، شتڵەکان رەق بوون (مەکەتری –١٧٠)

هەر ئەو رۆژە لەشکەر هاتنە ناو شارەوە (دیوانی سەلام – ١٣)

کە پۆلیسەکان هەلاتن ، ئەو ناوە کەوتە دەستی ئێمە (محمد توفیق ووردی –١٩)

دەربارەی هۆیەکانی مۆرفۆلۆژی بۆ دابەش‌کردنی ژمارە بروانە بەندی ٦٢–٦٣ .

دەربارەی دارشتنی ژمارە بەیارمەتی نیشانەی خستنەسەر بروانە بەندی ٧٧–٨٧

دەربارەی جیاوازی ژمارە بەیارمەتی نیشانە بروانە بەندی ٤٥ –٥١

## رەسەن

٥٣ – کەتیگۆری رەسەن تایبەتێکی ناوە ، کە ماوەیەکی زۆربوو لە جیهانی کوردناسی‌دا نەناسراوبوو .

ف . یوستی لەبەرهەمی زمانەوانی خۆی‌دا دەست نیشانی رەسەنی لە زمانی کوردی‌دا نەکردووە . ئامرازەکانی خستنەسەری (–ا ،یَ ،–ی) کە دەوری پێشاندانی رەسەنیش دەگێرێ یوستی‌بە دیاردەیەکی فۆنیمی لەقەڵەم‌داوە کە لەو باوەرەدابوو لە (–ی) خستنەسەری زمانی فارسی‌یەوەیە هەروا نیشانەی دۆخی ناراستەوخۆی نێرو مێ (–ی) و (–یَ)ی بە پاشگری نسبی (–ی)ی فارسی تێگەیشتووە .

ی . سۆن – وەك فاسۆم هەروا هێندێ نووسەرانی دیش ، لەبارەی دەست نیشان‌کردنی رەسەن لەزمانی کوردی‌دا هەر هەمان بۆچوونیان هەبووە کە ف – یوستی بۆی‌چووە .

ر .جاردن ، کە لە ساڵی (٢٩٢٢)دا بەرهەمە رێزمانی‌یەکەی خۆی بلاّوکردۆتەوە ، بۆ یەکەمین جار ئەوەی نووسی کەوا .

ئامرازی خستنەسەری (-ا) و ( یێ) لە زمانی کوردیدا بۆ پێشاندانی رەسەن بەکاردێت ئامرازیخستنەسەری (-ا) بۆ مێ وە (-ێ) بۆ نێر. نەخشەیەکی راستترو فراوانتر لەلایەن زانایانی کوردناسی سۆڤێتییەوە دەربارەی رەسەن لە زمانی کوردیدا بلاوکراوە .

لە سالی (١٩٣٠)دا دووبابەت دەربارەی کێشەی رەسەن بلاوکرانەوە . کە یەکێکیان دەربارەی خستنەسەرو ئەوەی دیان دەربارەی کێشەی رەسەن بوو لە زمانی کوردیدا ئەم ووتارانە لەگەلْ ئەو دوو ئامرازانەی خستنەسەر (-ا)و (-یێ) کە (ر. جاردین) بۆ یەکەمین جار باسیکردن . نووسەرانی بابەتی خستنەسەر باسی دوو ئامرازی دیشیان کرد کە (-ە) و (-ی) بوون .

رەسەنی نێرو مێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا هەیە . بەلام لەهەر دیالێکتەی شێوەی دەربرینی تایبەتی خۆی هەیە وەك لەو تێکستانەدا بەرچاودەکەوێ . کە (ۆ.مان) لەناوچەی موکریدا کۆییانیکردۆتەوە رەسەنی نێرو مێ لە زۆربەی دۆخەکانی بەشە دیالێکتی سلیمانیدا نەماوە .

## دابەشکردنی ناو لەرووی رەسەنەوە .

٥٤ - دابەشکردنی ناو لەرووی رەسەنەوە بۆ یەکەمین جار نووسەری ئەم بەرهەمە لەسالی (١٩٤٩) (٨٧ ، ١٠-٢٠) کردویەتی و بلاوکردۆتەوە نووسەرانی دوای ئەو پێرەوی ئەم دابەش کردنەیان کردووە (٥٣ ، ٥-٥٦ ، ٢٦ ، ٤٤-٥٢) . لەزمانی کوردیدا رەسەنی نێرو مێو هاوبەش هەیە .

## ناوی رەسەنی مێ

٥٥ - لە دیالێکتی کرمانجی ، موکری وەشێوەی ئاخاوتنی سۆرانی لەرووی واتاوە ئەم گروپانەی ناو هەیە لەرووی رەسەنی مێوە .

١ - ناوی رەسەنی مێی ژنان . وەك : ژن ، خوشك ،کچ ، کەچ بووك ، کەڤانی // کەبانی // کەوانی (کابانی) ، دایك .

٢ - ناوی گیانلەبەرانی مێ : چێلەك (چێلْ -سۆرانی) ، مەهین (ماین - سۆرانی ، بزن ،مێ (مەر-سۆرانی) .

٣ - ناوی ئەبستراکتی مێ ، کە بەیارمەتی پاشگر دارێژراون - تی (-ەتی - ایەتی - تی-سۆرانی) ،-ی ، ایی وەیا (-اهی) لە بەشە دیالێکتی کوردی سوریەی ، -انی .

براتی (برایەتی - سۆرانی) هەڤالەتی (هاورێیەتی - سۆرانی) دوژمنتی (دوژمنایەتی - سۆرانی) ، دزێتی . دۆستی . سەرکاری ، ئەرزانی (هەرزانی) بە سۆرانی ، مەنایی ،

تعشتانی ، سۆرانی (سۆرانی – سۆرانی) ، شیرین ، زەدانی ، مێرانی ، خورتانی ، ژنانی . . .
٤ – هەموو ناوێکی ڕووداو (چاووگە) بەر ڕەسەنی مێ دەکەوێ :
کرن (کردن –سۆرانی) ، برن (بردن –سۆرانی) ، هاتن ، کرین ، نالین ، زەرین . هەروه
ئەو ناوانەی لە دووپاتکردنەوەی ڕەگی چاوگەوە دارێژراون بە یارمەتی بەندی (–ە) وەك :
ـەنال ، زەرەزەر ، قیرەقیر
٥ – ناوی تایبەتی : سەیران ، پەریخان ،گوڵزار
٦ – زۆربەی ناوی بیانی : پارتی ، بانك ، بێنزین ، سۆڤێت ، سۆشیالیزم
٧ – زۆربەی ناوی جوگرافی : (ناوی وولات ، شار ، ڕووبار . . .)
کوردستان ، دیاربەکر ، ئاگریداخ . . .
٨ – ناوی کات (مانگ ، ڕۆژانی هەفتە ، کاتەکانی ڕۆژ) .
بهار (بەهار–سۆرانی) ئینی (هەینی – سۆرانی ) ئێوار (ئێوارە – سۆرانی) . . .
٩ – زۆربەی ناوی بێگیان ، کە هیچ نیشانەیەکی واتاییش نابەخشێ کتێب ، ماڵ ، کان ،
ترس ، مێرگ ، دەشت ، چۆل ، ئاف ، کاس ،ڕێ . . .
(ئەم ناوانەی ژوورەوە ، کە بەر ڕەسەنی مێ کەوتوون نیشانەی تایبەتی دۆخو ئامرازی
حستنەسەری تایبەتی وەردەگرن کە لەمەودوا باسیان دەکەین) .

## – ناوی ڕەسەنی نێر –

ە – ناوی ڕەسەنی نێر لە دیالێکتی کرمانجی ، موکری ، بنگرد وپژدەر ئەم گروپانە دەگرێتە خۆی :
١ – ناوی ڕەسەنی نێر : مێر (مێرد – سۆرانی) ، کور ، برا ، (باو // باوك –سۆرانی شڤان
شوان –سۆرانی) خال . . .
٢ – ناوی گیان لەبەرانی نێری ، بەران ، گا ، دیك (کەڵەشێر – سۆرانی)
٣ – ناوی تایبەتی پیاو : کەکان ، سەمەند ، مەمەند ، گورگین . . .
٤ – لەگەڵ ئەوانەشدا لەم دیالێکتو بەشە دیالێکتانەی کە لە ژوورەوە ناومان بردن هێندێك
ـوی بێگیان هەن کە هیچ نیشانەیەکی واتایشیان نیەو کەچی بەر ناوی ڕەسەنی نێر دەکەن :
بار ، چەم ، دل ، دەست ، نان ، مێشە ،دار . . .
وەنەبێ گەرانەوەی ناو لە کرمانجیدا بۆ بەشی ناوی ڕەسەنی مێ وەیا ڕەسەنی نێر
هەمیشەبێو یەك چەشن بێ لە هەموو بەشە دیالێکتەکاندا ، بەم جۆرە لەنێو بەرهەمی

قوتابخانەیی کامەران بەدرخان (٨٦) ووشەی مەزەل (٧) ، بۆخچە (٩) ، تشت (١٦) ، سینگ (١٩) لە بەشی (ف) یدا بە رەسەنی مێ لە قەڵەم دراوە ،کەچی لە بەشە دیالیکتی ئەرمەنستاندا هەر هەمان ئەم ووشانە بەر رەسەنی مێ کەوتوون (بەکاییف –١٤) .

## ناوی رەسەنی هاوبەش // بێلایەن

٥٧ – لە زمانی کوردیدا لەپاڵ ناوی مێو نێردا ناوی هاوبەش هەیە ، کە بۆ هەردوو رەسەن دەست دەدات نێرو مێ بەهۆی ئەو ووشەوە دیار دەکەوێ ، کە بۆی دەگەڕێتەوە :

١ – ناوی هاوبەش ، کە بوونی هەست پێکراوی هەیە :

هەڤال (هاورێ – سۆرانی) کە بۆ نێرو مێ ، شێر . . .

٢ – ناوی پیشەوەری : هۆستا (وەستا –سۆرانی) ، خوەندکار ، سەرۆك . .

٣ – ناوی تایبەتی ئاوەڵناوی : پیر ، بەدەو (جوان –سۆرانی)

## – گەردانکردنی ناو –

## «سەرنجی گشتی»

٥٨ – دۆخ لە رێزمانی کوردیدا ماوەیەکی زۆر لێی نەکۆڵدراوەتەوە . (ف .یوستی) وە (س – ئیگازاروف) هەریەك بە شێوەیەك ئەرکی نیشانەی (–ێ) و (–ی) پێشان داوە . (ئۆ–مان) ئەوەی دەستنیشان کردووە ، کەوا لەزمانی کوردیدا پێ لە دۆخی ناوی . دۆخی خستنەسەرو بەرکاری هەیە ، کە کۆتایی ناوەکان بە (–ێ) و (–ی) دێ . بەلام نەیزانیوە ئەم دوو نیشانەیە لە رێزماندا چین ؟ (ئوسکارمان) دەڵێ :

(بەداخەوە ، ناتواندرێ ئەوە بزاندرێ ، کە بۆچ دوا ووشەی ئەم دۆخە ، کۆتایی بە (–ێ) یان (–ی) دێ . هەروا نازاندرێ لە چ بارێکدا ئەم دوو دەنگدارە پەیدا دەبن) . وەلام دانەوەی ئەم پرسیارانەی (ئۆ–مان) لەلایەن زانایانی کوردناسی سۆڤێتی درایەوە .

لێرەدا بەکورتی مێژووی لێکۆڵینەوەی جۆرەکانی دۆختان دەخەینە بەرچاو .

جۆرەکانی دۆخ لە خشتەی (ف –یوستی)دا .

| تاك | کۆ |
| --- | --- |
| دووشمەن | دووشمەنان |
| دووشمەن | دووشمەنان |
| دووشمەنرا | دووشمەنانرا |

| | |
|---|---|
| (–ی) ، (–ا–یٚ)دووشمەن | (–ی) ، (ا ، –یٚ)دووشەمانان |
| دووشەمەندا | دووشەمەناندا |
| (ژ) دووشممەن | (ژ)دووشمەنان |
| (ا–ای)دووشمەن | (–ای) دووشمەنانۆ |

(ی–سۆن)یش هەر هەمان خشتەی ژووورووی پێشان داوین لە بارەی جۆرەکانی دۆخی زمانی کوردی :

| تاك | كۆ |
|---|---|
| مال ، مالەکە | مالان ، مالەکان |
| مالی ، مالیٚ | مالا ، مالا |
| بـمال ،بـمالرا | بـمالانرا |
| –یمالی ،–امالی ،–یمال | –یمالان ، امالان |
| د مالدا ، لەمالدا | دمالاندا ، لەمالاندا |
| ژ مالدا ، لەمالدا | ژمالاندا ، لەمالاندا |

لێکۆڵەرەوەکانی ئەوروپی تا ئەم سالاْنەی نێزیك ، شتێکی ئەوتۆیان نەخستەسەر ئەو خشتانەی ژووروو بۆیە لێکۆڵینەوە لە دۆخەکانی زمانی کوردی لە دەرەوەدا پەرەی نەسەند هۆی پەرنەسەندنیشی بۆ چۆنیەتیو جۆری لێکۆڵینەوەکانیان دەگەڕێتەوە ، کە ئەم کێشەیان لە بنەتەکەو نیشانەکانی خۆی بەواتە لەناو و نیشانەکانی نەکۆڵیوەتەوە بەڵکو وای بۆچوون ، کە ئەم دۆخانە بەیارمەتی ئامرازو هیندیٚ ووشەی دی یارمەتیدەر دادەرێژریٚ .

کەمو کورتی ئەم دۆخانەی سەرەوە بۆ لاسایی‌کردنەوەی خشتەی دۆخەکانی زمانانی دی هیندو ئەوروپین . ئەم کێشەیە هەر بەم جۆرە مایەوە تا لە ساڵی (١٩٣٣)دا چەند زانایەکی گەنجی سۆڤێتی لێکۆڵینەوەیەکیان دەربارەی کێشەی رەسەن لە زمانی کوردیدا بلاْوکردەوە ، کە چەند لایەنی شاراوەی ئەم کێشەیان بۆ روون کردەوە . لە گەردانکردنی ناوی نێرو ناوی میٚ – لەم لێکۆڵینەوەیەدا شەش دۆخیان خستۆتە روو . کە لە زمانی کوردیدا هەن – سیٚیانیان دۆخی راستەوخۆ ، بانگ‌کردنو تیان ، سیٚیەکەی دییان ژمارەیان بۆ داناوە ، کە تا ئەوسا لە ئەرکیان نەکۆڵدرابۆوە .

خشتەی گەردانکردنی ناوی مێو نێر لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەم جۆرە بووە :

| دۆخ | ناوی ڕەسەنی مێ | | ناوی ڕەسەنی نێر | |
|---|---|---|---|---|
| | تاك | کۆ | تاك | کۆ |
| ڕاستەوخۆ | خوشك | خوشك | کور | کور |
| بانگکردن | خوشکێ | خوشکنۆ | کورۆ | کورنۆ |
| تیان | خوشکێ | خوشکا | کور | کورا |
| چوارەم | خوشکێرا | خوشکارا | کوررا | کورارا |
| پێنجەم | خوشکێڤا | خوشکاڤا | کورڤا | کوراڤا |
| شەشەم | خوشکێدا | خوشکادا | کورا | کوردا |

دیاریکردنی ئەرکی ڕێزمانی نیشانەکانی دۆخی (ـێ) و (ـی) بوونە هۆی دەست نیشان کردنی دۆخەکانی زمانی کوردی .

٥٩ – لێکۆڵینەوە لە بەشە دیالێکتەکانی جیاجیای دیالێکتی کرمانجی واتای گشتی و ئەرکی هەر دۆخێکیان بۆ ڕوون دەکاتەوە . لە کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکانی ساڵی ١٩٤٩ بەم شێوەی خوارەوە ناوی دۆخەکان هاتوون :

١ – حالێ ڕاست ٢–حالێ گازکردنی

٣ – حالێ تەواندی

٤ – حالێ هەڤرا

٥ حالێ تەڤای

٦ – حالێ جیوار .

لە دوای ئەمەدا ئەو زانیاری یانە وەدەستخرا بۆ ئەوەی جۆرەکانی گەردانکردن بە شێوەیەکی درێژتر بەپێی نیشانەو بەپێی گۆڕینی ناوەوەو دەرەوەی ووشە بکرێت (٢٦ ، ٥٦ –٩٥) . تایبەتێتی و ئەرکی ئەم دۆخانەی سەرەوە بەدوورووو درێژی ڕوونکرایەوە ، بەرامبەر ئەمە ئەم ناونانانەی سەرەوەیان لێندرا .

دۆخی ڕاستەوخۆو تیان (ناڕاستەوخۆ)

٦٠ ق دۆخی ڕاستەوخۆو تیان لەباری تاکدا لە هێندێك بەشە دیالێکتی خواروو لە زمانی ئاخافتنی داو لە هەموو بەشە دیالێکتەکانی دیالێکتی ژووروودا جیاوازیان هەیە . لە زمانی ویژەیی

سۆرانی‌دا لەباری تاك‌دا هیچ نیشانەیەکی مۆرفۆلۆژی نی‌یە بۆ ئەوەی ئەم دوو دۆخە لێك جیابکاتەوە ، بەڵکو هەر لە باری بێ‌لایەن دایە .

بەڵام لەباری کۆدا دیالێکتی ژووروو لە هێندێك بەشە دیالێکتی خوارووودا شێوەی دۆخەکانی راستەوخۆو تیان جیاوازن .

لێرەدا دۆخی راستەوخۆ هەر بریتی دەبێت لە بناخەی ناوەکەو دۆخی تیان (–ان) پێوە دەلکێت .

زمانی ئاخافتن‌و نووسینی سۆرانی لە باری کۆدا لە هەردوو دۆخەکەدا راستەوخۆو تیان‌دا ناگۆڕێت ، بەڵام لە دۆخی بێ‌لایەن‌دا هەر تەنیا ناوەکە بەکاردێت‌و (–ان) پێوە دەلکێت .

## دۆخی راستەوخۆ

٦١ – لەشێوەی تاك‌و کۆی دۆخی راستەوخۆ لە دیالێکتی ژووروو و چەند بەشە دیالێکتی خوارووودا تەنێ ناو بەشداری دەکات .

ناو لە دۆخی ڕاستەوخۆدا چەند رۆڵێکی جۆراوجۆری سیتاکسی دەگێڕێت .

١ – ناو لە دۆخی ڕاستەوخۆدا ئەرکی نیهادو بکەر دەگێڕێ لە ڕستەدا (بڕوانە ٢٦٦ –٢٨٠)

| ژمارە | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| تاك | ژن گۆران درێسە | ژن – ەکە گۆرەوی ئەرێسێ |
| کۆ | ژن گۆران درێسن | ژنەکان گۆرەوی ئەرێسن |
| تاك | ژن – ەك هات | ژنێك هات |
| کۆ | ژن هاتن | ژنەکان هاتن |

**کرمانجی :**

**سەهـ تەنێ دچە ناڤ دەڤیان . . . ڤێ جار گور دەژۆن سەر سەهێ پیر (ڕووناهی –ژ–٢– ١٩٤٣)**

**بلا ژ ڤان گوتنا من نەێتە زانین کو کورد هەڤێ مێدانێ نزانن .**

**سۆرانی :–**

**بنوارە ، ئەم ئوتومبیلە چۆن لە کەلك کەوتووە (هیوا) شارەکە دوور بوو ، لەبەر ئەوە ئێشی تەواوی ڕێگام ئامادەکرد ( هیوا ، ژ –٥ ، ١٩٥٧) .**

سوارەکان لە رووبارەکە پەڕینەوە .

٢ – ناو له دۆخی راستەوخۆدا دەوری بەرکار دەگێڕێ لە ڕستەدا :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| من ژنەکە دیت | من ژن –ێك – م دێت |
| من ژن دیت | من ژن –ەکان –م دیت |

کرمانجی :–

قیزەکێ کلیت ئانی ، فەیدو چیدارێ کەهێنی ڤەکر . رووڤی کەڤرەك دانی بەر کونا خوەو چوو گەرێ ، (خوەندێ کوردی ، ٤٥)

خان بازرگان باشی تەمام رووت و تازی کرن .

سۆرانی :–

کچەکانم لەباخەکەدا دی (نوری عەلی–٢٠٩) .

منالەکە دوو شوشەی شکاند .

٣ – ناو لەدۆخی ڕاستەوخۆدا دەبێتە بەشێك لە گوزارەی ڕستە :–

کرمانجی :–

کەڕو کولك وی چاخی زاربوونە .

هەردوو کورێ وێ دبنەکاڤان .

خەلکی وەلاتەکی براێن هەڤ ، پسمامێ هەڤن .

سۆرانی :–

شاری بەخدانی پایتەختی عیراقە .

کابرای زۆر خۆری ئەبێ میوان .

کوردستان لەبەهاردا بەهەشتە .

## دۆخی بانگ کردن

٦٢ – لە ناو بەرهەمە ڕێزمانی یەکاندا دۆخی بانگکردن درەنگ لێی کۆڵدراوەتەوە (ف – یوستی) باسی ئەم دۆخە تەنێ لە باری کۆدا دەکا .

سۆنو ئەوانەی دوای ئەو هەر هێندێ ووشەی بانگکردنیان لەم دۆخەدا دەست نیشان کردووە کە ئەمانەن : هۆ ، هۆلۆ ، هۆی ، یا ، بەلام نیشانەکانی باس نەکراون .

نیشانەکانی بانگکردن بۆ یەکەمین جار لە لێکۆڵینەوەکانی بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستان ، کە لەلایەن زانایانی سۆڤیێتی کراون ، بەرچاو دەکەوێ .

دۆخی بانگ‌کردن لە دیالێکتی کرمانجی‌دا بۆ تاك ئەم نیشانانەی هەیە :
( یّ) وە (-ۆ) . لە سۆرانی‌دا (-ێ) بۆ مێیەو (-ە) بۆ ڕەسەنی نێرە نیشانەکانی دۆخی بانگ‌کردن لە باری کۆدا لە هەردوو دیالێکت‌دا ڕەسەنی نێرو مێ نی‌یە .

**وێنە بۆ دۆخی بانگ‌کردن لە باری تاك‌دا :**

**کەچیّ وەرەبخونە (کرمانجی)**

**کچە (کچێ) وەرە بخوێنەرەوە (سۆرانی)**

**باڤۆ توێ کەنگیّ هەری شەهر؟ (کرمانجی)**

**بابە تۆ کەی ئەچی بۆ شار؟ (سۆرانی)**

**خوشکێ ناڤێ تە چی‌یە؟**

**خوشکە (خوشکێ) ناوی تۆ چی‌یە؟**

**وێنە بۆ دۆخی بانگ‌کردن لە باری کۆدا :-**

**کوردنۆ هشیاربن رۆژا سەرخوە بوونیّ هاتی‌یە .**

**کوردینە ووشیاربن رۆژی سەربەخۆیی هاتووە .**

گەر بانگ‌کردن بۆ چەند کەسێك بێ ئەوە نیشانەی دۆخەکە بە کۆتایی دوا ناوەوە دەلکێ ، کە مەبەستیش لە بانگ‌کردنەکە بۆ هەموو کەسەکانە ، نەك تەنێ هەر ئەوەیان ، کە نیشانەی (-نۆ) وە (-ینە)ی پێوە لکاوە :

**کەچو کورنۆ نۆ وەرنە مالێ .**

**کچو کورینە وەرنە مال (ەوە) .**

٦٣ - لەپاڵ ئەو نیشانانەی ژووروو ، کە لە دۆخی بانگ‌کردن‌دا هەن هێندێك ئامرازی پێوەندی هەن ، کە واتای بانگ دەبەخشێت بۆ کەس و شت وەك :

لێ ، لۆ ، وای ، لێ ، وای‌لۆ ، گەلی ، ئای

١ - ئامرازی (لێ) و (لۆ) ، کە دەکەوێتە پێش ناوی بانگ‌کراوەوە کەتیگۆری ڕەسەن و ژمارەی هەیە .

(لۆ) بۆ نێوی تاکی نێر هەروا بۆ کۆش بەکاردێت .

(لێ) بۆ نێوی تاکی مێ بەکاردێت .

ئەم جۆرە ئاوازانە بەزۆری لەنێو بەرهەمی فۆلکلۆری و زمانی قسەکردنی کرمانجی بەرچاو دەکەوێت .

أ – لیٚ گولیزاریٚ ، لیٚ‌کەچیٚ ، لیٚ‌ژنیٚ
ب – لۆ جاسمۆ ، لۆ خالۆ ، لۆ کورۆ
ج – لۆ هەڤالنۆ ، لۆ کەچنۆ .

ئامرازی سەرسوڕیٚنەری (وای) هیٚندیٚك جار بە پیٚش (لۆ) و(لیٚ) ەوە دەکەویٚ ، کە ئامرازیٚکی بانگ‌کردنو سەرسوڕیٚنەری تیٚکەلٚ دادەڕیٚژن وە بەزۆری لەناو گورانی‌یان‌دا دووپات‌دەکریٚتەوە :

(وای‌لیٚ) و (وای‌لۆ) شیٚوەیەکی دی فۆنەتیکی هەیە ، کە (های‌لیٚ) و (های‌لۆ)یە .

٢ – لە بەشە دیالیٚکتی زمانی کوردی ئەرمەنستانو سوری‌یەدا لەگەلٚ ، ئامرازی (لیٚ) و (لۆ)ی ئامرازی (یٚلیٚ // دهیٚلیٚ) .

ۆلۆ // (هۆلۆ) بۆ بانگ‌کردن بەکاردیٚت .

یٚلیٚ // (هیٚلیٚ) بۆ ڕەسەنی میٚ وە ۆلۆ // (هۆلۆ) بۆ ڕەسەنی نیٚر بەکاردیٚت ، وەك :

یٚلیٚ خەزالیٚ // هیٚلیٚ خەزالیٚ .

ۆلۆ مستۆ // هۆلۆ مستۆ .

٣ – ئامرازی (ئای) ، لە هەردوو دیالیٚکتەکەدا تەنیا ئەرمەنستان‌دا نەبیٚ لە دۆخی بانگ کردن‌دا بەکاردیٚت :

ئای جامیٚر ، تۆ چ ژ من دەخوەزی . (کرمانجی)

ئای جامیٚرد ، تۆ لە من چیت دەویٚ (سۆرانی)

ئای ژن ، کراسیٚ من بشۆ .

٤ – لە کرمانجی هەروا لە سۆرانیش‌دا ، بۆ داڕشتنی دۆخی بانگ‌کردن ناویش لە دۆخی ڕاستەوخۆدا بۆ تاكو کۆ بەکاردیٚت :

براتو دچی کو؟ (برا ، تۆ ئەچی بۆ کویٚ ؟ – سۆرانی)

هەڤال ، ناڤی تە چی‌یە ؟ (هاوریٚ ناوی تۆ چی‌یە ؟ –سۆرانی)

خوشك‌و برایان ، هەلٚسن (ڕۆژی نویٚ ، ژمارە –١١ ، ١٩٦١)

(خوشك‌و برانۆ ، ڕابن – کرمانجی)

هاوریٚو هۆگران ، وەرن ، (هەڤالو هۆگرنۆ ، وەرن – کرمانجی)

٥ – لە بەشە دیالیٚکتی کوردانی ئەرمەنستان‌دا بۆ کۆمەلٚیٚك کەس ووشەی «گەلی» بەکاردیٚت‌و دەکەویٚتە پیٚش ناوەوە . ئەم ناوەش نیشانەی کۆ (–ان وەیا – ا)ی دەچیٚتە سەر :

گەلی هەڤالان ، هون ل‌ڤرا چ دکن ؟

گەلی خوشکان ، ئاڤیٚ بینن .

٦٤ – بەم جۆرە هۆیەکانی دارشتنی باری بانگ‌کردن بریتی‌یە لە پیت‌و لەناو ، کە دەکەونە پێش ناوەوە . لەنێو ئەم هۆیانەدا هۆی گشتی‌و هۆی تایبەتی هەن بۆ کرمانجی‌و بۆ سۆرانی . لەگەلّ ئەوەش‌دا دەبیّ تێبینی ئەوە بکەین ، کەوا شێوەی دارشتنی باری بانگ‌کردن هێز نەچەسپیوە ، بۆیە هێندێك جار بەرێگەی دی دەردەبرێت ، بەواتا لە شوێنی ناودا لە دۆخی بانگ‌کردن‌دا ناو لە دۆخی راستەوخۆ لە باری تاك‌و کۆدا بەکاردێت ، زۆرجاریش لە شوێنی نیشانەی بانگ‌کردن‌دا نیشانەی رێك‌کەوتووی دی بۆ بەکاردێت . ئەم بارە نەچەسپیوەی بانگ‌کردن ئەوە پێشان دەدات ، کەوا دۆخی بانگ‌کردن وەکو شێوەیەکی رێزمانی بە پرۆسیسی لەناوچوون‌دا تیّ‌دەپەرێت .

٦٥ – نیشانەکانی دۆخی بانگ‌کردن ، کە لەباری تاك‌دا بەکاردێن (–یّ ،–ۆ ،–ە) رۆلّێکی رێزمانی دیشیان هەیە کە دارشتی ناوی تایبەتی‌یە . (–یّ) بۆ دارشتنی ناوی تایبەتی رەسەنی میّ‌یە وە (–ۆ) بۆ دارشتنی ناوی رەسەنی نێرە . ناوی تایبەتی رەسەنی نێر . مستۆ (لەمستەفا) ، تەمۆ (لەتەمر) ، خدۆ(لەخودیّ)دا دارێژراوە .

ناوی تایبەتی رەسەنی میّ : بێزی (لەبێزار) ، فاتیّ (لەفاتمە) دارێژراوە .

نیشانەی دۆخی بانگ‌کردنی (–ە) لە دیالێکتی سۆرانی‌دا ناوی نێرومیّ دادەرێژیّ وەك :–

خلە (لەخدر) ، مستە (لەمستەفا) ، حەمە (لە حمیدو محەمەد)

فاتە (لەفاتیّ) ، خازە (لە خەزال) . . .هتد .

## دۆخی تیان (ناراستەوخۆ)

٦٦ – دۆخی تیان لەباری تاکدا وەنەبیّ تایبەت بیّ بەهەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردییەوە ، ئەم دۆخە لە دیالێکتی کرمانجی‌دا چەسپیوترەو زێترە ، تا لە کرمانجی خوارووا ، دۆخی تیان لە چەند بەشە دیالێکتێکی کرمانجی خوارووا بەرچاو دەکەویّ ، کەئەمانەن :–

(موکری ، بنگرد ، هەولێرو رەواندز) – ئەم نیشانانەی لەو بەشە دیالێکتانەدا بەکاردێن ، لە دیالێکتی کرمانجی ژووروش‌دا هەیە .

دۆخی تیان‌و دۆخی راستەوخۆ لە بەشە دیالێکتی سلیمانی‌دا وەکو یەك‌وان .

لە دیالێکتی ژووروودا دۆخی تیانی تاك کۆتایی بە نیشانەی دۆخی تیان دیّ ، کە ئەویش (–یّ)یە ،ئەمەش لە کاتێك‌دا کە ناوەکە رەسەنی میّ‌بوو . وە (–ی) دەبیّ ، کە ناوەکە رەسەنی نێر دەبیّ . لە دیالێکتی موکری وسۆرانی‌دا نیشانەکانی دۆخی تیان لەهەردوو رەسەن‌دا وەکو نیشانەکانی کرمانجی ژووروون .

دۆخی تیان لە باری کۆدا نیشانەکەی (ان) لە هێندێك بەشی دیالێکتی خوارووا وە (–ان) یا (–ا) یە لە کرمانجی ژووروودا .

٦٧ – ناو له دۆخی تیاندا رۆلی سینتاکسی دەگێرێو دەبێته نیهاد ، بەرکار ، دیارخەرو ئادڤێربل وە هێندێك دەوری دیش که له مەودوا روونی دەکەینەوە .

١ – ناو له دۆخی تیاندا رۆلی بەرکاری راستەوخۆ له رستەدا دەگێرێ (له دیالێکتی خوارووودا جیّ ناوی لکاو هێندێك جار به بەرکارەوە دەلکیّ) .

کرمانجی : راموسانەکێ دە منو دەولەمەندیبا من ژ خوەرابیه .

ئەزێ تیرکەڤانەکی باڤێژمە پەنیبا وی (ڤولکلۆری کرمانجی – ٥٩٢) برا شریتێ بدە من ، ئەز ژی ویّ تیرۆ هەرم دا رابینم (فولکلوری کرمانجی – ٥٨٠) .

موکری : ئەگەر گولیزارم نەداتی بەغدایی لیّدەکەم ویرانه (ئوسکارمان – ٢٦٩) زۆری برسیبوو ، تەمایبوو نانی بخوا (مان – ٢٨٢) .

سۆرانی زمانی قسەکردن :– گۆتیان مێوان ئەتو نەزانی ئەم شەراوەی بخۆی (مەکەنری ٢٠٢)

خەنجەری لیّدەیت خوێنی نایێت .

خوا تا چیا نەبینیّ بەفری تیّناکات .

سۆرانی (زمانی ویژەیی) نازەنین هەویر ئەشێلیّ (تووری عەلی – ١٨٥)

شوان مەر ئەلەوەرێنیّ

له سلێمانی گەنم به ربه ئەفرۆشن

٢ – ناو له دۆخی تیاندا دەوری بکەری رووداوی لۆگیکی دەگێرێ له رستەی تێپەڕنەکیدا له کرمانجی (بروانه – ٢٨٣) ، بەلاّم له سۆرانیدا لەم بارەدا نیهاد بیّلایەنه (بەواته لەگەلّ دۆخی ناوی رێك دەکەوێت) .

کرمانجی :

رۆڤیبەك دەفەك کر ستۆێی خوە (کامەران – ٤٥)

کەچکان ب ترکی نزان بوون (کامران)

جارەکیّ تجارەکی ژ دۆرا ئەرزۆمیّ – پەزی خوە ئانیبە سووێی

(روناهی – ژ ١٣ – ١٩٤٣)

خاتونیّ کنجیّ خوە خوەکر (فولکلوری کرمانجی – ٣٨٥)

سۆرانی :

بەم جۆرە ئەم داهێنەرە لەخەویا دەرزی مەکینەی بەرگدروونی دروستکرد (روناهی – ژ– ٢–١٩٦١)

دکتۆر حالەن ئوتومبیلی گرت (مەکەتری – ٥٠)
سلتان سەلیم لەجیێی خۆی هەڵستا ، لباسی دەرویێشی فریێدا (مەکەتری –١٨٠)
بنگرد : ئەرسەلانی دەنگی گەمیوانی دا (مەکەتری – ١٥٦)
پاترووسەی هۆدەی گوڵێوەشێن کرد (مەکەتری – ١٦٢)
٣ – ناو لە دۆخی تیاندا رۆڵی دیارخەر دەگێڕێ لە ڕستەدا :
کرمانجی : شەرێ سەرخوە بوونێ (کامەران – ١٩)
شاگرێن داستانیێ یەك ژ شهرێن وی دستران عەباس مەمەندسەرەکی مە شێرا ئاکۆ : یەك ژ مەزنین سەورێ (قەدری جان – ٢٩) ژکوردستانێ ژ ئەکرادان تایف ژی هەین (مەلابایەزیدی – ٧٤)
موکری : چاوت ئەستێرەی ڕۆژێ (مان – ٢٩٩)
دیوانی میری (مان – ١٧٠)
سۆرانی زمانی قسەکردن)
چەند وولاخ لە تەویلەی پاشای هەبوو (مەکەتری – ٢٠٦)
ئەزیزی مسرێ ڕۆژێك خەونی دی (مەکەتری – ١٩٠)
قەبری شێرزادی لە کوێیە (مەکەتری – ٢٢٢)
سورانی (زمانی وێژەیی)
بەهاری کوردستان
لەسەر جادەو کۆڵانەکانی شار هەزاران بەتەنیشتما ڕائەبوورن (روناهی – ژ – ٧–١٩٦١)
٤ – ناو لە دۆخی تیاندا رۆڵی بەرکارو ئادڤێربلی ناراستەوخۆ دەگێڕێ ، هێندێك جار ئامرازی پێوەندیش یارمەتی ئەم دارشتنە دەدات (لە کرمانجی و زمانی قسەکردنی سۆرانی) بەلام لە زمانی وێژەیی سۆرانیدا بەرکاری ناراستەوخۆ بە یارمەتی ئامرازی پێوەندی دادەڕێژرێ .
کرمانجی : بەکۆ جاب گیهاندە میری (فولکلۆری کوردی – ٢٧٧)
پاشدا کورئوغلی گرت ، ئاڤێتە زیندانێ (فولکلوری کوردی – ٦١٢)
ژووروو
ئاڤایێ هەورەکی رەشی تاری بلند دبوو .
ئەو مرۆڤ هاڤێنێ دچوو ئیتالیێ .
ل مێرگێ سلۆیێ کۆلخۆز ڤان دخەبتن .
موکری : چوو سەربانی تەماشای‌کرد (مان – ٢٨٠)

خزێمی کەپۆم کری لە مەیدانی (مان - ٢٥٠)
دەست بە خەنجەری دەدات (مان - ٢٨٨)
سۆرانی (زمانی ویژەیی)
فەرهاد لە بەغدا دەخوێنێ (ڕێزمانی کوردی -٢٨)
قارەمان ئەچێ بۆ مەریوان (ڕێزمانی کوردی - ٣٣)
منالێ لە تاریکی ئەترسێ (ڕێزمانی کوردی - ٣٣)
ترێ بە هاوین پێ ئەگا (ڕێزمانی کوردی - ٣٩)

٦٨ - لەم باسەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ ڕوونبۆوە ، کەوا نیشانەی دۆخی تیان لە دیالێکتی کرمانجیو زمانی قسەکردنی سورانی وەکو یەکن (ی) بۆ ڕەسەنی نێر لەگەڵ ئەو ناوانەش دێت کە نیشانەی نەناسیاریان پێوەلکاوە وەك :
کابرایەك چووبۆ کن ئاسنگەرەکی (مەکەنزی - ١٧٤)
مەرڤە چوو جەم ئاسنگەرەکی (کرمانجی)
لە بێشەکی ڕاست هاتن (مەکەنزی - ١٧٤)
ل مێشەکی ڕاست هاتن (کرمانجی)
هەروەکو لە سەرەوە باسمان کرد (-ی) ، کە نیشانەی دۆخی تیانە لەگەڵ ئەو ناوانە دێ ، کە (-ێك) نیشانەی نەناسیارییان پێوە نەلکاوە بەتایبەتی لە بەشە دیالێکتی موکریو سۆرانیدا
لە قەراخ شاری خێوەتو چادریان هەڵدا (مەکەنزی - ١٦٢)
ناکەم خزمەتی وەزیری نانی دەستێنم بە شیری (مان - ٢٩٤)
دەبێ ئەمن ئەمیر شەنگی ببینم (مەکەنزی - ١٦٢)
٦٩ - بەم جۆرە دۆخی تیان لە دیالێکتی کرمانجیو بەشە دیالێکتی موکریو زمانی قسەکردنی سۆرانی شێوەی یەکبوویان هەیە ، کە لە ڕستەدا چەند ڕۆلی سینتاکسی دەگێڕن . لە سۆرانیدا ئەم جۆرە ئەرکانە ناوی بێلایەن دەیگێڕێ ، دۆخی تیانی دیالێکتی ژووروو و شێوەی بێلایەنی سۆرانی لەرووی ئەرکدا یەکن ، بوونی هۆی سینتاکسیو مۆرفولۆژی بەڵگەی ئەم ئەرکەن .
٧٠ - نیشانەکانی دۆخی تیان (-ی ،ێ) لەهەردوو دیالێکتەکەدا هەمان ڕۆلی ڕێزمانی دەگێڕن . بەلام هێندێك جار لەبەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارووداا ئەم دوو نیشانەیە کەتیکۆری ڕەسەنی (نێرومێ) تێکەلدەکەن ، ئەمەش بە تایبەتی لە نیشانەی (-ێ) مێدا بەرچاو دەکەوێ ، بەلگەشمان بۆ ئەمە ئەو تێکسانەن ، کە د .ن . مەکەتری کۆیانی کردۆتەوە ،

ەم شوێنانەی ، کە چاوەڕێ دەکرا نیشانەکەی (-یٚ) بێ نیشانەی (-ی) داندراوە . وەیا بێ نیشانەیە بۆ وێنە :

ئەگەر ئەتو کچی خۆی شمولوزاریٚ لە بۆ پاشای شاری یەمەن ئەنێری . . .

ئەمە ئەتوی تاران دەکەین (مەکەنزی -٢٠٤)

پاشای میسر (مەکەنزی) - ١١٤ - بەراوردبکە ، لەگەڵ عەزیزی مسریٚ (مەکەنزی - ١٤٤)

ئەو شەو مێوانداریکرد هەتا سەعاتی سیٚ شەوی ( مەکەنزی- ٢٠٤)

والی ئەویٚ شەویٚ دلی تۆقی (مەکەنزی -١٨٠)

قەمەری وزیر ئەو ڕۆژیٚ سواربوو چوو (مەکەنزی - ١٦٦)

لە بەشە دیالێکتی سۆرانیدا بە تایبەتی لە زمانی قسەکردندا کاتیٚ ناوی میٚ کۆتایی بە نیشانەی نەناسیاری (-ێك) دیٚوە لە دۆخی ناراستەوخۆدا دەبیٚ ناوەکە لە بریتی نیشانەی دۆخی میٚ (-یٚ) پێوە بلکیٚ نیشانەی (-یٚ) پێوە دەلکیٚ کە دەکەوێتە دوای نیشانەی نەناسیارییەوە ، وە نیشانەی نەناسیاریش لە شێوەی (-ێك)دا دەبیٚ نەك (-یەك) بۆ وێنە .

شەوێکی سولتان مەحمود هەیاسی خاس . . . تووشی ئەو کورەی بوون (مەکەنزی - ١٧٤)

ڕۆژێکی بە وەزیری خۆمی گوت : با برۆین بۆ بەغدایٚ (مەکەنزی - ١٧٤)

ئەمن لە دوو نەچیرێکی ئەگەرم (مەکەنزی - ٢١٢)

جاریٚ سەیەمیٚ چوومە بن چادرێکی تەماشم کرد گورجییەك لەناو بوو ، لەبن چادریٚ (مەکەتری -٢١٢)

وەنەبیٚ ئەو تێکەڵبوونی نیشانەی نێرومیٚیە لە دۆخی تیاندا هەر لە بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارووودا هەبن ، بەڵکو لە دیالێکتی کرمانجی ژووروشدا بەرچاودەکەویٚ بۆ وینە :

ئەزی سەد زێری بدەمە تە گۆت ، توفی کاغەزی بگەهینی ئێلا میریٚ عەرەبا (فۆلکلۆری کرمانجی - ١١١)

لەزەکی سەکنی دیا ویا پەی چوو باخچە ،(حکایەتی کوردی - ١٠٣)

تێکەڵ بوونی ئەم دوو نیشانەیە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا لەناو تێکستەکانی فولکلوری حاجی خیدریدا بەرچاودەکەویٚ لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا نیشانەکانی دۆخی تیان بەدەگمەن بەرچاودەکەویٚ ئەویش لە هێندێك ووشەدا هەن ، بۆ وێنە بەیانی تا ئێواریٚ ئینتزاری کرد . (مەکەتری -٤٨)

گەڕانەوە بۆ ماڵیٚ (مەکەنزی -٨)

کوڕ چوەسەرەوە ئیسراحەتی کرد ، شەویٚ وەختی نوستن تەماشای کرد خۆی‌و ئەم کچە لەیەك جێگە ئەنوو (مەکەنزی -١٤)

لەم وێنانەی سەرەوەدا ووشەی (ئێواریٚ ، شەویٚ ، ماڵیٚ) کۆتاییان بە نیشانەی دۆخی ناڕاستەوخۆ (-یٚ) هاتووە ، کە بۆ ڕەسەنی میٚ لە بەشە دیالێکتەکانی دی کرمانجی خواروو وە هەموو دیالێکتەکانی کرمانجی ژووروو بەدی‌دەکریٚ .

ئەم ووشانە هێندێك جار بیٚ‌نیشانەی دۆخی ناڕاستەوخۆش بەکاردێن .

٧١ - ´لە زمانی کوردی‌دا لە دۆخی تیان‌دا پاشبەندی ئامرازی پێوەندی (-ڕا - ڤە ، ەوە ، دا)ش بەکاردێن .

لەو خشتانەی کە ف . یوستی ، ی -سۆن وە هی‌دی پێشانیان داوین ، پاشبەندی (-ڕا) و (-دا)ی تێدایە .

ئەو ناوانەی کۆتاییان بە (-ڕا) دیٚ دۆخی مەبەست دادەڕێژن و ئەوانەی بە پاشبەندی (-دا) دۆخی شوێن پێك‌دەهێنن لەگەڵ ئەوەش‌دا واتای دی ڕێزمانیش دەبەخشن . لێکۆڵینەوەی داهاتوو ئەوەمان بۆڕوون‌دەکاتەوە کەوا ئەم پاشبەندی ئامرازە پێوەندیان لە رووی واتاو رۆلی سینتاکسی‌یان بە شێوەیەکی فراوانتر بەکاردێن .

پاشبەندی ئامرازی پێوەندی (-ڕا) ، (-ڤە) // (ەوە) ، (-دا) لە هەموو بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردی‌دا هەیە . لە زمانی ئەدەبی سۆرانی‌دا ئەم پاشبەندانە بەناوی ڕاستەوخۆوە دەلکێن ، وەنەبیٚ هەر شێوەیەکی بگۆڕیٚ ، بەڵکو ڕۆلی سینتاکسی دەگێڕیٚ . لەهەموو بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردی‌دا ئەم پاشبەندانە بە بەرکاری تیانەوە دەلکێن‌و هێندێك جاریش بە بەرکاری ڕاستەوخۆوەش هەروەکو لە زمانی فارسی‌دا بەدی‌دەکریٚ . گەر پاشبەندی ئامرازی پێوەندی لەگەڵ ووشەی لێکدراو وەیا کۆمەڵێك ووشەوە هات هەمیشە بەدوا ووشەوە دەلکێن‌و بۆ هەموو ووشەکانیش دەگەڕێتەوە .

٧٢ - دۆخی سەرەتای ڕێچکە وەیا هەڤرایی بە یارمەتی پاشبەندی(ڕا) دادەڕێژرێت پاشبەندی (-ڕا) بۆ ووشەی (راوی) فارسی کۆن دەگەڕێتەوە کە واتای « لە پێناو ، بۆ» دەگەیەنێت .

لە هێندێك بەشە دیالێکتی زمانی کوردی‌دا ئەم « پاشبەندی (-ڕا)» واتای خۆی پاراستووە . وەك بەشە دیالێکتی زمانی کوردی ئەرمەنستان هەروا لە بەشە دیالێکتی زمانی کوردی کرمانشان‌و هەولێرو ڕەواندزو موکریان‌دا بەکادرێت .

پاشبەندی (-را) ئەم واتایانەی خوارەوە دەبەخشێ :

١ - لەگەڵ ئامرازی (ب) لە کرمانجی‌دا دێت‌و واتای ڕوودانی تێکرایی دەگەیەنێت لە دیالێکتی سۆرانی‌دا بەرامبەر بە (-را) لەم واتایەیدا پاشبەندی (-ەوە) بەکاردێت ، لەم بارەدا ئامرازەکە (بە ، لەگەڵ ، لەتێك) دەبێ .

ئەزێ ب زمانێ وی ب ویرا خەبەردم ، دگەڵ وی بژیم ئەو ب دنیا خوەرا لەمال دمینە (کرمانجی)

ئەو لەگەڵ دایکی خۆی لە ماڵێ‌دا ئەمێنێ .

٢ - پاشبەندی (-را) لەگەڵ ئامرازی پێوەندی (ژ ،ب) لە کرمانجی‌دا ڕێچکەی ڕوودان پێشان‌دەدا . هەروا کەس‌و شتی پێوەند بە ڕووداوەوە دەست‌نیشان دەکاو لە سۆرانی‌دا لەگەڵ ئامرازی پێوەندی (بە ،بۆ) ئەم واتایە دەبەخشێت .

برا خوشکی را گوت (کرمانجی)

برا بەخوشکی ووت (سۆرانی)

مامۆستا ژ شاگرترا کتێب ئانی

مامۆستا کتێبی هێنا بۆ قوتابی‌یان (سۆرانی)

ژ برێ خوەرا کاغەز نفیسی .

٣ - ئامرازی پێوەندی (ب ،د ،ناڤ ،سەر ، بەر ، ڕەخ ، بن) ، کە لەگەڵ پاشبەندی (-را) دێ تأکیدی ڕێچکەی ڕوودان دەکات لە سۆرانی‌دا ئامرازی پێوەندی (بە) لەگەڵ پاشبەندەکەی (دا) دا هەمان واتا دەبەخشێت .

ئەو دمێشە را هات

ئەو بە بێشەرا هات

ئەز ناڤ کەفرو زنادارا چوو)

هێستر سەرسوور ، ترادهاتنە خارێ .

کولفە تا میر پەنجەریزا بەر ژێر نهێری زەمبیل فرۆیش دێت .

٤ - لە دیالێکتی سۆرانی‌دا ئەم پاشبەندە لەگەڵ ئامرازی پێوەندی سەرەتای دەست‌پێ‌کردنی کاری ڕوودانەکە دەبەخشێت وەك :

ئەرسەلان لە ڕێی خۆی‌ڕا گەڕایەوە (مەکەنزی -١٥٤)

لە کوێرا هاتی ؟ لەڕانیەرا هاتم

پشیلە سورە کوێرا چوو ؟ ئەرزی دری پێیاچوو .

## – دۆخی ڕێك‌كەوتوو –

٧٣ – ئامرازی پێوەندی بە (با ، بۆ ،وە) لەگەل پاشبەندی – ڤە (ەوە)– سۆرانی ، ئەم واتا سەرەکی‌یانە دەبەخشێت کە دۆخی ڕێك‌كەوتوو دادەرێژێ :

١ – ڕێك‌كەوتن‌و تەبایی لە ڕوودانی ڕووداودا :

کرمانجی :–

خان بە کورێ خوەڤە کەتن ناڤ شەر .

ئەوان خوە خەش‌بوون بەوە دەکڤە بوونە هەفتا .

سۆرانی :–

عەلی بەگی میری داسنی بە لەشکری داسنی‌یەوە چووە پێش (مێژووی میرانی سۆرانی –٦٦)

لە ترسی بەگ بەتۆپ‌و تۆپخانەو لەشکرەوە پەلاماری‌دان

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا پاشکۆی ئامرازی پێوەندی (ڤە) هێندێ جار شێوەی (با)ی دەبێ :

قەرە تاژدین ب هەر سی‌بْرا رابوون ، چوون قەسرا خوە (فولکلۆری کرمانجی –٢٨٥)

٢ – لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا واتای هۆو ئامرازی رووداندەبەخشێ .

دوای ئێوە ، منیش بەهێزەکەی خۆمەوە هەڵکەوتمە سەر رەواندز

ئێمە داوای مافمان ئەکەین بە هەموو توانایەکانەوە .

٣ – پێشان‌دانی ڕێچکەی ڕوودانی ڕووداوەکە لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا بەشێوەیەکی ئاشکرا دیارە :

هەموو شاری مۆسکۆ خرۆشاوە بەسەد هەزاران چوون بەپیر گاگارینی قارەمانەوە (روناهی – ٢ ، ١٩٦١)

ئیشی چی‌یە کە هاتنە قەڵای منەوە (مەکەنزی – ١٤)

گەلەك جار گیراوەو خراوەتەوە بەندیخانەوە (روناهی –٢–١٩٦١)

٤ – ناو لەگەڵ ئەم ئامرازانەدا و بەتایبەتی لەگەڵ ئامرازی (لە) دا لە بەشە دیالێکتی سۆرانیدا واتای سەرەتای دەست‌پێکردنی رووداندەگەیەنێت :

لە ئەستەمبولێوە سولتان سەلیم بەمادایەکی هاتە بەغدایێ (مەکەتری –١٧٨)

٧٤ – ئەم دۆخە بە یارمەتی پاشبەندی دۆخی شوێن ئامرازی پێوەندی (–دا) دادەڕێژرێ ف . یوستی لەوباوەڕەدایە ، کە ئەم پاشبەندە هی زمانی تورکی‌یەو دۆخی شوێن دادەڕێژێ .

لەوانەیە ئەم پاشبەندە لە رووی ئەسل و بنچینەیەوە بۆ ووشەی (دان) بگەڕێتەوە ، کە ووشەیەکی کۆنی فارسی‌یە لەو تێکستانەی ، کە ا . ژابا بلاّوی‌کردونەتەوە شێوەی ئەم ووشەیە بەم جۆرەیە (دانیّ) :

ئەمیر و دلیّ خوە دانیّ دبیّژتن (حاجی جندی –٩٧)

دوی زمانی دانی ئەسلی تەیفەیّد ئەفرەنجان ل‌وان وەلاتاندانیّ پەیدا نەدبوون ( حاجی جندی– ١١٢)

لە بەشە دیالێکتی زمانی کوردی ئەم پاشبەندە لە شێوەی (دە) دا دەبیّ . لە سلێمانی‌دا کورتکراوەتەوە بۆ (–ا) ، (–یا) ئەم دۆخە سیّ واتای سەرەکی دەگەیەنێت :

١ – شوێن و کاتی رووداو پێشاندەدا . وەیا شوێنی شت دەست‌نیشان دەکات ، بۆ دەربڕینی ئەم واتایەی ئامرازی پێوەندی (د ،ل) // (دە ،لە . سۆرانی) بەکاردێت :

سۆرانی :–

ئەمما زۆر برینم دە قالبی‌دا هەیە (مەکەنزی –٢٢٠)

سیّ کوورە ئالتون لە فلان شوین‌دا لە باخەکەی‌دا هەیە (مەکەنزی – ١٣٦)

لە زەمانی وی‌دا کەس نەیدەتوانی غەدریّ لە کەس بکا (مەکەنزی – ١٧٨)

ئەمن‌و با ئۆمەر لە پایزێدا چووین بۆ سەفەریّ (مەکەنزی –١٧٢)

لە زەمانی عوسمانیەکان گەلەك جار گیراوەو کراوە بە بەندیخانەوە (ڕۆژی نویّ –ژ–٢–١٩٦١)

کرمانجی :–

سلێمان دماو وەلاتیّ عەرەبستانیّ‌دا (فولکلۆری کرمانجی – ٢٤٩)

دشەڤێن زڤستانێدا زارۆك دورا ئاگردا رۆنشتن (کامەران –٢١٤)

مەمیّ ناڤ واندا زینیّ دیت (فولکلوری کرمانجی –٢٧٤)

٢ – پاشبەندی (–دا) بەهاوکاری ئامرازی پێوەندی (بە) لە سۆرانی‌دا و (د) لە کرمانجی‌دا ڕێچکەی ڕووداو بەهوی شتەوە پێشان دەدا وەیان واتای وەسەرخستنی دەگەیەنێت :

سۆرانی : ئەگەر دزو خۆمال بینە یەك ، گای بەرۆشەندا هەل‌دەبەن (پەند) دەستە مەرۆیەکی چەکداریشیان وە پێش خۆیان خست بە دەشتی :

**سندوسی‌دا هاتنەخوار (چیرۆکی کەڵەباب –١١)**

**کرمانجی :– مەها گولانیّ‌دا ئەم د مێرگ‌و چیان‌دا دگەرین (ئەلفو بیّ‌ی کوردی –٣٣)**

**تو من ریا جزیری‌دا بکی‌خارە (فولکلۆری کرمانجی –٢٦٧)**

هێستریٚ زینیٚ مینا دلۆپیٚ بارانیٚ گوور سەر سوورتیٚ دهاتنە خاریٚ (فولکلۆری کرمانجی -٢٩٠)

لە دیالێکتی کرمانجیدا سیٚ لەم پاشکۆیە ، پاشکۆی (-را) هەمان واتا دەبەخشیٚ .

٣ - لە بەشە دیالێکتی زمانی کوردی تورکمەنستان بادینان‌دا ئەم دۆخە ڕێچکەی رووداو بۆ ناوەوە دەگەیەنێت :

بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان :

دێو خوە ئاڤێتێدا (فولکلوری کرمانجی - ٥٨٩)

خوە ڤەیێدا ئاڤێت (فولکلۆری کرمانجی -٦١٥)

وەردەك خانم چڤاسی دگهیژە مالد (فولکلوری کرمانجی -١٦٢)

ئەم دچن سەرخالیٚ خوەدا (فولکلوری کرمانجی -٨٨)

لە بەشە دیالێکتی بادینان‌دا :-

حالەن زابتەکە چوو دکانی‌دا (مەکەنزی - ٣٠٤)

هاتەڤ مەزەلکە کورەکەی‌دا (مەکەنزی -٣٠٠)

پاشبەندی -را ، - ڤا (-ەوە)و (-دا) لە رووی واتاوە دەتوانن لە شوێنی یەکتردا بندرێن‌و ئالوگۆڕ بکرێن وەك ئەم وێنەی دیالێکتی کرمانجی‌دا :

مەریٚ برا گۆتە کولیلکدا (فۆلکلوری کرمانجی -١٣٦)

کولێك گۆتە کەریٚ برارا (فولکلوری کرمانجی - ١٠٣)

بەرامبەر بە پاشکۆی (-ەوە) ی سۆرانی لە کرمانجی‌دا (-ڤ-دا) بەکاردێن .

٧٥ - شێوەی دۆخی -را ، ڤا (-ەوە) ودا لە هەردوو دیالێکتەکەدا هەر یەکەو چەند شێوەیەکی هەیە ، بۆ وێنە لە کرمانجی‌دا شێوەی -را ، - ڤا ، -دا لەرووی واتاوە ئالٚو گۆڕ دەکرێن :

کەریٚ برا گۆتە کولك‌دا ، فۆلکلوری کوردی ، ١٣٦)

لەگەلٚ ئەم رستەی خوارەوەی بەراورد بکە

کولك گۆتە کەریٚ برارا ، فولکلوری کوردی - ١٠٣

لەم رستەیەی خوارەوەدا پاشبەندی -ڤا دەتواندریٚ بە -دا بگۆردریٚ ئەو رێڤا راستی خەزالەکیٚ هات ، فولکلوری کوردی ، ٢٠٧

پاشبەندی (-دا) لە سۆرانی‌دا بەرامبەر بە - را ، ڤا ،دا ی کرمانجی‌یە .

**پاشبەندی (-ەوە)ی دیالێکتی خواروو لەرووی واتاوە بەرامبەر بە - ڤا ،-دا ی کرمانجی یە .**

**پاشبەندی هەردوو دیالێکتەکە چۆن واتاو ئەرکی گشتی پێشان دەدەن هەروا تایبەتێتی دیالێکتیشی یان هەیە .**

## ئامرازەکانی خستنەسەر

خستنەسەر هۆی لێکدانی ناوی دیارخراو و دیارخەرە لە زمانە ئێرانیەکاندا خستنەسەر لە زمانی کوردی و زمانەکانی دی ئێرانی دا پێوەندی دیارخەری و وەسفی جۆارو جۆر پێشان دەدا .

زمانی کوردی خاوەن کۆمەڵێك ئامرازی خستنەسەرە کە بۆ پێشاندانی کەتیگۆری رەسەن و ژمارەو ناسیاری بەکاردێت .

دیالێکتی کرمانجی لە ئامرازەکانی خستنەسەردا دەوڵەمەندە ، کە ئەم شێوانەیان هەیە :
(-ا ،یێ ،-ە ،-ی-ێد ، -ێت ، ێن)

و لە دیالێکتی خوارووا (-یێ ، -ی ،-ە)یە .

ف . یوستی ، ا .سۆ ، س . ئیگزارۆف وا بۆ ئامرازی (-ا ،-یێ ،-ی) چوون ، کە فۆنیمی جیاواز جیاوازی ئامرازی خستنەسەری (-ی) زمانی فارسی یە و ئامرازی-ێد (-ێت) یان گەڕاندۆتەوە سەر زمانی خالدی .

ر . ماردن یەکەمین زمانەوان بوو ، کە شێوەکانی ئامرازی خستنەسەری دەست نیشان کردو نوسیویەتی و دەڵێ : (-ێد ) ئامرازی خستنە سەری کۆیە ، (-ا) ئامرازی خستنەسەری تاکی مێیەو (-یێ) ئامرازی خستنەسەری تاکی نێرە .

لە ساڵی (١٩٣٣)دا باسی سێ ئامرازی دیش کرا ، کە لە بەشە دیالێکتی زمانی کوردی تورکمەنستانێدا بەکاردێت .

(-یێ) بۆ ناوی نەناسیاری تاکی مێ ، (-ی) بۆ ناوی نەناسیاری تاکی نێرە (-ە) بۆ ناوی ناسیاری کۆیە لە کۆمەڵێك ووشەی لێکدراوی دیارخەریدا .

دوای ئەم ئامرازانە رۆڵی ئامرازی خستنەسەر (-ێن) روون کرایەوە کە بۆ ناوی کۆ لە بەشە دیالێکتی زمانی کوردی سوریە بەکاردێت .

بەم جۆرە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا لە دیالێکتی ژووروودا ئەم ئامرازانە هەن :-
(-ا ،-یێ ،ە ،ی .-ێد(-ێت) ،-ێن) .

ئەم ئامرازانە بۆ جێ‌ناوی هەبێ دەگەڕێنەوە ، بۆ وێنە ئامرازی (–آ ،–ێ)و شێوەکانی دی (–ە ،–ی) بۆ جێ‌ناوی هەبێ یا ، آ ، بێ و ئامرازی (نێر(ێت) ،–ێن) بۆ جێ‌ناوی یێد (ێیت) ، (ێین) بەرامبەر بە پاشکۆی (–ەوە)ی سورانی بەکاردێن .

– ئامرازی خستنەسەری تاك –

٧٧ – ئامرازی خستنەسەری تاك دووبەشە ، یەکەمیان بریتیە لە (–آ ،–ێ) وە هی دووەمیان (–ە ،–ێ)

٧٨ – ئامرازی خستنەسەری بەشی یەکەم (–آ ،–ێ) پێوەندن بە (جێ‌ناوی‌هەبێ)ەوە یەکسەر .

١ – ئامرازی خستنەسەری بەشی یەکەم تایبەتە بە دیالێکتی ژووروو ئامرازی خستنەسەری (–آ) لەگەڵ ناوی رەسەنی مێ بەکاردێت تاکدا ، بە مەرجێك ناوەکە هیچ نیشانەیەکی ڕێزمانی پێوە نەلکابێت بۆ وێنە :

**خەبەرا هاتنا من زوو لناڤ گوند بەلاڤ بوو (عەرەبێ شەمۆ – )**

**یارا من خاتوون زینە ڤیزا میرزێڤدینێ ، خوشکا میر سێڤدینە (فولکلۆری کرمانجی –٢٨٥)**

ئامرازی خستنەسەری (–ێ) لەگەڵ تاکی رەسەنی نێر بەکاردێت .

بە مەرجێك ناوەکە هیچ نیشانەیەکی ڕێزمانی پێوە نەلکابێت بۆ وێنە :

**دەستێ خوە ئاڤێتە دەستێ تجارێ مەزن ( مەکەنزی –٤٣)**

**ئەز کورێ شاهێ مەغربێ یاتم (مەکەنزی – ٨٧)**

دەردێ دلێ من نە تو دەردە (فۆلکلوری کرمانجی – ٤١٢)

٢ – لە زمانی وێژەیی بەشە دیالێکتی کوردی سوریەدا کاتێ ووشەی لێکدراوی دیارخەری بریتی دەبێ بەناوی دیارخراوەوە دەلکێن ، و لەگەڵ دیارخەر بەجودا دەنووسرێ ، بەواتا پێوە نانوسێ ، بۆ وێنە :

**دیا من ئا بەلەنگاز (جگەر خوێن – ١٦٤)**

**ئەڤە کانی‌یا هەیاتێ ئا ئەبەرین**

**شاهیا دلێ من ئا یا شین پەری‌خان بوو (خوەندنا کوردی – ١٣)**

**کورێ پاشێ بێ بچووك هات (عەرەبێ شەمۆ – ٢٦)**

**میر سەرێ خوە بێ پور سپی راکر (خەندنا کوردی – ١٥)**

٧٩ – ئامرازی خستنەسەری بەشی دووەم لەگەڵ ئامرازەکانی خستنەسەری بەشی یەکەمدا یەکن ، بەڵام لەڕووی فۆنۆلۆژی‌یەوە جیاوازن بۆیە بە شێوەیەکی دی بەشی یەکەم دەژمێردرێن ، کە (–ە) (–آ)یە ، (–یَ) یش شێوەیەکی (–ی)یە .

ئامرازەکانی بەشی دووەم لە دیالێکتی ژووروو و زمانی قسەکردنی هێندێك بەشە دیالێکتی خوارووش بەکاردێت .

١ – لە ووشەی لێکدراوی دیارخەریدا ئامرازەکانی بەشی دووەم لەگەڵ ناوی نەناسیار بەکاردێت .

ناوی ڕەسەنی نێر :

**ئاسنەکی زراف (عەرەبی شەمۆ –٩١)**

**بەگ کۆنەکی چووك دابوو بافێ من**

**محەمەد خورتەکی رند ژێ دەرکەت (عەرەبی شەمۆ –٨٨)**

**ناوی ڕەسەنی مێ :**

**چاڤەکی خێری مندا هاتی‌یە (فۆلکلۆری کوردی – ٣٥٦)**

**سەر جێی کەلەهەکە مەزن هەیە . (هاوار – ژمارە –١٠)**

٢ – لە تێکستی فۆلکلۆری دیالێکتی ژووروودا ، ئامرازەکانی خستنە سەری بەشی دووەم لە (ووشەی لێکدراوی فرە) زۆر بەکارهاتوون ، لە کاتێکدا کە ناوی دیارخراو نیشانەی نەناسیاری (–ەك)ی پێوەلکاوە بەڵام لە هەمان (ووشەی لێکدراوی فرەف) دا ئەو ناوە دیارخراوانەی ،کە نیشانەی نەناسیاری‌یان پێوە نەلکاوە . ئامرازەکانی خستنەسەری بەشی یەکەمیان وەرگرتووە .

**ناوی نەناسیاری ڕەسەنی نێر .**

**تجارەکی دی مەزن لە جزیرێ هەیە (مەکەنزی – ٢٤)**

**میراف . . . میرەکی خونخوری بێ‌ئینساف بوو (عەرەبی شەمۆ – ١٩)**

**ناوی ڕەسەنی نێر بێ‌نیشانەی نەناسیاری**

**نێرێ منی کەڤەر نەدچێریا**

**هەڤالێ منی ئەوەلی خوە ئاڤێتە ناڤ ئاڤێ (هاوار – ژ – ١٠)**

ناوی نەناسیاری ڕەسەنی مێ :

**سێڤەکە سۆرە خەلاتیمە . سەر کور خالێ خوە بەنگیمە (فولکلۆری کرمانجی – ٣٥٠)**

**دارەکە ڕەشە ژێ ئالاڤەکە کەسکە سۆرە گەشە (فولکلۆری کرمانجی – ٢٨٣)**

**شەڤەکە زڤستانی‌یە درێژبوو .**

ناوی رەسەنی مێ بێ نیشانەی نەناسیاری :

**کارا منه چاله بەلەك**

**ئیرۆ لە مێشەدا جڤاتا وانە خەمولەیە (عەرەبی شەمۆ - ۱۰۱)**

۳ - لەبەشە دیالێکتی کوردانی سوریە و ئەرمینی‌یە لە رستەی ناویدا کە گوزارەکەی برێتی دەبێ لە ئاوەڵناو . ئامرازی خستنە سەری بەشی دووەمی پێوە دەلکێ ، ئەمە لە کاتێکدا ، کە شتە باسکراوەکە ناسراوبێ‌و لە باسەکەدا هەبێ .

بێ لە ئامرازی خستنەسەری (-ە) تاکی مێ و (-ی) تاکی نێر ئامرازی خستنەسەری کۆش بەرچاودەکەوێ .

**گوندی خراپ بوو (ئەوەی لە پێشتر باسکراوەو ناسراوە)**

**گوند خراپ بوو (گوندەکە نەناسراوە)**

**ئەزە کۆرم (ئێستە ، لەم‌کاتەدا)**

**ئەز کۆم (هەمیشە)**

**کتێبە سەر تەختەیە (ئەوەی لە پێشتر ناوی هاتووە و باسکراوە)**

**کتێب سەر تەختەیە (نەناسراوە)**

**ئەزی شەش سالی‌بووم**

**ئەزە شەش سالی‌بووم**

**کتێبە سەر تەختەنە**

**کتێب سەر تەختەنە**

۸۰ - لە دیالێکتی خوارووودا سێ ئامرازی خستنەسەر (ێ ،-ی ،-ە) بەرچاو دەکەوێ ،کە لەرووی بەکارهێنانو واتایانەوە لەگەڵ ئامرازەکانی دیالێکتی ژووروودا جیاوازی‌یان هەیە .

۱ - ئامرازی خستنەسەری (-ی) لە سۆرانیدا رەسەن‌و ژمارە پێشان‌نادات . کاتێ کە ناوی دیارخراو کۆتایی بە دەنگێکی بزوێن دێت ئەم ئامرازە لە شێوەی (لێ -)دا دەبێ .

ئامرازی خستنەسەر لەگەڵ ناوی تاکدا بە کۆتایی ووشەکەوە دەلکێ بۆ وێنە :

**گەلی نەبەزی کوردستان (هیوا ، ژ -۳ ، ۱۹۵۸)**

**ئەم شۆرشە شۆرشێکی بورجوازی دیموکراتی‌یە (هیوا ، ژ ، ژ -۳ ، ۱۹۵۸)**

پۆستەی خوێندەواران .

ئامرازی خستنەسەر لەگەڵ ناوی کۆدا دەکەوێتە دوای نیشانەی کۆوە (-ان ، یەکان)

کۆمەڵەی قوتابیانی کورد لە ئەوروپا (هیوا -ژ-٣ ، ١٩٠٨)

سلاوی شێرانی مەیدان (هیوا ، ژ - ٣ ، ١٩٠٨)

٢ - لە بەشە دیالێکتی بنگرد ، پژدەر ، هەولێر ، رەواندزدا ئامرازی خستنەسەری (-یْ) بەو ناوانەوە دەلکێن ، کە مێن وە (-ی) لەگەل ئەو ناوانە بەکاردێن کە نێرن :

**لە بەشە دیالێکتی بنگرد و پژدەردا : خانمیْ کچیْ پەتروسی (مەکەنزی - ١٦٥)**

**ژاریْ ماریْ دەخۆمەوە (سەرچاوەی پێشوو - ١٦٨)**

**وەرە بۆ قەسریْ من (سەرچاوەی پێشوو - ١٤٢)**

**کوری خواجە کاووسی (مەکەنزی - ١٥٨)**

**پیاوێکی زۆر جوان (مەکەنزی - ١٦٤)**

**چوو بۆ مەملەکەتی میسریْ (مەکەنزی - ١٤٢)**

**لە بەشە دیالێکتی هەولێرر رەواندزیْدا :**

**بزانە ماریْ منیشت خەراکرد (مەکەنزی -٢٢٢)**

**دووشمنیْتۆو (مەکەنزی -٢١٨)**

**کوری وی**

**چوونە شاری بابی وی**

٣ - ئامرازی خستنەسەری (-ە) لەو کاتانەدا بەکاردێت ، کە ووشە لێکدراوەکە کۆتایی بە نیشانەی ەکە ، -ەکان هاتووە ، کە بە کۆتایی دوا ووشەوە دەلکی . . .[٣]

**منداڵە جوانە ژیرەکە**

**دەنگ‌و باسە گرنگەکانی ناوخۆ**

**لە ژمارەی پێشوودا دوورو درێژ باسی هاتنەوەی قارەمانە راستەقینەکانی گەلمان کردو هیوا - ژ - ٣ - ١٩٥٨)**

**ئامرازی خستَنەسەری کۆ**

٨١ - ئامرازەکانی خستنەسەر (ێد // -ێت ، ێن ، -ە ،-یْ) ئامرازی کۆن پێوەندی وەسفی‌و دیارخەری دەدا هەروا باری کۆی ناوی دیارخراویش بە دەردەخا :

١ - ئامرازی خستنەسەر (-ێد) لە زۆربەی ناوچەکانی کرمانجی ژووروو بەکاردێت وەك دیاربەکر ، ماردین ، هەکاری ، بانا ، تبلیس ، موش ، بایەزید ، بەری رۆژئاوای گۆمی

رەزاییەی ، هەروا لە ناوچەی ئەرمەنستانێدا (–ێد) شێوەیەکی دی فۆنەتیکی هەیە ، کە ئەویش (–ێت)ە ، کە لەناوچەی بادیناندا بەکاردێت . هەروا لە بنگرد و پژدەرو موکریشدا . بەلام لەناو ئەو شێوانەیدا تەنیا شێوەی (–ێد) لەنووسیندا زۆرە هەسپێد وان ، مەرڤێد ماقوول ، خولامێت من ، جرانێد وی ، ئالاێد سۆر مەلا لپێشیێبوو و ئەو هەردوو مەرڤێد جاهل‌ژی لەدوو وی مەلای بوون هەسپێد وان عەرەبینە .

٢ – ئامرازی (–ێد) لە دیالێکتی خوارووشدا بەرچاودەکەوێ ، بە تایبەتی لەناو ئەو تێکستانەی کە ئۆسکارمان و مەکەنزی کۆیان کردۆتەوە د.ن . مەکەنزی وەکو (–ی) ئامرازی‌خستنەسەر دە (دە) بە پیت دادەنێ بۆ ئێمە وا دەردەکەوێ ، کەوا (–ید) شێوەیەکی دی ئامرازی خستنەسەری کۆیە بۆ (ێد) . بەراوردی ئەم وێنانەی خوارەوە بکەن کە لەنێوان بەشە دیالێکتی موکری‌و کرمانجی ژووروودا کراوە[٤] . . .

| موکری | کرمانجی |
|---|---|
| فەرەپۆشی دە شین (مان –٢٨٥) | فەرەپۆشێد شین |
| فیلێو فەرەجێد شەیتان (مان –٢٢٥) | فیلێو فەرەجێد شەیتان |
| موختاری دە دیوانێ (// – ٢٦١) | موختارێد دیوانێ |
| چاوی دە من ( // – ٣٠٠) | چاوێد من |
| دەنکی دە هەنارێ ( // – ٦٢) | دەنکێد هەنارێ |

| بەشە دیالێکتی بنگردو پژدەر | کرمانجی |
|---|---|
| داکو بابی دە تۆ (مەکنزی –٦٢) | دایکو باڤێد تە |
| ئای وەزیری دە من (// – ٢٤٢) | ئای وەزیرێد من |
| پیاوی دە پاشا (// – ٦٢) | مەرڤێد پاشا |

بێ‌لەمەش لە تێکستی فولکلۆری‌دا لە دیالێکتی ژووروودا ئامرازی خستنەسەر (–ێد) لە شێوەی (ید) دایە ، هەروەکو چۆن لە دیالێکتی خوارووداا بەرچاودەکەوێ . لێرەدا (دە) بەرامبەر بە (د) دەوەستێ :

دەرێ د خەزنا (عەرەبی شەمۆ -١٩٣)
دەڤۆکێ د هەسیان (فولکلۆری کوردی -٤٠٠)
کاکلێ د گووزا فۆلکلۆری کوردی -٣٠٢
گورێ د چیا ( فۆلکلۆری کوردی - ٤٠٣)
خەونێ د شەڤان ( فۆلکلۆری کوردی -- ٣٠٢)

٨٢ - لەمانەی سەرەوە ئەوانەمان بۆ روون دەبێتەوە :-

أ / شێوەی خستنەسەری (-ی - دە ، -یێ-د ، ێد) لە رووی نیشانەی ڕێزمانیەوە یەك کرۆکن .

ب - شێوەی (-ێد⟷ێد) و خستنەسەری (--ی -دە) هەر لە هێندێك بەشە دیالێکتی خواروودا ماوە وا دیارە لە رابردووە زیاترو بلاوتر بەکارهاتووەو ناوچەی سلێمانی گرتۆتەوە .

ج - شێوەی تازەی خستنەسەری ژمارەی کۆ (-ی) بە پاشماوەو کورتکراوەی (-ێد - ید)ە

٨٣ - لە بەشە دیالێکتی زمانی کوردانی ناوچەی سوریەو دیاربەکرا بەکاردێت و لەبەرهەمەکانی « ضیادد الدین خالدی» بەرچاو دەکەوێ - ئەرکی ڕێزمانی ئەم ئامرازەش هەروەکو ئامرازی (--ێد) . لە ووشەی لێکدراوی سادەدا بەناوی دیارخەرەوە دەژمێردرێ ، بۆ وێنە :

**چیایێن بلند بێبەرف نابن ، نەوالێن کوور بێئاڤ نابن (هاوار ، ژمارە -٤٥) ب چاڤێن پرچی من ل کارتۆلێن خوە ێن نیڤیژیابێ د نەریوزەیریێ وان یێن خارجێ پوسپورێن وان ێن ئەسکەری ب وانرا بوون (هاوار ، ژمارە - ٤٤)**

٨٤ - ئامرازی (-ێد ، ێن)ی خستنەسەر بەدیارخەرەوە نالکێ لەو ووشە لێکدراوە دیارخەریانەدا ، کە دیارخەر برێتی دەبێ لە ئاوەڵناوی چۆنیو سیو جێناو ، بۆ وێنە :

**(پەریخانێ تشتەك نەگوت ، ب چاڤێن خوە ێن دەلال مێزە وی کر .**

دچیرۆکێن خەلکێن بنەجیێن کەڤناردا دبێژن .

٨٥ - گەر ناوی دیارخراو برێتیبوو لەدوو ووشەی لێکدراو بەهۆی ئامرازی (و)ی پێوەستەوە ئەوسا ئامرازی (-ێد ،-ێت ،-ێن)ی خستنەسەر بە کۆتایی ووشەی دووەمەوە دەلکێ .

لەم دۆخەی سەرەوەدا لە سۆرانیدا ئامرازی (-ی) خستنەسەر بە نیشانەی (ان ، -ەکان)ی کۆوە دەلکێت ، کە ئەویش بە دووەمین ووشەوە لکاوە .

کەچ و خورتێد سەنگەرێ هین دبن (کرمانجی)
کچ و کورەکانی سەنگەر فێر ئەبن (سۆرانی)
دۆستێد دوژمنێن خوە ناس بکە (کرمانجی)
دۆستەو دوژمنانی خۆت بناسە (سۆرانی)

٨٦ – ئامرازی (–ە)ی خستنەسەر بە زۆری لە بەشە دیالێکتی ئەرمەنستان و سوریەدا بەرچاو دەکەوێ.

١ – لە ووشەی لێکدراوی دیارخەریدا ئامرازی (–ە)ی خستنەسەر لەو کاتەدا بەکاردێت.

کە ناوی دیارخراو نیشانەی کۆی (ن)ی پێوەلکاوە:

دژمنە خورتە و هژار ژوێرا پەیدا بوون.

٢ – ئامرازی (–ە) خستنەسەر بەدیارخەرەوە دەلکێت، کاتێ کە ئامرازی (–ێد)ی خستنەسەر (–ێ) کورتکراوەی (–ێد) بە ناوی دیارخەرەوە دەبن، وەیا لەو کاتەدا، کە نیشانەی نەناسیاری (–ین ،ن) لەگەڵ دێت:

لەچێد ئەلیکتریکێیە مەزن.
برێ وی تە دگۆت قەیتانەکە رەشە.
شڤانە رندە پەسپۆز
مێلە زەرە ئەلنالێ، چەملە سوورە گرە لێبوون.

ئامرازی (–ە) خستنەسەر لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی سوریەدا(بەرامبەر بە ئامرازی ،)، بروانە بەندی ژمارە ٨٣ ، ٨٤)

٨٧ – ئامرازی خستنەسەری (–ێ) لە رستەدا روون دەبێتەوە، کەتێکۆری ژمارەی کۆی لە کاردا بەدیار دەکەوێ.

برێ ئە رابوون. ئەوان ژێ کارێ خوە کرن، لە هەسپێ خوە سواربوون من چاڤێ وێ گرتن و دەستێ وی دان سەردلێ وێ.
جاجم رۆژێ ئۆسا گەلەك دیتبوون.

لەم بارانەی ژوورەوەدا ئامرازی خستنەسەری (–ێ) گەرچی شێوەی لە ئامرازی خستنەسەری (–ێ) رەسەنی نێری تاك دەچێ، بەڵام کورتکراوەی (–ێد)ە، کە ئامرازی خستنەسەری کۆیە. وەك چۆن لەم سەرچاوانەی خوارەوەدا بەرچاودەکەوێ:

چاڤێد من بوونه ناوی (فولکلوری کرمانجی -٢٨٦)
چاڤ من کورن (فۆلکلۆری کرمانجی - ٤٨٠)
زارۆێد مینا وه لڤرا زه‌ف هه‌نه .
ژن ، زاریێ گوند توپ‌بوو بوون (عه‌ره‌بی شه‌مۆ -٩٠)

٨٨ - یه‌ك بوونی نیشانه‌كانی خستنه‌سه‌ری تاك‌و كۆ له‌ناو به‌شه دیالێكته‌كانی خواروو له ئاخافتن‌دا ئاشكرایه . ته‌واوبوونی پرۆسیسی ئه‌م یه‌ك بوونه له به‌شه دیالێكتی ئه‌مرۆی سلێمانی‌و موكری‌دا هه‌یه .

بروانه (٨٩-٩٠) . لێره‌دا خستنه‌سه‌ر شێوه‌یه‌كی هاوبه‌شی له‌فزی ڕێزمانی‌یه ، كه واتای ڕه‌سه‌ن‌و ژماره‌ی تێدا نه‌ماوه‌و ئه‌ركه‌كه‌ی وه‌كو پێوه‌ندیی‌یه‌كی ئه‌تریبوتیڤی‌یه (وه‌سفی‌یه) .

### یه‌ك‌بوونی شێوه‌كانی ئامراز

٨٩ - كه‌ره‌سته‌ی ئه‌م لێكۆڵینه‌وه‌یه ئه‌وه‌مان بۆ ده‌ست‌ده‌خات ، كه‌وا په‌ره‌سه‌ندنی ئه‌م ئامرازانه له‌كۆنه‌وه تا ئێسته به‌هه‌مان قۆناخ تێپه‌ڕبون ، به‌ڵام هه‌ر دیالێكته‌و پله‌ی تایبه‌تی خۆی هه‌یه .

له دیالێكتی سلێمانی‌و موكری‌دا به هۆی تێكسته‌كانی نیوه‌ی یه‌كه‌می سه‌ده‌ی نۆزده‌مدا ئه‌وه‌مان بۆ روون ده‌بێته‌وه كه‌وا ، له‌م كاته‌دا زمانی كوردی له‌ژێر ته‌زووو كاریگه‌ری زمانی فارسی په‌ره‌ی‌سه‌ندووه . هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م كاریگه‌ری‌یه‌شه ئامرازه‌كانی خسته‌سه‌ری (-یێ ، -ی) به‌كارهاتنیان بۆ هه‌ردوو ڕه‌سه‌نی نێرو مێ بوو به (ی) ، كه نه ڕه‌سه‌ن‌و نه‌ژماره پێشان ناده‌ن ، به‌ڵام له به‌شه دیالێكته‌كانی بنگرد ، پژده‌ر و هه‌ولێرو ره‌واندزدا ، كه به‌شێكی زۆری سۆرانی‌یان داگرتووه دوو شێوه ئامراز به‌رچاو ده‌كه‌ن (-یێ)و (-ی) .

| سۆرانی | كرمانجی |
|---|---|
| ژنی‌ێ مه‌له‌ك شای (مه‌كه‌نزی -١٤٢) | ژنا مه‌له‌ك شا |
| ماڵێ خۆم (مه‌كه‌نزی - ١٨٠) | مالا خوه |
| قه‌سرێ خۆ (مه‌كه‌نزی - ٢١٨) | قه‌سرا خوه |
| داكێ خۆی (مه‌كه‌نزی - ٢١٦) | دایكا خوه |
| دیوه‌خانێ په‌تروسیای (مه‌كه‌نزی -١٦٦) | دیوه‌خانا په‌تروسێ |
| له پشتێ خوه كردووه (مه‌كه‌نزی - ٢٢٠) | ڕپشتاخوه‌كر |

| | |
|---|---|
| کچیێ مامیێ وی | کەچا مامیێ وی |
| ژاریێ مار (مەکەنزی - ١٦٨) | ژارا مار |
| حەیاتیێ خوّم (مەکەنزی -١٦٨) | حەیەتا خوە |

لەم وێنانەی سەرەوە ، کە ئامرازی (یێ) خستنەسەری تێدا بەکارهاتووە بۆ ناوی رەسەنی میێ لە دیالێکتی سۆرانیدا بەرامبەرەکەی لە دیالێکتی ژووروودا ئامرازی (ا)ی خستنەسەرە .

ئامرازی (یێ) خستنەسەر لە نووسیندا رۆلی ریزمانی خۆی لە دیالێکتی خوارووداپاراستوە .

لەگەلێ ناوی رەسەنی نێردا لە دیالێکتی ژوورووداد ئامرازی (-یێ) خستنەسەر بەکاردێت ، کە بەرامبەرەکەی لە دیالێکتی خوارووداد ئامرازی (-ی) خستنەسەرە .

| سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|
| شاری میسریێ (مەکەنزی - ١٤٦) | شەهریێ مسریێ |
| زەلامەکی زۆر جوان (مەکەنزی -٢١٠) | زەلامەکی گەلەك بەدەو |
| حەکیمیێ حەلەبیێ مەکەنزی -١٦٢) | حەکیمی وی |
| کوری وی (مەکەنزی -١٩٦) | کوریێ وی |
| لباسی دەروێشیێ (مەکەنزی -١٧٨) | لباسی دەروێشیێ |
| مەملەکەتی مەلیك شای ( مەکەنزی -١٧٨) | مەملەکەتیێ مەلیك شای |
| خەلیفەی ئیسلامیێ (مەکەنزی - ١٧٦) | خەلیفیێ ئیسلامی |
| شیری خوّم (مەکەنزی - ١٦٨) | شووریێ خوە |
| لە زەمانی ویدا (مەکەنزی -١٧٨) | لە زەمانیێ ویدا |

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا لە دیالێکتی سۆرانیدا (لە بەشە دیالێکتی سلێمانی و موکری نەبێ دوو جۆرە ئامرازی خستنەسەر هەیە ، کە ئەویش (-یێ)و (-ی) . کە هەردووکیان بەرامبەری ئامرازی (-ا) و (-یێ) خستنەسەری کرمانجی ژووروون و رەسەنیش پێشان دەدەن ، بەلاّم هێندێك جار ئەم دوو ئامرازە لە بریێتی یەکتر بەکاردێن ، بۆ وێنە ئەمانەی خوارەوە بەراوردبکە :

لەگەر مامی من (مەکەنزی -٢١٤)
کچیێ مامیێ وی (مەکەنزی - ٢٢٠)
دوژمنیێ من ( مەکەنزی - ٢١٨)

ووراخیٚ من ( مەکەنزی – ٢١٢)
ووراخی تور ( مەکەنزی – ٢١٢)
قەسریٚ من ( مەکەنزی – ١٦٨)
قەسری من (مەکەنزی – ١٦٦)

ئاڵوگۆری بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە دەبنە هۆی یەکبوونیان ، کە لە دیالێکتی سۆرانیدا بەرچاودەکەویٚ ، لە ئەنجامی پەرەسەندنی ئەم دیالێکتە ئامرازی (–ی) خستنەسەر وەکو تاکە ئامرازێکی نووسینی لیٚهاتوو . هەروا ئەم یەك بوونی ئامرازە وەکو دیاردەیەك لە ژووروووشدا بەر چاو دەکەویٚ بەدوو لاوە یەکێکیان لە لایەنی ژمارەو ئەوی دییان لە لایەنی ڕەسەنەوە . بۆ وێنە لە کورت‌کردنەوەی ئامرازی (–ێد)ی خستنەسەری کۆ بۆ (–یٚ) بەتەنیا لەژووروودا و (–یدە) بۆ (–ی) کورت بۆتەوە .

لێکوڵینەوەو بەراوورکردنی زۆربەی بەشە دیالێکتەکانی خواروو وژووروو ئەوە روون دەکاتەوە ، کەوا شێوەی رەسەنی نێر لە خستنەسەرو دۆخی تیان‌دا بەسەر ناوی رەسەنی میٚدا زالٚ دەبیٚو دەبێتە یەك شێوە . بەرهەمی وێژەیی دیالێکتی سۆرانی ئەم راستی‌یە دەسەلمێنیٚ ، بەلاٚم لە کرمانجی ژووروودا ئەم پرۆسیسی پەرەسەندنە درەنگتر دەستی پیٚ‌کردووە .

٩٠ – بەم ڕێگەیە پرۆسیس یەکگرتووی شێوەی خستنەسەر لە باری کۆدا پێك‌دێت ، ئێرەدا دوو ڕێچکە دەگەنە یەکتری‌و لێك‌دەدەن یەکێکیان کەتیگۆری ژمارەی تێدا نەماوەو لە ڕێچکەی دووەمیان‌دا هۆیەکانی جۆراوجۆری دەربڕینی کەتیگۆری رەسەن تێیدا زالٚبووە .
ئەم پرۆسیسە لە لەناوچوونی رەگەزێك لە نیشانەی خستنەسەری کۆی (–ێد) (–ی – دە –سۆرانی) بەرچاودەکەوێت .

لە دیالێکتی ژووروودا کورت‌کراوەی نیشانەی کۆ بڕێتی دەبیٚ لە (–یٚ) کە وەکو ئامرازی خستنەسەری تاکی نێرە . ئەمەش لەو شێوەی پرۆسیسەی دیالێکتی خواروو دەچێت ، کە لەگەلٚ نیشانەی خستنەسەردا روویداوە ، بەوەی (–ی) نیشانەی خستنەسەری کۆیە هەروا هی نێرو لە دوایی‌دا بووە بەبیٚلایەن .

پرۆسیسی یەك‌بوونی نیشانەکانی خستنەسەر لەباری کۆدا بەڕێگەی هاوبەشی تەلەفوزی ڕێزمانی ڕوو دەدات .

٩١ – لەمانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا لە زمانی کوردی‌دا پرۆسیسی نەمانی نیشانەی دۆخ‌و نیشانەی خستنەسەر هەیە . نەمانی ئەم نیشانە گرنگانەی ڕێزمانی دەبێتە

هۆی پەیدابوونی پرۆسیسی بێلایەنی ، جا لە دوای ئەوەدا هۆیەکانی دەربرینی پێوەندی دۆخی ، کەتیگۆری رەسەن‌و ژمارە بە یەکجاری نامێنن .

بەرامبەر ئەم بارە لەنێوان کوردناسانی سوڤیێت‌دا دوو بیروڕای دژ بە یەك هەیە دەربارەی نەمانی کە تیگۆری رەسەن لە زمانی کوردی‌دا بەپێی یەکێك لەوانە ، پرۆسیسی بێلاەیەنی رەسەن بۆ ناوی بێگیانان بێت دەستووری رەسەنی مێشی بۆ دابنێن (٥٣ ، ٤٧ ، ٥٥) هی دووەم ، پرۆسیسی بێلایەنی شێوەی خستنەسەرو دۆخی تیان دەستوری رەسەنی نێری بۆ دابنێن (٥١ ، ٣٦) .

لە ئەنجامی شی‌کردنەوەی کەرەستەی بەشە دیالێکتی جۆراوجۆری ژووروو و خواروو لایەنی بیروڕای دەستەی دووەم راستتر دەردەچێت ، کەرەستەی بەراوردکاری ئەوەمان پێشان‌دەدات ، کەوا نیشانەی رەسەنی نێر لە خستنەسەردا لە شێوەی دۆخی تیانیش‌دا بۆ رەسەنی مێش باوە ، بەم جۆرە یەکبوونی نیشانەی رێزمانی رەسەن‌و ژمارە دەستووری نیشانەی ناوی رەسەنی نێر وەردەگرێت ، ئەگەر لە زمانی وێژەیی سۆرانی‌دا ئەنجامی پرۆسیسی یەکبوون چەسپی بێت ، ئەوا لە کرمانجی‌دا پلەی ئەم پرۆسیسە زۆر زووتر بووەو هەر خۆیان نێزیك‌بوونەوەی ئەم نیشانانەو نەمان وەیا کەم‌کردنی شێوەکانی دۆخ دەشێوێنن‌و دەبوەستێنن .

بەم جۆرە کۆتایی کەسی (–ین ،–ن) کە بە کارەوە دەلکێن‌و جیٚناوی لکاوی (–ین ،–ن) بە پلەیەکی پەرەسەندنی رستە دەژمێردری ، کاتیٚ ، لەگەلٚ کاری تێپەرو رابردوودا دەبیٚ شێوەی (–ین ،–ن) رۆلی مۆرفۆلۆژی‌و سینتاکسی دەگێرن ، لە هەندێك باردا ژمارەو کەس لە رستەدا پیٚشان‌دەدا هەروا وەکو کۆتایی کەس کاریشی بەکاردیٚت لە هێندێك باری دی‌دا ئەو جیٚناوەیە ، کە رۆلی بەرکار دەگێریٚت .

## (جیٚناوی لکاوی گروپی دووەم)

١٥٩ – جیٚناوی لکاوی گروپی دووەم (–م ،ت ،ی) بۆ کەسی تاك‌و (–مان ؛ –تان ،یان) بۆ کەسی کۆ تەنیٚ لە دیالیٚکتی خوارووەدا هەیە . ئەم جیٚناوانە بە شێوەیەکی فراوان لە دیالیٚکتی نێوەراودا بەکاردیٚن .

جیٚناوی لکاو لەگەلٚ جۆراو جۆری بەشەکانی ئاخافتن‌دا یەك دەگریٚو بەکاردیٚت وەك (ناو ،جیٚناو ، کار ، ئامراز) ، کە رۆلی سوبێکت‌و ئوبێکتی راستەوخۆو تیان ودیارخەرو هی دی دەگێریٚ .

١٦٠ – ئەم تایبەتێتی‌یانەی جیٚناوی لکاو لەلایەن (مان ، ل . فاسووم)ەوە روون کراوەتەوە و لە لایەن ئەدمونس‌و مەکەتری‌یەوە لە رووی ئەرکی سینتاکسی‌و جۆری دارشتنی ئەم جیٚناوانە زێتر لیٚیان کۆلٚەراوەتەوە بناخەی‌و سەرچاوەی جیٚناوی لکاوی گروپی دووەم لە شیٚکردنەوەی ئەو ووشە لیٚکدراوانەیە ، کە جیٚناویان پیٚوە دەلٚکیٚت

١٦١ – جیٚناوی لکاوی کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سیٚیەمی تاك‌و کۆ رۆلی نیهاد رووداد دەگێریٚ لەم بارەدا بەکارەویا ووشەیەکی دی یان پیتەوە دەلٚکیٚن ،کە لە رووی ئەرکی ریٚزمانی‌و واتایانەوە زۆر بەکارەوە پیٚوەستن :–

کابراکان ووتیان چۆن شتی وا ئەبیٚ ؟ (ریٚزمانی کوردی –٩٥)
مەرڤان گۆت : چاوان تشتیٚ وا دبیٚ – کرمانجی) .
ئیٚمە هەر دەمەتەقەیەك بوو کردمان – رووناکی – ژمارە –١ ، ١٩٦١)
مە هەر دەمیٚ تەقینەك لە کر – کرمانجی) .
ئەگەر هیٚنات کچی لیٚ مارە ئەکەم (مەکەنزی –٥٦)
ئەگەر تە ئانی ئەزیٚ کەچیٚ لە تە مار بکم – کرمانجی) .
پیرەژن چووە ، بازار ، هەرچی‌یەکی لازم بوو کری بۆمالٚەوە (مەکەنزی –٢٤)
پیرەژن چوو بازاریٚ ، هەرچی لازم‌بوو ئەویٚ کری ئانی مالیٚ – کرمانجی)

ئێوه هەمووتان نازانن بۆچی نازانن ؟ (حکایەتی زادیچ -٨٩)
هوون هەموو نزانن بۆچ نزانن ؟ - کرمانجی)
خۆت ئەزانی تۆ خۆشەویستی منی (حکایەتی زادیچ - ٨٥)
تو خوه دزانی تو ئەزیزێ منی - کرمانجی) .

١٦١ - جیٚناوی لکاو لەگەڵ لێکدراودا دێتو بە ووشەی یەکەمی لێکدراوەکەوە دەلکیٚ ، کاتێکدا کە رۆلی بەرکاری راستەوخۆ دەگیریٚ .

بمنێژە لەژێر گڵدا دەگەڵ جمم (مەمو زین - ١٠)
من چاڵ بکە لەبن ئاخیٚ دەگەل مەم - کرمانجی)
ئەوانە نالّن مەیان خۆ - رێزمانی کوردی -١٩)
ئەڤان تالن وان مەموە - کرمانجی
بەزۆر راتکێشن بتهێنن بۆ ماڵی من ، مەکەنزی - ١٧٨)
بەزۆر تە راکشین ، تە بینن مالا من - کرمانجی)
بۆیە پێکەنین گرتی - روناکی - ژمارە -١١ ، ١٩٦١)
لامە پێکەنین هاتنە - کرمانجی)
ناوی ئورجوباد بوو یەخسیری کردم (حکایەتی زادیچ - ١٤٣)
ناڤێ وی ئورجوباد بوو ، ئەوی ئەز هێسر کرم .

١٦٢ - هەموو جیٚناوە لکاوەکانی گروپی دووەم رۆلی بەرکاری ناراستەوخۆ ، ئادڤێربلی دەگێرنو بە ئامراز وەیا ئەو ناوەوە دەلکێن ، کە لە دەوری بەرکاری راستەوخۆدان .

کور نزیکبووەوە لیێ (مەکەنزی -١٦)
کور نێزیکی وی بوو - کرمانجی)
پێم بڵیٚ راست حەزت لە کیٚ کردووە (مەکەنزی -١٨)
بێژە من ، تە حەز ژ کیٚ کرییە ؟ (کرمانجی)
زادیچ لە ئاخریدا پێی گوت (حکایەتی زادیچ - ١٨٢)
زادیچ ل ئاخریٚدا گۆتی - کرمانجی) .
هەتا بۆمان مومکین بیٚ بەدەست ئەیگرین - مەکەنزی -٦)
هەتا ب مەرا مومکین بیٚ ئەمی ب دەست ویٚ بگرین .

من بۆت بیهێنم (مەکەنزی –٦)
ئەزێ بۆتە ئەوێ بینم – کرمانجی)
شتێکمان بۆ ئێواری بۆ حازر بکە (مەکەنزی – ٢٧)
تشتەکی بۆ مە بۆنا ئیڤارێ حازربکە – کرمانجی)
من دڵم نایە نە بە شیر نە بە تیغ لەگەڵت بکەم (مەکەنزی –٢٢)
دلێ من نایێ ن بشوور نە بە تیغ بتەرا شەرکم (کرمانجی).

١٦٤ – جیٚناوی لکاو لە رۆلی دیارخەردا وەکو جیٚناوی خاوەنیەتی دەور دەگێڕیو بە ناوی ئاوەڵناو وەیا زنجیرەی ناوی ئاوەڵناوەوە دەلکێت.

دیوارەکە لەبەرچاوم کەوتە بزووتن (رۆژی نوێ – ژمارە – ٢ ، ١٩٦١)
دیوار لبەر چاڤێ من هەژیا – کرمانجی)
هەناریان برد بۆ باوکیان (مەکەنزی – ٤٨)
وان هەنار بر بۆ باڤێ وان – کرمانجی)
چەند رۆژێك لەمەوبەر ژمارەی نۆیان کووارە بەنرخەکەتانم وەرگرت (رۆژی نوێ ، ژمارە ، ١ ، ١٩٥٧)
چەند رۆژ بەرێ ژمارا نویا کوڤارا وە بهێژا من ستاند – کرمانجی)
پاشاو پاشگەراینەوە بۆ ماڵێ باوکی (مەکەنزی –٤٨)
پاشەپێش ڤەگەریا مالا باڤێ خوە – کرمانجی)
لەراستیدا گەلێ گیروگرفتو دژوار دێتە رێگەمان ( رۆژی نوێ – ژمارە –١ ، ١٩٥٧)
براستی گەلەك گیروگرفتو دژڤاری تێنە سەر رێیان – کرمانجی).

١٥٦ – جیٚناوی لکاوو جیٚناوی کەسی جودای تیان لە رووی ئەرکی رێزمانیدا وەکو یەکنو هەمان دەور دەگێڕن ، بەڵام جێگەی جیٚناوی کەسی جودای تیان چەسپیوە جێگەی جیٚناوی لکاو نەچەسپیوە بەڵکو بەجۆری رستەو وشێوەی گوزارەوە پێویستە.

١٦٦ – ئەم جیاوازیانەی لەسەرەوە باسکران لەم بارانەی خوارەوەدا دەبێ :-
١ – لەگەڵ رابوردووی سادە ، رابرووی دوورو نێزیك ناوی لکاو بەکۆتاییانەوە دەلکێت.
٢ – لەگەڵ کاری رابردووی نەسادە ، لەگەڵ ئەو کارانەی ، کە نیشانەی کاری (دە ، ب ، نە) یان لەگەڵ دێت ، هەر لەکاتی بوونی بەرکاری راستەوخۆ لەرستەدا ، جیٚناوی لکاو بە یەکەم بەشی کارەوە دەلکێت ، جا ئەم بەشە نیشانە وەیا بەرکاری راستەوخۆ بێت

بەلاّم لە دیالێکتی ژووروودا جیّناوی کەسی جودا شێوەی تیان هەمیشە دەکەوێتە پێش کارەکەوە .

| سۆرانی | کرمانجی |
| --- | --- |
| ١ – لەگەڵ کاری سادەدا : | |
| أ – کردم | من کر |
| کردبووت | تەکربوو |
| کردمان | مەکرییە |
| ب – لەگەڵ بوون نیشانەنی کاردا :– | |
| دەمکرد | من دکرد |
| دەتکرد | تە دکر |
| دەیکرد | ئەوی دکر |
| ج – لەگەڵ بوونی نیشانەی کاری ئینشایی :– | |
| بمکردایە | منکربا |
| بتکردایە | تەکربا |
| بیکردایە | ئەویکربا |
| ٢ – لەگەڵ کاری نادەسادەدا :– | |
| أ – لەگەڵ بوونی پێشگردا :– | |
| هەڵم بری | من هلبری |
| هەڵت بری | تە هلبری |
| بَ – لەگەڵ بوونی بەش ناوی گوزارەدا : | |
| قسەمکرد | من قسەکر |
| قسەتکرد | نە قسەکر |

٣ – لەگەڵ کاری رابردووی ئینشائیدا :–

| | |
|---|---|
| بتهێنین | تەبین |
| بیانکوژن | وانبکوژن |

٤ – لەگەڵ کاری دەمکاتی فەرماندا :–

| | |
|---|---|
| بینوسە | ویبنڤیسە |
| بمانگرە | مەبگرە |

٥ – لەگەڵ ناودا :–

| | |
|---|---|
| باوکم | باڤێ من |
| دایکی | دایکا وی |
| وڵاتمان | وەلاتێ مە |

٦ – لەگەڵ ئامرازدا :–

| | |
|---|---|
| بۆم | بۆمن |
| لێی | ژوی |
| بۆئەوان | بووان |

١٦٧ – هەروەکو لەمەوبەر بۆمان روونبۆوە . دوو جۆرە جێناوی لکاو هەیە ، کە لەگەڵ کاردا بەکاردێت ، لەبارێکدا جێناوە لکاوەکە بەکۆتایی کارەوە دەلکێ ، کردم ، کردت کردی هتد . . . لە بارەکەی دیدا جێناوە لکاوەکە بە پێشکارەکە دەکەوێ وە لەگەڵ نیشانەکانی رێزمانی بەکاردێت جا بە بەشی یەکەمی ووشەی لێکدراوەوە وەیا بەرکارەوە دەلکێت ، نەمکرد ، قسەمکرد ، نامەم نوسی هتد . . . .

لە زمانی ئاخاوتنی کرمانجی ژووروودا جۆری دووەمی جێناو بەکاردێت ، وەك من نەکر من قسەکر . من نامە نڤیسی . لەم رستانەی رابردوودا جێناوی لکاو کەوتۆتە پێش کاری ناکراوەوە ، و لەم رستانەی خوارووودا نیشانەی (نا) کردنو بەرکاری کەوتوونەتە پێش کارەکەوە :– وەك نە من کر ، قسە من کر ، نامە من نڤیسی .

١٦٨ – لە رووی ئەرکو واتای جێناوی لکاو و شێوەی جێناوی کەسی ئێمە وای بۆ دەچین ، کەوا جێناوی لکاوی تاك –م ،–ت ،–ی هەر لە جێناوی کەسییەوە هاتێ شێوەی (من کرد ، کردمن)ە کە بەرامبەری (من کر) لە کرمانجی ژووروودا ، جێناوەکان ، کە

شوێنیان گۆراوه هێزیشیان لەگەڵ دەگۆرێ ، ئەم جیٚناوانە لەگەڵ کاردا یا نیشانە وەیا هەر ووشەیەکی دیدا کۆ دەکرێن ، بەڵام بەزۆری بەکارەوە پێوەستن ، بەم جۆرە لە دارشتنی (کرد من ، کرد تە ، کردوی شێوەی کردم ، کردن ، کردی دارێژراوە ، وە لە من کرد ، قسە من کر ، من نوسی نەم کرد ، قسەم کرد ، نامەم نوسی) دراێژراوە بەم جۆرە شێوەی دۆخی تیانی جیٚناوی کەسیو جیٚناوی لکاو دارێژراوە .

١٦٩ — لە رووی دارشتنی جیٚناوی لکاوی کەس یەکەمو دووەمو سیٚیەمی کۆ (مان . تان ، یان) بە دارشتنێکی نویٚ دەژمێردری ، کە لە کەسی یەکەمو دووەمو سیٚیەمی تاك بەیارمەتی نیشانەی کۆ (—ان)ەوە دارێژراوە ، کە ئەم نیشانەیە دەچێتە سەر ناوو جیٚناو : ژن — ژنان ، میر ، میران ، ئەو ،ئەوان هتد . . . .

١٧٠ — جیاوازی بەکارهێنانی شێوەی جیٚناوی کەسی دۆخی تیان لە دیالێکتی ژووروودا و جیٚناوی لکاو لە دیالێکتی خواروودا لەوەوە پەیدابووە ، کەوا لەژووروودا شێوەی تەواوی جیٚناوی کەسی پارێزراوە و هەروا هەبوونی شێوەی راستەو خۆشی ، بەم جۆرە لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا .

جیٚناوی لکاو لە هەرسیٚ شێوەی کاری رابردوودا بە کۆتایەکەوەی دەلکیٚ ، هەر بۆیەیە ا . خودسکۆ ، فد . یوستی وەکو کۆتایی کەسی کاریان ژماردووە . و ئۆ . مان بە دەمکانی کاری نادیاری لە قەلەمداوە ، ئەمانە لەم بیرورایەیاندا راستبوون ،چونکە جیٚناوی لکاوی جۆری دووەم لە رستەدا دەوری جیٚناوەکەو و خۆیەتی دەگێریٚ .

بەڵام پێوەندی جیٚناوی لکاو بەجیٚناوی کەسییەوەو واتای گشتی یان دەگەرێتەوە بۆ ئەرکی جۆراوجۆری رێزمانیو گۆرانی ئەم ئەرکانەیان لە رستەدا ئەمانە هەموو جیٚناوی لکاو لە کۆتایی کەسییەوە جیادەکاتەوە بەجۆرێك ، کە هەریەکەیان بە بەشێکی سەربەخۆ بژمێرین هەروا ئەمانە هەمان دەوری رێزمانی دەگێرن ، کە شێوەی جیٚناوی کەسی تیان لە کرمانجی ژووروودا دەیگێریٚ .

**(جیٚناوی نیشانە)**

١٧١ — جیٚناوی نیشانە لە زمانی کوردیدا دابەشدەبێتە سەر دوو گروپ :—

أ — ئەو جیٚناوانەی ، کە بۆ شتی نێزیك بەکاردین .

ب — ئەو جیٚناوانەی ، کە بۆ شتی دوور بەکاردین

| جیٓناوی کەسی تاك | | جیٓناوی کەسی کۆ | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی ئەڤ (بۆنیزیك)ئەو (بۆدوور) | | ئەڤان | ئەوان |
| سۆرانی ئەم (بۆ نیزیك) ئەو (بۆدوور) | | ئەمان | ئەوان |

جیٓناوی گروپی دووەم لە هەردوو دیالیٓکتەکەدا یەك جۆرە شیٓوەیان هەیە .

جیٓناوی گروپی یەکەم لەرووی فۆنیٓمەوە جیاوازی‌یان هەیە . جیاوازی‌یەکەی لە رووی دەنگی (م) لە دیالیٓکتی کرمانجی خوارووداوە (ڤ) لە دیالیٓکتی کرمانجی ژووروودا . جیٓناوی نیشانە ژمارەشی هەیە لە تاكو کۆدا هەروا جیاوازی رەسەنی نیٓرو میٓی لە دیالیٓکیٓی کرمانجی ژووروودا هەیە بە تایبەتی لە دۆخی تیان (ناراستەوخۆ) و دۆخی دووەم‌دا .

لەپالٓ ئەمانەشدا لە هەردوو دیالیٓکتەکەدا شیٓوەی ئەم جیٓناوانە زۆر بەکاردیٓت ، لە کرمانجی‌دا ئەوڤە ، ئەوە ، ئەڤانە ، ئەوانە ، لە سۆرانی‌دا – ئەمە ، ئەو . ئەمانە ، ئەوانە .

۱۷۲ – جیٓناوی نیشانە گەردان‌دەکریٓ . جیاوازی ئەم جیٓناوانە لە هەردوو دیالیٓکتەکەدا لە دۆخی راستەوخۆ و تیان بەرچاو دەکەویٓت ، هەروا لە رەسەنی میٓو نیٓریش‌دا لە کرمانجی‌دا شیٓوەی دۆخی دووەم بەپیٓ دۆخی تیان دادەریٓژریٓ ، کە شیٓوەی نیٓرومی لیٓك جیا دەکاتەوە . ئەم دۆخە لە سۆرانی‌دا بۆ جیٓناوی نیشانەی باری کۆو جیٓناوی کەسی جودای سیٓیەمی کۆ لە دۆخی تیان‌دا لە رووی شیٓوەوە وەکو یەکن‌و بیٓلایەنن .

۱۷۳ – جیٓناوی نیشانە لە رستەدا دووروٓلی سەرەکی دەگیٓریٓت :–

أ – دەوری جۆراو جۆری بەشەکانی رستە .

ب – کەتیگۆری ناسیاری پیٓشان‌دەدات‌و لەگەلٓ ناودا لەرەسەن‌و ژمارەدا ریٓك دەکەون .ئەم تایبەتیٓی‌یەی دوایی لە کرمانجی‌دا بەرچاودەکەویٓت ، هەروا لە هیٓندیٓك بەشە دیالیٓکتی سۆرانیش‌دا ویٓنە لە دیالیٓکتی کرمانجی‌دا :–

**وەکە رۆژی ئەڤ بهیست ، هەر دوو دەستیٓن خوە لسەریٓ خویٓ دان . (زمانی کوردی -۱-٤٤)**

**ئەوان دەرکەوتن چوونە ویٓدا (گۆرانی‌و چیرۆکی کوردی – ۲۰۳)**

**من وی کەڤری خزنا زیٓرابوو ، خان ئەوە زان‌بوو (گۆرانی وچیرۆکی کوردی –۲۱۱)**

**هەروا ئەم رستانەی خوارەوەشی لەگەلٓ بەشی دیالیٓکتی کرمانجی ژووروش‌دا نوسراوە ، بەلاٌم خۆی سەر بە دیالیٓکتی کرمانجی خوارووە .**

ئەوانەی بەدخۆیی ئەکەن ، بەدخۆیان دێتە وەریٚ (ڕێزمانی کوردی – ٨٢)
ئیتر وا دەرئەکەویٚ ئەوە ئەبیٚ بەدەرسیٚ بۆیان (مەکەنزی –٧٦)
ئەوەی – کە پێت ووتم هەر لە بیرمە (مەکەنزی –٨٢)
وێنە لە دیالێکی سۆرانیدا
ئەویٚ رۆژیٚ سولتان سەلیم چوو ، میوانی ژنەکەی بوو (مەکەنزی – ١٧٨)
ئەوی کوری هینی زمانی عەرەبی بکە
(ئەو کورەی فێری زمانی عەرەبی بکە – سۆرانی)
ئەوی زانی ئەو قەسر نە ب خورییا خوە گرتبوو (خوەندنا کوردی – ٣٣)

١٧٤ – جیٚناوی نیشانە هێندێك جار رۆلی جیٚناوی کەسی جودایی دەگێرێت :–
ئەمانە کێن ؟
ئەوانە چ ئەکەن ؟

١٧٥ – لە دیالێکتی سۆرانیدا جیٚناوی نیشانە بە ئامرازی پێوەندی (لە ،بە)وە دەلکێن ، کە ووشەیەکی لێکدراوی‌و لە جیٚناوو ئامراز دادەرێژێت‌و واتای پێوەندی دۆخی جۆراو جۆر دەبەخشێت‌و لە ئەنجامی لێکدانی ئەم دوو بەشەدا یەکێك لەم دوو بزوێنە لەنێو دەچێت ، کە یەکێکیان لە کۆتایی ئامرازەکەیەو دووەمیان لە سەرەتای جیٚناوەکەیە .

لە + ئەم = لەم
لە + ئەو = لەو
بە + ئەمان = بەمان

ئەم دارشتنانە لە رووی واتاوە هیچ جیاواز نین لەگەلٚ ئەم جیٚناوانەی ، کە لەگەلٚ ئامرازی پێوەندی ب دیٚو جیٚناوی (ڤیٚ ، ویٚ) دا ( ب‌ڤیٚ ، ب‌ویٚ)

| سۆرانی | کرمانجی |
|---|---|
| بەم | ب‌ڤیٚ |
| بەو | ب‌ویٚ |
| بەمان | ب‌ڤان |
| لەم | ژڤیٚ |
| لەو | ژویٚ |
| لەوان | ژوان |

١١ – جیٚناوی فلان (فلان وەیا فیسار – سۆرانی) سەر بە جیٚناوی نیشانەیە :–
شاژن گۆتی ، سیٚ کووپە ئالتوون لە فلان شوێن دا لە باخەکەی دا هەیە (مەکەتری – ١٣٦)
شاژنیٚ گوت : سیٚ کوپ زێر (فلان جیٚدا لە باخیٚ وی دا هەیە ) کرمانجی

**گەردانکردنی جیٚناوی نیشانە لە دیالێکتی کرمانجی دا**

| دۆخ | بۆنزیك | | | بۆ دوور | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | تاك | | کۆ | تاك | | کۆ |
| راستەوخۆ | رەسەنی مێ | رەسەنی نێر | | رەسەنی مێ | رەسەنی نێر | |
| | ئەڤ ، ئەڤا | ئەڤ ، ئەڤا | وان ، ئەڤان | ئەو ، ئەوا | ئەو ، ئەوا | ئـەوان ، ئەوانا |
| بانگکردن | – | – | – | – | – | – |
| تیان (ناراستەوخۆ) | ڤێ ، ئەڤێ | ڤێ ، ئەڤێ | ڤان – ئەڤان | وێ ، ئەوێ | وی ، ئەوی | ئـەوان ، ئەوانا |
| ڕێچکەی هەڤرایی | ڤێرا ئەڤێرا | ڤیرا ئەڤیرا | ڤانرا ئەڤانرا | وێرا ئەوێرا | ویرا ئەویرا | ئەوانرا ئەوانارا |
| تێکرایی | ڤێڤا ئەڤێڤا | ڤیڤا ئەڤیڤا | ڤاناڤانا ئەڤاناڤا | وێڤا ئەوێڤا | ویڤا ئەویڤا | ئەوانڤا ئەواناڤا |
| شوێنی مەبەست | ڤێدا ئەڤێدا | ڤیدا ئەڤیدا | ڤاندا ئەڤاندا | وێرا ئەوێرا | ویرا ئەویرا | ئەوانرا ئەوانارا |

گەردانکردنی جێناوی نیشانە لە دیالێکتی سۆرانیدا

| دۆخ | بۆ نێزیك | | بۆ دوور | |
|---|---|---|---|---|
| | تاك | کۆ | تاك | کۆ |
| | بۆ نێرو مێ | | بۆنێرو مێ | |
| ڕاستەوخۆ | ئەم ، ئەمە | ئەمان<br>ئەمانە | ئەو<br>ئەوە | ئەوان<br>ئەوانە |
| بانگکردن | – | – | – | – |
| تیان | ئەم<br>ئەمە | – | – | – |
| ڕێچکەی هەڤرای | – | – | – | |
| تێکرایی | ئەمەوە | ئەمانەوە | ئەوەوە | ئەوانەوە |
| شوێن مەبەست | ئەمەوا | ئەمانەوا | ئەوەوا | ئەوانەوا |

## (جیٚناوی خۆیی)

١٧٧ - جیٚناوی خوه ، خوا ، خۆ (خۆ-سۆرانی) واتای خۆیەتیو خاوەنیەتی دەبەخشیٚت ، لە رووی رەسەن ، ژمارە ، دۆخدا بیٚلایەنە . لە دیالیٚکتی خواروودا بە جیٚناوی لکاوی جۆری دووەم بەم جیٚناوەوە دەلکیٚت جیٚناوی خوه ، خۆ لە رستەدا دەوری نیهاد ، بەرکار و دیارخەر دەگیٚریٚت . لە رولی بەرکاری تیاندا ئامرازی پیٚوەندی را ، نا ، دا ، دەوە ، دا - سۆرانی پیٚوەدەلکیٚت .

١ - بەرکار : ئەلموونا . . . ئەلموونا : گرفتارت بووم ، خۆت مەسوتیٚنە (حکایەتی زادیچ -٩٥)

ئەلموونا . . . ئەلموونا : کرفتاریٚ تە بووم خوه مەسۆژە - کرمانج)

وەکو نیٚچیریٚك بە قاچی خۆی خۆی هاویشتە ناو تۆری روداو (خانزاد -١٩)

مینا نیٚچیرەکیٚ ب دەستی خوه خوه ئاڤیٚتە تورو داویٚ - کرمانجی)

ئەوانا رادبن سەر ویٚدا دکە ، هنەکی سەر خوه داتی عەلی عبدالرحمن - ٤٧)

٢ - جیٚناوی دیارخەری .

بخوه بپرسن چ وەکر

خۆتان بپرسن چیتان کرد - سۆرانی)

سیٚ ئەمی بیٚگانانو دوژمنان دەرخنو خزە فەرمانداریيا خوه بکن

سبەینیٚ ئیٚمە بیٚگانەو دژمنان دەرئەکەینو خۆمان فەرمانداری خۆمان ئەبین .

٣ - دیارخەر (بەیارمەتی ئامرازی خستنەسەر)

برۆ لای مامیٚ خۆت (مەکەنزی -٢١٦)

هەرە جەم مامیٚ خوه (کرمانجی)

ئەمن لە جییێ بامی خۆم وەزیرم (مەکەنزی -٢١٦)

ئەز ل جییێ باڤیٚ خوه وەزیرم (کرمانجی)

قوربان ، هاتم رازی دلی خۆمت پیٚ بلیٚم (حکایەتی زادیچ -٩٤)

قوربان ، ئەز هاتم رازیيا دلیٚ خوه بیٚژمە تە - کرمانجی)

## (جیٚناوی یەکتری)

١٧٨ – لە زمانی کوردی‌دا ئەم شێوانەی خوارەوەی بەر ئەم جۆرە جیٚناوە دەکەون هەڤ ، هەڤەو ، یەکەو لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا هەڤ‌دە هەڤدو بەکاردێت . هەڤدو لەهەڤ + دوو داڕێژراوە ئەم (دوو) ، لە رووی بنچینەوە بۆ ئاوڵناوەی (وَن) دەگەڕێتەوەو (رر ، دیٚ) لە سۆرانی‌دا) لە کرمانجی خوارووداشێوەی یەکدوو ، یەکتر بەکاردێت ، شێوەی دوای (یەکتر) لە ژمارەی (یەك) + ئاوەڵناوی (تر)

دەستیٚ مە ژ هەڤدودا قەتاندیٚ (عەلی عەبدولرەحمان – ١١٨)

دەستی ئێمە لە یەکتری دوورخست – سۆرانی)

## (جیٚناوی پرسیار)

١٧٩ – شێوەکانی جیٚناوی پرسیار لە زمانی کوردی‌دا ئەمانەن :–

کیٚ ؟ ، کیٚ ؟) ، چ ؟ (چی ؟) ، کیژان ؟ (کام – سۆرانی)

چەند ؟ (چەند ؟ ، چەن ؟ – سۆرانی) ، چاوان (چۆن ؟ – سورانی)

جیٚ ناوی کیٚ ؟ (کی ) ، چ ؟ ، چی ، گەردان ناکرێن و رەسەن و ژمارەشیان نیە ، بەلاٚم پاشبەندی دۆخی ئامرازی پێوەندی (–را ، ڤا ، –دا)یان پێوە دەلکێت . لەپاڵ ئەوەش‌دا لە دیالێکتی خوارووداجیٚناوی لکاوی جۆری دووەمیش بەم جیٚناوانەوە دەلکێن : شایەر سەرکیٚ دکەنە ؟

کوری کیٚ لە ئاوەکەدا خنکا (ڕێزمانی کوردی – ١٠٣)

گونددا ئەوی کێرا کولاش دگرت ئەردیٚ دخست ، تیکست کوردی – ١٤٦)

تە گازی کیٚ کر ؟

خوشکا من تو ڤیزا کێی ؟

بۆچ وا پەشۆکاوی (حکایەتی زادیچ –٨)

تۆ چ ڤیر ئەکەی (حکایەتی زادیچ –٤٢)

چت لە دەست دیٚ بیکە .

چ ژ دەستی تە تیٚ بکە – کرمانجی)

٢ – جیٚناوی چ واتای پرسیارو دیارخەری دەگەیەنێت . ئەم جیٚناوە لە دیالێکتی کرمانجی‌دا لە دۆخی تیان‌دا هەمیشە نیشانەی (–ی) پێوە دەلکێت و لە سۆرانی‌دا ئەو ناوەی ، کە لەگەلٚ

حیٚنوی چ (چە)دا دیٚت نیشانەی نەناسیاری (-یٚك)ی پیٚوەدەبیٚت هەروا جیٚناوی لکاوی جۆری دووەمی لەگەلٚ دیٚت .

کرمانجی :-

**تو چ ئیشی دکی ؟**

**ئەز ئیشی دکم .**

**کیژان ، (کام - سۆرانی) بەرامبەر بە کیژان لە دیالیٚکیی خوارروودا (کیٚهان ، کیها)ش بەکاردیٚت .**

**وەرگیٚر ئەو نان دخوە .**

**ئەو چ زمانی دەزانی ؟**

**ئەو چ زمان دەزانیٚ ؟ (سۆرانی)**

**چ کتیٚبیٚ ئەو دخویٚنن ؟**

**چ کتیٚبان هون دکرن ؟**

**کاڤریٚ چ ؟**

**تۆ بـچ مەرڤیرا دچی ؟**

سۆرانی :

چ دەرمانیٚك هەیە دەست ناکەویٚ (حکایەتی زادیچ -١٢)

تۆ چی زانستیٚك فیٚری ئەو منداڵە دەکەی (حکایەتی زادیچ -٤١)

چ کاتیٚك بوو کە عبداللە چوو بۆ شار ؟

٣ - جیٚناوی کیژان - کە واتای پرسیار دەگەیەنیٚت ، لە جیٚناوی پرسیاری (کی ؟) وئامرازی پیٚوەندی (ژی) وە جیٚناوی دۆخی تیانی وان داریٚژراوە . لە سۆرانیدا جیٚناوی (کام)ی بەرامبەرە ، کە لە رووی رەسەنەوە لیٚلایەنەو پاشبەندی (-ەوە) و (دا)ی پیٚوە بەم جیٚناوانەوە دەلکیٚتو جیٚناوی لکاوی جۆری دووەم لە سۆرانیدا (بەکام)ە دەلکیٚت .

کرمانجی :

**ئەم گۆشتیٚ کیژان حەیوانان دخون (زمانی کوردی- ٣٤)**

**بـتە کیژان ئیٚشی بەری هەمیان دڤیٚت بیٚتە دەرمان کرن ، هاوار ، ژمارە ٣٢-١٩٤١)**

**لە کۆترەکان کامەیان ئەدەی بە من (ریٚزمانی کوردی - ١٠٢)**

**پارەکەت دا بەکامەیان ؟ (ریٚزمانی کوردی - ١٠٢)**

٤ – جیٚناوی (چاوان) ، چۆن – سۆرانی) ، بۆ پرسیارکردن بەکاردیٚت‌و بەپیٚش ناو دەکەویٚت .

**چۆن پیاوە (ریٚزمانی کوردی –١٣٨)**

**چاوان میٚر؟ (کرمانجی)**

**چۆن وولاٚتیٚ؟ ریٚزمانی کوردی –١٣٨)**

**چاوان وەلات؟**

٥ – جیٚناوی پرسیارو چەندی (چەند)یشی بەر ئەم جیٚناوانە دەکەویٚت لە کرمانجی خوارووەدا شیٚوەی (چەن) یش هەیە جیٚناوی لکاوی جۆری دووەمیشی لەگەڵ دیٚت .

**کرمانجی : تۆ چەند سالی؟**

**چەند تراکتۆریٚ کرلخۆزا وە هەنە؟**

سۆرانی :

**چەندت بۆ بنیٚرم (ریٚزمانی کوردی – ١٠٢)**

**بە چەند ئەیفرۆشی (ریٚزمانی کوردی – ١٠٢)**

**چەند کوریٚ؟ (ریٚزمانی کوردی – ١٣٨)**

### (جیٚناوی هەبی)

١٨٠ – لە زمانی کوردی‌دا ئەم شیٚوانەی خوارەوەی جیٚناوی هەبی هەیە ، لە کرمانجی‌دا (بی ، یا) بۆ تاك ، (بیٚد ، (بیٚد ، بیٚت ، بیٚن) وەیا (یٚد ، یٚت ، یٚن ، –ی) بۆکۆ . لە سۆرانی‌دا (هی ، ی ، هین) ئەم شیٚوانەی واتای نسبی‌و نیشانەی نیسبی پیٚشان دەدات . هەموو شیٚوەکانی ئەم جیٚناوانە لەهەردوو دیالیٚکتەکەدا لە رووی ئەرك‌و واتاوە نسبی‌یەو لە بنچینەوە بەجیٚناوی (هیا) وەیا (یا)ی ئیٚرانی کۆنەوە پیٚوەستە .

شیٚوەی (بیٚ ، یا ، بیٚد) لە بەشە دیالیٚکتی بۆتان ، بادینان ، هەکاری ، دیاربەکر ، بایەزید رەزاییە ، ئەرمینیاو سوریادا بەزۆری بەکاردیٚت :

شیٚوەی (بیٚت ، یٚت) لە بەشە دیالیٚکتی بادینان‌وە شیٚوەی (بیٚن) لە زمانی ویٚژەیی سوریادا بەکاردیٚت .

شیٚوەکانی تاکی ئەم جیٚناوە رەسەن پیٚشان دەدەن ، (یا) بۆ میٚ ، بیٚ بۆ نیٚر ، بەلاٚم شیٚوەکانی سەر بە دیالیٚکتی سۆرانی ژمارەو رەسەن پیٚشان نادەن .

ئەم شێوە جیاوازانەی ، کە لە رووی فۆنیمەوە لە سۆرانیدا هەیە ، هەر شێوەیەکی لە ناوچەیەکدا بەکاردێت ، بۆوینە شێوەی (هی) لە بەشە دیالێکتی سلێمانی ، شێوەی (هین) لە بەشە دیالێکتی کەرکوکدا شێوەی (-ی) لە بەشە دیالێکتی کوردانی مەهابادو هەولێرو رەواندوز بەکاردێت .

**لەگەڵ ئەو تایبەتێتییانە رادەی بەکارهاتنی شێوەی جۆراو جۆری ئەم جێناوانە هەموویان لە رووی ئەرکەوە وەکو جێناوی نسبیو نیشانەو نسبیو دیارخەری بەکاردێن .**

**بێ پیر دەستو تلێن جوەێن سپیو زراڤ سەر تێلێن سازێ ڤەئانی ، بێ جوان بدەنگەك مەلولو دل شەوتی دەستپێکر (خوەندنا کوردی -٣٤)**

**شڤان دووکار ئانین یەك چالە بەلەك بوو ، یەك رەش بوو ، ئەوی یا رەش دا برێ من ، یا چالە بەلەك ژی دا من . ئەڤ ستران شیرینن ، لێ ئاهەنگێن وان ێن گەشو زیز نەڤەك یێن سترانێن وەلاتێ منن . (هاوار ، ژمارە -٢٩ ، ١٩٤١)**

**ئەم ئەسپە هی نەوزادە . (رێزمانی کوردی - ١٠٦)**

**ئەم گوندە هی کابرایەك بوو ناوی عەدۆ بوو ، خۆی لە ماڵەوە نەبوو .**

**بۆ زانینی پێوەندی جێناوی هەیی بە ئامرازانی (کۆ ، کۆ ،کە)ەوە بروانە (بەندی ژمارە -٤٥٣)**

## (جێناوی دیار)

١٨١ - جێناوی (هەر)سەر بەم جێناوەیە ئەم جێناوە بە یارمەتی ووشەی دی جێناوی لێکدراو پێك دەهێنێت ، وەك : هەریەك ، هەرکەس ، هەرشت ، (هەرشت - سورانی) بۆ شتی بێ گیان بەکاردێت ، هەروا جێناوی گشت (گش) ، هەموو ، تەڤ ، تەمام ، (تەواو - سۆرانی)

١ - جێناوی دیاری (هەر) لە هەردوو دیالێکتەکەدا لەگەڵ هەموو ناوێك بەکاردێت :-

**هەر رووح بەرێك زانبوو ، وەکی ئیدی سبە نێزیك بویە (دایك ٣٤)**

**هەرکولخوزڤانەك ٣٠٠ - ٤٠٠ رۆژخەباتی وانهەیە (لیتراتۆراو وەتەینە ١١٢)**

**هەر سال تێ مالا مە (لیتراتۆرا وەتەنیە - ١٣١)**

٢ - شێوەی لێکدراوی جێناوی دیاری هەریەك ، هەرکەس ، هەرتشت (هەرشت - سۆرانی) ، کە لە لێکدانی جێناوی هەر لەگەڵ ژمارە یەك ، ناوی کەسو تشت (شت - سۆرانی) پێك هاتووە کە لە شێوەی نووسیندا بە یەکەوە لەپاڵ یەك دەنوسرێن وەیا دوورلەیەك .

جیٚناوی لێکدراوی هەریەك ، هەرکەس ، هەر تشت لە دیالێکتی کرمانجی‌دا کە لە دۆخی تیان‌دا دەبێت ، نیشانەی (–ێ)ی بۆ رەسەنی مێ‌و نیشانەی دۆخی (–ی) بۆ رەسەنی نێری ، هەروا نیشانەی کۆی (–ان) لەگەڵ دێت . شێوەکانی دۆخی تیان پاشبەندی ئامرازی پێوەندیشیان پێوە دەلکێن . جیٚناوی هەریەك تەنیا شێوەی ژمارەی تاکی هەیە .

لە سۆرانی‌دا شێوەکانی جیٚناوی دیار لە رووی رەسەنەوە بێ‌لایەنن‌و نیشانەی نەناسیاری (–ێك) وەیا کورت‌کراوەی ئەم نیشانەیە (–ێ)یان پێوەدەلکێت . هەروا جیٚناوی لکاوی جۆری دووەمیان لەگەڵ‌دێت .

**هەریەك ژ وان پینەك ژ کنجێ خوە قەتاندن (شڤانی کورد – ١٤٧)**
**هەریەك لێیان لەتێکیان لە بەرگی خۆیان دراند – سۆرانی**
**هەریەك عومریان بووە چەند ، ساری (مەکەنزی – ١٩٢)**
**هەریەکی ب‌ڕێڤە زەلامەك کربوو پشتاخوەو ب‌خوەر ، ئانی‌بوو (رۆژانوو ، ژمارە – ٧ ، ١٩٤٢)**
**هەرکەسی کەتبوو ناڤا جێی‌خوە (دێ – ٤٥)**
**هەرکەسی گلێ خوەیە باش سەر تربا مەرێ خوەدا دگۆتن (دێ – ٣٦)**
**هەرکەسێك ووتەی خۆش هی خۆیان لەسەر گۆری خزمی خۆیان ئەوت – سۆرانی .**
**هەرتشت سەبا من عەیان (دێ – ٥٦)**
**هەرشتێ بۆ من عەیانە – سۆرانی .**
**دڤێ وولانی‌دا وە هەر تشت ب‌زەهر کر (خوەندنا کوردی – ٣٥)**
**لەم وولاتەدا ئێوە هەر شتان بە زەهرکرد (سۆرانی)**
**هەرتشێ بن دەستێ وی‌یە (خوەندنا کوردی – ٣٠)**
**هەرشتێ لە بن دەستی ئەودایە ،(سۆرانی)**

شێخ‌و مەلا خوە تێکیلی هەرتشتی دکن‌و دخوازن هەر تشتی ب‌یەك ئاوای دەرمان بکن (مەمێ‌ئالان)

شێخ‌و مەلا خۆیان تێکەڵی هەر شتێك ئەکەن‌و ئەیانەوێ هەر شتێك بە جۆرێك دەرمان بکەن .

٣ – جیٚناوی هەموو ، گشت ، گشك) ، تەمام (تەواو) لە هەردوو دیالێکتەکەدا بەکاردێن . لە کرمانجی‌دا دۆخی تیانی ئەم جیٚناوە نیشانەی (–ی) بۆ ژمارەی تاك‌وە نیشانەی

(-ان) بۆ ژمارەی کۆی لەگەڵ بەکاردێت . ئەم جیٚناوانە لە سۆرانیدا نیشانەی کۆی (ان)و جیٚناوی لکاوی جۆری دووەمیان لەگەڵ دێت :

**هەموو ماڵ‌و دەولەتی خۆی داوە بەو کەسە (حکایەتی زادیچ - ٣٣)**
**هەموو ماڵ‌و دەولەتا خوە دایە وی کەسی - کرمانجی)**
**هەموویان چونە لای نەبووسان (حکایەتی زادیچ - ١١٢)**
**هەموو باڵندەکان فرین (رێزمانی کوردی - ١٤٠)**
**هەموو پەرندە فرین - کرمانجی**
**ئەوانە هەمویان خەلاّتی پاشایان وەرگرت (حکایەتی زادیچ - ٣٥)**
**ئەوانا هەموویان خەلاتا پاشا ستاند - کرمانجی)**
**پاشا ئەڵێ : بزانە مەلا گشتیان دوو قاچ بوون ، مەکەنزی - ٧٨)**
**گشت درەختەکان مەتەکێنە (رێزمانی کوردی - ١٤٠)**
**دارا گشکان مەهەژنە ، کرمانجی)**
**مە گشکا کاسێ خوە ڤەخارن (دێ - ٧٧)**
**گشتمان کاسی خۆمان خواردەوە (سۆرانی)**
**گشك چووبوون ئالیێ گەلێ (سەرهاتیێ جاسم - ١٥)**
**هەموویان چووبوونە لای گەلی ، سۆرانی) .**

**(جیٚناوی نادیاری چەندی)**

١٨٢ - جیٚناوی هن (-ەك) (هیندێ ، هەندێك ، سۆرانی) چەند (چەند ، چەن ، سۆرانی) چقا(س) (چەندێك - سۆرانی) ئەوقاس (ئەوەندە - سۆرانی) بەر ئەم جیٚناوە دەکەون .

کاتێ ئەم جیٚناوانە دەوری دیارخەر دەگێڕن ، دەکەونە پێشی ناوی دیارخراوەوە :-
هێندێ ووتەی لە شعرەکانی زادیچ تێدابوو (حکایەتی زادیچ - ٢٧)
هنەك گلی ژ شێرێد زادیچ تێدابوو - کرمانجی)
حاکمی شار بە دەنگێکی بەرز ناوی چەند کەسێکی هەڵدا (حکایەتی - ٣٢)
شێرزاد چەند عەبدێکی لەگەڵ خۆ برد (مەکەنزی - ٢١٦)
چەندت بۆ بنێرم ؟ (رێزمانی کوردی - ١٠٢)
چەندا (ن) بوشە بنێرم - کرمانجی)

پێشیا کون چەند سیتلە دانی بوون (سەرهاتی جاسم – ۷
چقاس داری ئێمیشی ناڤ مێشەدا هەبوون ، وان دارا ئیدی کولیلك دانە (شڤانی کورد
–۲)
لاوۆ چقاس خورەکیٚ شیرین هەیە ئەز ددمەوە ( دیٚ ، ٦١)
سالیٚ هوون زانن چقاس خەرجی ئەم ددن : شڤانیٚ کورد – ۳۳)
ئەوقاس دەولەتا وان توونە (شڤانیٚ کورد – ۱۹)

(جیٚناوی نادیار)

۱۸۳ – جیٚناوی کەس ، تشت شتێك – سۆرانی ) لە جیٚناوی نادیار دەژمێردریٚ و بە شێوەیەکی گشتی نیشانەی نەناسیاری + ەك (–ێك ، –یٚ –سۆرانی) دەچێتە سەر شێوەی (کەسەك ، شتەك) لە کرمانجی‌دا باری دۆخی تیانیشی هەیەو (–ی) بۆ تاك‌و (–ان) بۆ کۆی دەچێتەسەر .

شێوەی (کەسێك ، شتێك) لە سۆرانی‌دا جیٚناوی لکاوی جۆری دووەمی پێوە دەلکێت
کەسەك هات ؟
کەسێك هات ؟ سۆرانی .

**تە دگۆت ئەمەربەگی تشتەك لـوێدەریٚ ووندا کریڤە (شڤانی کورد – ۱۵)**
**باوکیان بانگی کرد ، کوری خۆم وەرە باوکی شتی جووانی بۆ هێناون (مەکەتری – ٦٦)**
**جیٚناوی کەس‌و تشت لە رستەی ناکراودا واتای نەکردنی کار دەگەیەنێت بێجگە لە تۆ کەس نی‌یە بەخێوم بکات (حکایەتی زادیچ – ۳۳ – ۳٤)**
**سەکی وان نکاربوو (شڤانیٚ کورد – ٦١)**
**تشتەك دەرنەکەت (دیٚ – ۷۰)**
**شتێك دەرنەکەوت – سۆرانی) ..**

(جیٚناوی نا)

۱۸٤ – (هیچ ، قەت ، تو) سەر بە جیٚناوی ناکردنە .

دوو شێوەکەی دوایی لە دیالێکتی کرمانجیدایە ، یەکەمیان لە سۆرانی‌دا هەیە . ئەم جیٚناوانە لەگەلٚ ناودا ووشەی لێکدراوی دادەرێژن وەك قەت کەس ، قەت ، تشت ، تو کەس ، تو تشت ، هیچ کەس هیچ شت دوو شێوەکانی هەرە دوای لە سۆرانی‌دا باوە شێوەکەی یەکەم لە کرمانجی‌دا شێوەکەی قەت کەس توکەس ، هیچ کەس بۆ مرۆڤ بەکاردێت ، شێوەی قەت تشت ، هە تشت ، هیچ شت بۆ بیٚ‌گیان بەکاردێت .

ئەو رستەیەی ، کە جیٚناوی نای تیٚدایە پیٚویستی بە نیشانەی ناکردن نیە ، لەگەلٚ کار دیٚت ئەم جیٚناوانە لەکرمانجی دا کە لە شیٚوەی لیٚکدراودا دەبن نیشانەی نەناسیاری(–ەك)ی و نیشانەی دۆخی تیان (–ی) دەچیٚتە سەر . ئەم جیٚناوە لە سۆرانی دا نیشانەی نەناسیاری (–یٚك) (–یٚ)ی پیٚوە دەلکیٚت هەروا جیٚناوی لکاوی جوری دووەمیشی لەگەلٚ دیٚت :–

**ئەو حاکمە هیچ مەردایەتی زادیچی نەکرد (حکایەتی زادیچ – ٣٢)**
**هیچ کەسیٚ نەیدەتوانی بۆی بگریٚت (حکایەتی زادیچ –٣٠)**
**قەتکەس نەکاربوو ژبرا گلی بکە . (کرمانجی) .**
**قەت تشتەك ژی نە لازمە (دیٚ – ٧٦)**
**برا تو کەس مە نەکا لومانە (دیٚ –١٣٩)**
**تو کەسی ئەو ناس نەدکرن (خوەندنا کوردی –١٩)**

١٨٥ – لە زمانی کوردی دا هیٚندیٚك ناو دەوری جیٚناو دەگیٚرن ، وەکو ناوی کەس ، تشت ، کە بە ناوی جیٚناوی دەگیٚرن وەکو کەس ، تشت ، کە بە ناوی جیٚناوی نادیار بەکاردیٚن هەروا ناوی مەری وەیا مەرۆ لەکرمانجی دا ، کابرا لە سۆرانی دا وە ژمارەی یەك ئەمانەشی وەکو ووشەی کەس ، تشت دەوردەگیٚرن .

**کرمانجی : ئەز چوومە جەم یەکی ، رووییٚ خوە ژ من بادا (هاوار ، ژمارە ٢٣ ، ١٩٤١)**

**دلیٚ خوەرا دگۆتن ، ئەڤا گەدە ئیرۆ چە ها قاس باباخ دیە ، نە بەیەکی ئەو خاپاندی‌یە (دیٚ – ٥٦)**

**خورتیٚن مە ددۆرا فۆلکلۆرا کو ویٚ بنڤیسین ، ژ مەرە تشتنە بـئەهمیەتو سپەهی ژی دکارن بدن زانین ، مەسەلە ، یەکی سترانەك نڤیساندی‌یە (هاوار ، ژمارە – ٢٩ – ١٩٤١)**

سۆرانی :–

**کابرایەك لە نزیك کانیٚ جووت ئەکا ، تۆو ئەچیٚنیٚ (مەکەنزی – ٥٠)**
**رۆژیٚك دەردی دلیٚ خۆم بۆکابرایەکی عەرەبی سالٚ دیتە ئەشکەرا کرد (حکایەتی زادیچ –١١٨)**

## کار

١٨٦ – کار لەلایەن نووسەران ف .یوستی (٦٩ ، ١٧٣ ، ٢٥٦) ،ر . جاردین (٦٨ ، ١٨ – ٣٨) ،ی . سۆن (٨٠ ، ٣٦ – ٩٤) لە رووی دارشتنەوە باسکراوە . لە لیٚکۆلٚینەوەکانی د .ن . مەکەنزی ، کە دەربارەی دیالیٚکتەکانی زمانی کوردی‌یە (٧١ ، ٨٤ – ١٢٠ ، ١٧٧ – ١٩٥) ،

له بەرهەمە ڕێزمانی‌یەکانی یو .یو .ئاڤالیانی ، کە دەربارەی کرمانجی‌یە (بڕوانە ٢-٩) لە کەتیگۆری کات‌و کەسەکان و چۆنیەتی‌و هۆی دارشتنی کار دواون .

ی . ی . چوکرمان لە بەرهەمەکەی‌دا ، کە دەربارەی ڕێزمانی کوردی‌یە لە کاتەکانی کارو دەمکاتەگانی لە دیالێکتی کرمانجی ژووررووی کۆڵیوەتەوە .

١٨٧ – کار لە رووی دارشتنی‌یەوە دابەش دەبێتە سەر رەگ ، داڕێژراو و لێکدراو ، زمانی کوردی دەمکاتی کاری ئەسلی تەواو شلك نابات‌و لە رووی ووشەی فەرهەنگی ڕێزمانەوە لێك دەدرێن‌و وەکو بەشێکی سەربەخۆی ئاخافتنەو ئەرکی تایبەتی سینتاکسی خۆشی هەیە . لە کۆتایی‌دا هەموو کارێك بە ناوی رووداو – چاوگەوە پێوەستە ، کە بێ نوونی چاوگی بناخەی کار دروست دەبێت‌و زۆر جار ئەم بناخەیە بە دەمکاتی کاری ئەسلیش نێو دەبرێت .

### کاری رەگی

١٨٨ – رەگی کار بە کۆنترین بەشی کار دەژمێردرێت لە زمانی کوردی‌دا بەشی زۆری رەگی کار بە تەنیا بەکارنایەت‌و تاکە ڕێگەیەکی زانینی بنچینەو ئەسلی رەگ ڕێگەی بەراورد کردن‌و ئیتیمۆلۆژی‌یە .

هێندیك رەگی کار هاوبەشی دارشتنی ناوی لێکدراو دەکەن بۆ دارشتنی کاری رانەبوردوو رەگ بەکاردێت (بڕوانە بەندی ١٩٢ – ١٩٨) . بە شێوەیەکی گشتی لە هەردوو دیالێکتەکەدا خواروو و ژووروو رەگی کار هاوبەشە ، لەگەڵ بوونی هێندیك رەگ کە تایبەتە بە یەکێك لە دوو دیالێکتەکە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ١ – کاری کۆتایی هاتوو بە – تن | |
| کەتن | کەوتن |
| هاتن | هاتن |
| گۆتن | ووتن ، گۆتن |
| ئاڤێتن | هاویشتن |
| ئالاستن | لیستن |
| گەستن | گەستن |
| ریتن | رشتن |
| بهیستن | بیستن |

| | |
|---|---|
| خوەستن | ویستن ، خواستن |
| خستن | خستن |
| کوشتن | کوشتن |
| شوشتن | شوشتن |
| هشتن | هێشتن |
| رستن | رشتن |
| گوهاستن | گوێستن |
| گرتن | گرتن |
| مێتن | مژین |

٢ - کاری کۆتایی هاتوو به (-دن) :

| | |
|---|---|
| ستاندن | سەندن |
| چاندن | چاندن |
| خواندن | (خەواندن - وەرگێر) |
| کرن | کردن |
| مرن | مردن |
| برن | بردن |
| خوەرن | خواردن |

٣ - کاری کۆتایی هاتوو به (-ین) :

| | |
|---|---|
| نڤیسین | نووسین |
| دزین | دزین |
| کرین | کرین |
| برین | برین |

٤ - کاری کۆتایی هاتوو به (-ان) :

| | |
|---|---|
| کوتان | کوتان |
| مان (ماین) | مان |
| دان (داین) | دا |
| کولان | کوڵان |

٥ – کاری کۆتایی هاتوو بە (–وون) :

| | |
|---|---|
| بوون (بووین) | بوون |
| چوون (چووین) | چوون |
| دروون | دروون |
| جوون (جووین) | جووین |

٦ – کاری کۆتایی هاتوو بە (–ن)

| | |
|---|---|
| کرن | کردن |
| برن | بردن |
| خوەرن | خوەردن |
| مرن | مردن |

هەبوونی کارێك لە دیالێکتێك‌دا و نەبوونی لەوی دی‌دا بەرێگەی دارشتنی ، کە لە هەمان رەگی کارەوە دادەرێژرێ :–

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ناس‌کرن | ناسین |
| ئاڤس‌بوون | ئاوسان |
| رووت بوون | رووتان (–ەوە) |

## کاری دارێژراو

١٨٩ – رێگەی دارشتنی کاری دارێژراو لە هەردوو دیالێکتەکەدا گشتی‌یەو هەمان هۆ بەکاردێت بۆ دارشتنی .

کاری دارێژراو لە رەگ‌و بناخەی کارەوە دادەرێژرێت هەروا لە بەشی ناوی‌و بەشی بناخەی کارەوەش .

کاری دارێژراو لە رەگی کارەوە لە بناخەی کاری رانەبوردووەوە دادەرێژرێت‌و هێندێك جار (زۆرکەم) لە بناخەی کاری رابردووەوە . لە کاتی رۆنانی کاردا هێندێك کاری دارێژراو ، کەلە بناخەی کارەوە دادەرێژرێن دەکەونە ژێر کاریگەری جۆری دووەمی دارشتن لە دارشتنی کار لە ناوەوە ، گۆرانی فۆنۆتیکی بەسەر هێندێك دەنگی ناوەکەدا دێ .

### کاری دارێژراوی کۆتایی هاتوو بە (-ین ، -ان)

١٩٠ - ئەم جۆرە کارانە لە ناوەوە دادەرێژرێن و لە هێندیکیاندا ئاڵوگۆری فۆنۆتیکیشی لەگەڵدا بەشدار دەبێ ، ئەوەی ئاشکرایە ئەم جۆرە کارانە تێپەرنین ، ئەم چەشنە کارانە لە هەردوو دیالێکتەکەدا ژووروو و خواروو لە ناو دادەرێژرێن . لە بەشی دیالێکتی خوارووداکاری کۆتایی هاتوو بە (-ین) و(-ان) دادەرێژرێن و بەرامبەرەکەی لە ژووروودا هەر (-ین)ە .

ئەم جۆرە دارشتنە بۆ ئەم کارانە دەبن ، کە لە ناوی عەرەبی یەوە دارێژراون و ئاڵو گۆری فۆنۆتیکیشی بەسەردا هاتووە . زۆرجار لەنێو کاری دارێژراودا دوو ناو بەرچاو دەکەوێت ، کە لە زمانی کوردیدا بەتەنیا بەکار نایەن .

کاری دارێژراو لەناوی عەرەبی یەوە بە زۆری لە دیالێکتی ژووروودا بەکاردێت و لە دیالێکتی خوارووداکەمترە .

١ - کاری دارێژراو بە یارمەتی (-ین) ، (-ان) ، کە لە ناوەوە دادەرێژرێت و هیچ گۆرانێکی فۆنۆتیکیشی بە سەر نایەت :

| ناو | | کاری دارێژراو | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| ترس | ترس | ترسین | ترسین ، ترسان |
| ئێش | ئێش | ئێشین | ئێشان |
| لەرز | لەرز | لەرزین | لەرزین ، لەرزان |
| ئاڤس | ئاوس | - | ئاوسان |
| چەرخ | چەرخ | چەرخین | چەرخان |
| دەرز | دەرز | دەرزین | دەرزین |
| کەن | - | کەنین | پێکەنین |
| رووت | رووت | - | رووتان (-ەوە) |
| وەرم | - | وەرمین | - |
| بەز | - | بەزین | - |
| خەید | تورە | خەیدین | تۆرین ، تۆران |
| گری | گرین | گرین ، گریان | - |

له سۆرانی‌دا جۆته کاری تێنه‌پەر هەن ، که به یارمەتی (–ین ،–ان) داده‌رێژرێن :

**درین – دران ، ترسین – ترسان ، سوورین – سووران ،**

**خزین – خزان ، تێکۆشین – تێکۆشان ، رژین – رژان**

٢ – کاری کۆتایی هاتوو به (–ین) ، کاتیّ لەو ناوانه پێك دێت ، که دەنگی پێش کۆتایی بزوێنه ، له ئەنجامی چوونەسەری (–ین) بۆ سەر ئەم جۆره ناوانه دەنگه بزوێنەکه به بزرۆکه دەگۆری . ئەم دیاردەیه به کرمانجی ژووروووه تایبەته :

| | |
|---|---|
| **خەبات** | **خەبتین** |
| **شەوات** | **شەوتین** |
| **لپات** | **لەپتین** |
| **پەلاخ** | **پەلخین** |
| **لەوات** | **لەوتین** |

٣ – ئەو ناوانەی ، که عەرەبین‌و کاری کۆتایی هاتووی به (–ین) یان لیّ داده‌رێژریّ ، هێندیك دەنگی لیّ دەگۆرێت له کاتی دارشتن‌دا ئەم جۆره ناوانه تەنیا له کرمانجی ژووروودا هەن :–

| | |
|---|---|
| **حەساب** | **حەسبین** |
| **زەواج** | **زەوجین** |
| **رەقاس** | **رەقسین** |
| **رجاف** | **رجافین** |
| **حەپس** | **حەپسین** |
| **شغول** | **شغولین** |
| **کێلم** | **کێلمین** |
| **خالق** | **خالقین** |
| **جەرب** | **جەربین** |
| **ئەمەل** | **ئەملین** |
| **فکر** | **فکرین** |

٤ – دیسانەوه هەر له عەرەبی‌یەوه هێندێك ووشه هەن ، که له رەگەوەش بەکاردێن ، بەلاّم زۆر کەم ، وەکو :

شەدین ، خەرقین ، حەدمین ،سەکنین ،
حەسین ، خالفین ، جەمدین .

ء – کاری تێنەپەر لە رەگی کاری تێپەری رانەبوردوو و لە رەگی کاری تێپەری نەبوردووەوە دادەرێژرێت ، ئەم جۆرە کارانە تەنێ لە کرمانجی ژووروودا هەن :

| رەگی کاری | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| پەتن | – | پێژ | – |
| گوڤاشتن | گوشین | گوڤێشن | گوش |
| قەلاشتن | قەلاشتن | قەلیش | قەلاش |
| رێتن | رشتن | رێژ | رێژ |
| براشتن | برژاندن | برێژ | برژێن |
| تەراشتن | تراشین | تەرێش | ترێش |
| نخامتن | – | نخێم | – |
| بشکاڤتن | پشکوتن | بشکێڤ | پشکوو |

کاری دارێژراو

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پژێن | – |
| گوڤشین | – |
| قەلشین | قەلشان |
| رژین | رژان |
| برژین | برژان |
| تەرشین | – |
| نخمین | – |
| بشکڤین | – |

٦ – کاری داڕێژراو بە پارمەتی (–ین) لە بناخەی ووشەی دووبارەکراوەوەش دادەڕێژرێ :–

| ووشەی دووبارەکراوە | | کاری داڕێژراو | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| قیژە–قیژ | قیژە–قیژ | قیژین | قیژین |
| نالّە–نال | نالّە–نال | نالین | نالّین |
| بارە–بار | بارە–بار | بارین | بارین |
| قارە–قار | قارە–قار | قارین | – |

## کاری داڕێژراو بە پارمەتی (–اندن)

١٩١ – زۆربەی ئەو کارانەی بە پارمەتی (–اندن) داڕێژراون تێپەرن . تەنیا هێندیك بەش نەبێ ، کە وەکو کاری هۆیی تەماشا دەکرێن . ئەم کارانە لە رەگی تێپەر و تێنەپەری کاری داڕێژراوی کۆتایی هاتوو بە (–ین ،–ان) ، لە هێندیك باردا کاری کۆتایی هاتوو بە (–اندن) تێنەپەرە رۆدەندرێن .

١ – زۆربەی ئەو کارانەی بە پارمەتی (–اندن) داڕێژراون لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو و سۆرانیدا لە بناخەی کاری کۆتایی هاتوو بە (–ین و –ان)ەوە داڕێژراون .

| کاری کۆتایی هاتوو بە (–ین ،–ان) | | کاری داڕێژراو | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| خورین | خورین | خوراندن | خوراندن |
| گەرین | گەران | گەراندن | گەراندن |
| گهیشتن | گەیشتن | گهیاندن | گەیاندن |
| لەرزین | لەرزین | لەرزاندن | لەرزاندن |
| تەقین | تەقان | تەقاندن | تەقاندن |
| ئالین | ئالان | ئالاندن | ئالأندن |

| | | | |
|---|---|---|---|
| بارين | بارين | باراندن | باراندن |
| نالين | نالّين | نالاندن | نالاّندن |
| شكەستن | شكان | شكێناندن | شكاندن |
| فرين | فرين | فراندن | فراندن |
| هەرشين | رووشان | هەرشاندن | رووشاندن |
| كشين | كێشان | كشاندن | – |
| – | جۆشين | – | جۆشاندن |
| تەوين | – | تەواندن | – |
| ئێشين | ئێشان | ئێشاندن | ئيشاندن |
| خەيدين | تۆران | خەيداندن | تۆراندن |
| كەنين | پێكەنين | كەناندن | – |

٢ – بەشی زۆری كاری كۆتایی هاتوو بە (–اندن) لە رەگی كاری تێپەرەوە دادەرێژرێ ، دارشتنی ئەم چەشنە كارانە بە جۆری دارشتنی كاری هۆیی لە رووی مێژووی پێك‌هاتنی‌یەوە پێوەستە ، كە بە یارمەتی (–ان)ەوە دارێژراوە . ئەم كارە لە دیالێكتی كرمانجی ژووروودا واتای تایبەتی خۆی نەپارێزراوەو تایبەتە بە دیالێكتی كرمانجی ژووروو و بناخەی هێندێكیان بەر گۆران كەوتوون .

| رەگی كاری تێپەر | | كاری دارێژراو | |
|---|---|---|---|
| كرمانجی | سۆرانی | كرمانجی | سۆرانی |
| كۆلان | كۆلین | كۆلاندن | – |
| رێتن | رشتن | رژاندن | رژاندن |
| دۆتن | دۆشتن | – | دۆشاندن |
| چنین | چنین | چناندن | – |
| نڤیسین | نووسین | نڤیساندن | – |
| پێڤان | پێوان | پێواندن | – |
| برین | برین | براندن | – |
| ئانین | هێنان | ئیناندن | – |

| | | | |
|---|---|---|---|
| قەلاشتن | قەلشان | قەلشاندن | |
| گوڤاشتن | گوشن | گوڤشاندن | – |
| بشکاڤتن | پشکووتن | پشکڤاندن | – |
| پێتن | — | پژاندن | – |

٣ – کاری داڕێژراوی کۆتایی هاتوو بە (-ین) ، کە بناخەی لە ناوی کوردی وەیا عەرەبیەوەیە بە یارمەتی (- اندن) کاری تێپەریان لێ دادەڕێژرێ . ئەم جۆرە کارانە تەنێ لە کرمانجی ژووروودا هەن :

| کاری کۆتایی هاتوو بە(-ین) | کاری داڕێژراوی کۆتایی هاتوو بە (-اندن) |
|---|---|
| خەبتین | خەبتاندن |
| شەوتین | شەوتاندن |
| لیتین | لیتاندن |
| پەلخین | پەلخاندن |
| لەوتین | لەوتاندن |
| حەسبین | حەسباندن |
| زەوجین | زەوجاندن |
| رەقسین | رەقساندن |
| رجفین | رجفاندن |
| حەپسین | حەپساندن |

٤ – ئەم جۆرە کارە لە ناوی دووپاتکراوەی لاساییکەرەوەی دەنگانیش دادەڕێژرێ . باوەکو دارشتنەکەی بە یارمەتی (-اندن)ە . بەلآم تێنەپەرە :

| وشەی لاسایی کەرەوەی دووپاتکراوە: کرمانجی | سۆرانی | کاری داڕێژراو: کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|---|
| پستەپست | پستە -پست | پستاندن | – |
| نالە–نال | نالّە–نال | نالاندن | نالآندن |

| | | | |
|---|---|---|---|
| • باره–بار | باره–بار | باراندن | باراندن |
| قیره–قیر | قیره–قیر | قیراندن | – |
| گرمه–گرم | گرمه–گرم | گرماندن | گرماندن |
| قیژه–قیژ | قیژه–قیژ | قیژاندن | قیژاندن |
| زاره–زار | زاره – زار | زاراندن | – |

١٩٢ – له زمانی کوردی‌دا بناخه‌ی کار له رووی کاته‌وه پێوه‌ندی راسته‌وخۆی به جۆره‌کانی گه‌ردان‌کردنه‌وه نییه ، به‌لام روون‌کردنه‌وه‌یان بۆ تێگه‌یشتنه له چۆنیه‌تی گه‌ردان‌کردنیان‌دا پێویسته ، ئه‌م جۆره روونکردنه‌وه‌یه واتایه‌کی گرنگ به پێوه‌ندی‌یه‌کانی کاته‌گانی کار ده‌به‌خشێت . ناوی رووداو به سه‌رچاوه‌ی دارشتنی کار ده‌ژمێردرێ . بناخه‌ی دابه‌شکردنی کار بۆ کاری رانه‌بوردووو رابوردوو تێپه‌رو تێنه‌په‌ره‌وه یاسایه‌کی گشتی هه‌یه‌و له‌گه‌ل گۆرینی هیندیك ده‌نگ تیایاندا ، له زمانی کوردی‌دا هه‌موو شێوه‌کانی کار له دووبناخه‌ی کاری‌رابوردوو . ئه‌م بناخانه له زۆربه‌ی جاردا له رووی‌دارشتنی رابوردوویه‌وه بۆ هه‌مان ره‌گی جۆراو جۆری ده‌گه‌رێته‌وه .

١٩٣ -- له هه‌ردوو دیالێکته‌کانی زمانی کوردی‌دا یه‌ك جۆره رێگه‌ی دارنشتنی بناخه‌ی کاری رابوردوو هه‌یه . بۆ وه‌ده‌ست‌هێنانی بناخه‌ی کاری رابوردوو ئه‌وه به‌سه ، که (in – و n –) له کۆتاییان‌دا لابه‌رین . پیتی (– ت ، – د ، – اَ ، – ی ، – وو ، – ر) که‌وتونه‌ته پێش نیشانه‌ی چاوگی n –) و (in – ه‌وه . ته‌نیا کاری رانه‌بوردووی (ره‌ڤین) ، (گه‌رین) ، به‌زین) نه‌بێ ، که له دیالێکتی کرمانجی ژووروودا هه‌ن‌و دوو بناخه‌ی رابوردوویان هه‌یه‌و کۆتاییان به – ی هاتووه . ره‌ڤ له ره‌ڤین ، گه‌ری له گه‌رین ، به‌زی له به‌زین . بناخه‌ی جۆری دووه‌می به‌خستنه‌سه‌ری بزوێنی (-- اَ)یه بۆ کۆتاییه‌که‌ی له شێوه‌ی (– ی‌یا) ، گه‌ری(یا) ، به‌زی(یا)

| چاوگ | | بناخه‌ی کاری رابوردوو | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| که‌تن | که‌وتن | که‌ت | که‌وت |
| دراندن | دراندن | دراند | دراند |
| کوشتن | کوشتن | کوشت | کوشت |
| کرن | کردن | کر | کرد |

| ستاندن | سەندن | ستاند | سەند |
|---|---|---|---|
| نڤیسین | نووسین | نڤیسی | نووسی |
| رەڤین | – | رەڤی/رەڤیا | – |
| پێڤان | پێوان | پیڤا | پێوا |
| کەنین | پێکەنین | کەنی/کەنیا | پێکەنی |
| کوتان | کوتان | کوتا | کوتا |
| فرین | فرین | فری/فریا | فری |
| کرین | کرین | کری | کری |
| چوون/چووین | چوون | چوو | چوو |

هەموو ئەو کارانەی ، کە بناخەیان کاری رابوردووە دابەش دەبنە سەر ئەم گروپانە :

١ – ئەوکارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – ت دێ .
٢ – ئەوکارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – د دێ .
٣ – ئەوکارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – ی دێ .
٤ – ئەوکارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – آ دێ .
٥ – ئەوکارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – وو دێ .
٦ – ئەو کارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – ر دێ .
٧ – ئەوکارانەی ، کە بناخەیان کۆتایی بە – ی/یا دێ .

زۆربەی کارەکان دەگەڕێنەوە بۆ گروپی یەکەم و دووەم ، کە کۆتایی یان بە (– ت ، – د)ی هاتووە .

هەروا بەشێکیش لەم کارانە کۆتاییان بە (– ی)و (– آ)دێت هەر هێندێکیان نەبن ، کە کۆتاییان بە (– ا)و (– وو) دێت . کۆتایی بناخەی کاری رابوردوو لە رووی شێوەوە پێوەستە بەوەوە ، کەوا سوفیکس ( – ت/ – د)یان لێ لاچووەو یەکسەر بناخەی کاری رابوردووی وەرگرتووە . دەربارەی ئەمە هێندێك دیاردەی روون و ئاشکرای راستی رێزمانی دەخریتەروو ؛ یەکەم :

یەك بوونی ئەم جووتە کارانە لە دیالێکتی ژووروورا لە رووی واتاوە ، بۆ وێنە : – دروون – درووتن ، جوون – جووتن ، دین ، دیتن ، گوهێرین – گوهارتن ، گۆن – گۆتن هتد . .
دووەم : لە دیالێکتی ژووروودا لە بناخەی کاری رابوردوودا کۆمەڵێك کار هەن ، کە دەنگی

(د)یان تێدا لاچووە ، بەلام لە دیالێکتی خوارووا هەر ماوەتەوەو وەکو نیشانەیەکی کاری رابورروو بەکاردێت ، بۆ وێنە : کر-کرد ، بر-برد ، مر-مرد ، خوار-خوارد .

دەربارەی کاری کۆتایی هاتوو بە (-ی) هەر هەمان شت دەتوانین بڵێین ، ئەم(-ی) دەکەوێتە نێو رەگی کارەو لە رووی شێوەوەش(-ت/-د)یان تێدا لاچووەو دەبێتە کۆتایی بناخەی کاری‌رابوردوو . ئەمانە بەراوردبکە :

(کری-کوردی ، خرید-فارس) ؛که لە (کرین)و (خریدن)ەوە دارێژراون .

(بری-کوردی) (بورید-فارسی) ؛ کە لە (برین)و (بوریدن)ەوە وەرگیراون .

(دا-کوردی ، داد-فارسی) ؛ کە لە (دان)و (دادن)ەوە دارێژراون .

(بوو-کوردی ، بود-فارسی) ، کە لە (بوون‌وبودن)ەوە وەرگیراون .

دارنشتنی بناخەی کاری رانەبوردوو

١٩٤ - لە دیالێکتی ژووروو خواروودا بناخەی کاری رانەبوردوو یەك جۆرە دارنشتنی‌هەیە . جیاوازی دیالێکتی تەنیا لە فۆنۆتیکی رەگی کارەکانەوە بەرچاودەکەوێت . لە رووی چۆنیەتی دارشتنی کار لە زمانی کوردی‌دا دوو چەنشنە رۆهێنانمان هەیە : -

کاری رەگی چەسپیوو کاری رەگی نەچەسپیو کاری دارێژراوو رەگی کاری کۆتایی هاتوو بە (-ین)و (-آن)و هی‌دی ، کە لە رووی رەگەوە چەسپیون دابەش دەبنە سەر چەند بەشێك ، کە بناخەی کاری رانەبوردوویان لە بناخەی کاری رابوردووەوە وەرگیراوە .

کاری رەگی نەچەسپیو ، کە هۆی نەچەسپیوی بۆ گۆرینی فۆنۆتیکی‌و باری مێژوویی دەگەرێتەوە هەروا بۆ تایبەتێتی دیالێکتی ، کە چەند جۆرە کارێك دادەرێژنت .

١٩٥ - بناخەی کاری رانەبوردووی ئەو کارانەی ، کە کۆتاییان بە (-ین ،-آن)-تن ، -دن) هاتووە لە بناخەی کاری رابوردووەوە وەردەگیرێن‌و ئەم پیتانەی لیێ لادەچیێ (-ی ،-ی/یا) -اْ ،-ت ،-د) ئەم کارانەی خوارەوە بناخەی کاریان چەسپیوە :

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجي | سۆرانی | کرمانجي | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| أ ترسین[1] | ترسین | ترس- | ترس- | ترس- | ترس- |
| لەرزین | لەرزین | لەرزی- | لەرزی- | لەرز-- | لەرز |

(١) لە دیالێکتی خوارووداکاری ترسین . لەرزین‌و کۆلین‌و هی‌دی شێوەیەکی دیشیان هەیە . کە بە (-آن) کۆتایی دێت ، ترسان . لە رزان . کولّان)و هۆی دارشتنیشیان لە بناخەی کاری رانەبوردووەوەیە وەکو کاری رابوردوو .

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| – | کوڵین | – | کوڵی– | – | کوڵ |
| گەرین | – | گەری(یا)– | – | گەر– | – |
| فرین | فرین | فری(یا)– | فری– | فر– | فر– |
| کەنین | پێکەنین | کەنی(یا)– | پێکەنی– | کەن– | پێکەن– |
| دزین | دزین | دزی– | دزی– | دز– | دز– |
| کرین | کرین | کری– | کری– | کر– | کر– |
| زانین | زانین | زانی– | زانی– | زان– | زان– |
| ئاژۆتن | ئاژۆتن | ئاژۆت– | ئاژۆت– | ئاژۆ– | ئاژۆ– |
| ڕژین | – | ڕژی– | – | ڕژ– | ڕژ– |
| – | لێسین | – | لێس– | | لێس– |
| شغولین | – | شغولی | | شغول | – |
| | ناسین | – | ناس– | – | ناس– |
| خەبتین | – | خەبتی– | – | خەبت | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ب-کوتان | کوتان | کوتا– | کوتا– | کوت– | کوت– |
| پێڤان | پێوان | پێڤا– | پێوا | پێڤ– | پێو– |
| کۆلان | | کولا– | – | کول– | – |
| – | کێلان | – | کێڵا | – | کێڵ– |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ج گرتن | گرتن | گرت– | گرت– | گر– | گر |
| | کەوتن | – | کەوت– | – | کەو– |
| | بزووتن | – | بزووت– | – | بزوو– |
| فرۆشتن | | فرۆشت– | – | فرۆش– | – |
| – | دانشتن | – | دانشت– | – | دانش |
| سووتن | | سووت– | | سوو– | – |
| ئاژۆتن | ئاژۆتن | ئاژۆت– | ئاژۆ– | ئاژۆ– | |
| جووتن | – | جووت– | | جوو– | – |
| درووتن | – | درووت | – | دروو | – |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | – | خەوتن | – | خەوت | – | خەو |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| د – | مردن | – | مرد– | – | مر– |
| – | سەندن | – | سەند– | – | سەن– |
| – | خوێندن | – | خوێند– | – | خوێن– |
| – | کەندن | – | کەند– | – | کەن– |
| – | ژەندن | – | ژەند– | – | ژەن– |

١٩٦ – زۆربەی بناخەی کاری رانەبوردوو بەکەمکردنەوەی وەیا کۆرینی کۆتایی بناخەی کاری رابوردوو دادەرێژرێ . ئەم کارانە ریزە کارێك لە کاری نەچەسپیو پێك دەهێنن . ئەم کارە نەچەسپیوانە لە رووی دارشتن بناخەی کاریانەوە چەند جۆرێکن . هەر جۆرەش تایبەتێتی گۆرینی دەنگی رەگێکی هەیە . وەك لە خوارەوەش دابەنش کراوە :

١ – جۆری یەکەم ئەو کارانە دەگرێتەوە . کە کۆتایی بناخەکانی بە دەنکی بزوێنی دێن و هەر بە دەنگێکی بزوێنی دیش دەکۆرێن : ا/یێ . وو/وێ . ی/یێ و بزروکە/یێ . هەر بۆیەیە لە زۆربەی ئەو جۆرە کارانەدا دەنکی کەم کراوەی دەنگداری رەگ بۆ شێوەی دەنگداری دەگۆرێت .

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| ئەسپارتن | سپاردن | سپارت | سپارد | سپێر | سپێر |
| ئالاستن | – | ئالاست | – | ئالێس | – |
| ڤەشارتن | شاردنەوە | ڤەشارت | شاردەوە | ڤەشێر | شێر(ەوە) |
| هنگافتن | ئەنگاوتن | هنگافت | ئەنگاوت | هنگێڤ | ئەنگێو |
| هاتن | هاتن | هات | هات | – ی | –یێ–هێ |
| بژارتن | هەڵبژاردن | بژارت | هەڵبژارد | بژێر | هەڵبژێر |
| قەڵاشتن | – | قەڵانشت | – | قەلێش | – |
| پەلاختن | – | پەلاخت | – | پەلێخ | – |
| ئاخافتن | – | ئاخافت | – | ئاخێڤ | – |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکافتن | – | پشکافت | – | پشکێڤ | – |
| گوڤانشتن | – | گوڤانشت | – | گوڤێش | – |
| پشارتن | – | پشارت | – | پشێ | – |
| نخامتن | – | نخامت | – | نخێم | – |
| گوهاستن [٢] | گواستنەوە | گوهاست | گواست | (ەوە) گوهێز | گوێز |
| پاراستن | پاراستن | پاراست | پارست | پارێز | پارێز |
| – | نواردن | – | نوارد | – | نوێر |
| – | ئاراوتن | – | ئاراوت | – | ئارێو |
| – | بواردن | – | بوارد | – | بوێر |
| – | پاڵاوتن | – | پاڵاوت | – | پاڵێو |
| – | پەرچاوتن | – | پەرچاوت | – | پەرچێو |
| ب – | نووستن | – | نووست | – | نوێ [٣] |
| جـ- بهیستن | بیستن | بهیست | بیست | بهێ | بێ [٤] |
| – | ویستن | – | ویست | – | وێ |
| د- نشکەستن | – | شکەست | – | شکێ | – |
| هـ- روونشتن | – | روونشت | – | روونێ | – |
| رستن | رستن | رست | رست | رێس | رێس |
| – | رشتن | – | رشت | – | رێژ [٥] |
| – | لیستن | – | لیست | – | لێس |

---

(٢) دەتواندرێ کاری گوهاستن‌و پاراستن لەگەڵ جۆری پێنجەمیش دابندرێ لەم دوو کارانەدا دەنگانی س/ز جێگۆرکێ دەبن .

(٣) کاری نووستن لە بەشە دیالێکتی بادینان‌دا بەرامبەرەکەی نڤستن‌و لە بەشە دیالێکتی کوردی سوری (نڤین)ە ، بناخاە کاری رابوردووی ئەم دوو کارە (نڤ)یەو لە بناخەی کاری رابوردووی دیالێکتی خواروا نێزیکە .

(٤) بناخەی کاری رانەبوردووی بهیستن لە دیالێکتی ژووروودا (بهێز)ە ئەم شێوەیەی بناخەکەی وا پێشان دەدا ، کە دەتواندرێ سەر بە جۆری پێنجەم بێ .

(٥) لەبە جێگۆرکێی دەنگی ش/ژ لە کاری رشتن‌دا دەتواندرێ ئەم کارە لەگەڵ گرووپی پێنجەم دابندرێ .

٢ – جۆری دووەم ئەو کارە نەچەسپیوانەی خوارەوە دەگرێتەوە . کە بناخەی کاری رانەبوردووی لە رەگی نەچەسپیوەوە دارێژراوەو لەگەڵ لەنێوچوونی دەنگی بزوێنی وەیا گۆرانی بە دەنگێکی دی : –

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| ا– گهیشتن | گەیشتن [٦] | – | گەیشت | – | گە |
| – | رۆیشتن | – | رۆیشت | – | رۆ ، روا |
| خارن | خواردن | خار | خوارد | خۆ ، خۆە | خۆ ، خوا |
| شوشتن | شوشتن | شوشت | شوشت | شۆ | شۆ |
| – | ششتن | – | ششت | – | شۆ |
| – | دووان | – | دووا | – | دوێ |
| ب– کرن | کردن | کر | کرد | | گە.. ، کا . [٧] |
| برن | بردن | بر | برد | بـ . | بە . ، با . |
| بوون | بوون | بوو | بوو | بـ . | بـ . |
| دان/داین | دان | دا | دا | د | دە ، دا |
| چوون/چووین | چوون | چوو | چوو | چ . | چ . |
| خستن | خستن | خست | خست | خ . | خو . ، خا . |

٣ – جۆری دی ئەم کارانە ، جۆرێکی تایبەتە بەو کارانەی ، کە بناخەی کاری رابوردوویان کۆتایی بە (– ا) دێت‌و لە بناخەی کاری رانەبوروودا بە (– ێ) دەگۆرێ . ئەم جۆرە گۆرینە بەزۆری لە دیالێکتی خواروودا بەرچاو دەکەوێت .

رێك‌کەوتنی بناخەی کاری رابوردووو بزوێنی رەگ لەم بەشەدا وا پێشان دەدا ، کەوا (د)یّ لە کۆتایی بناخەی کاری رابوردوودا کورت کراوەتەوە ، ئەمانە بەراورد بکە زاد – فارسی ، زا – کوردی ، سرود – فارسی سترا – کوردی هتد .

(٦) کاری گەیشتن‌و رۆیشتن دووشێوەی فۆنۆتیکی دیشیان هەیە : گەیین‌و رۆیین لە رووی دارشتنی بناخەی کاری رانەبوردوویانەوە دەگەرێنەوە سەر کاری بناخەی چەسپیو .

(٧) لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا لە جۆری (ب)دا (–ە) وەیا (–ا) دەکەونە پێش کۆتایی بناخەی کاری رانەبوردوو بە پێی دەمکانی شێوەی کارەکە .

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| زایین (زان) | زان | زا | زا | زێ | زێ |
| ستران | – | سترا | – | سترێ | – |
| رازان | – | رازا | – | رازێ | – |
| – | خووسان | – | خووسا | – | خووسێ |
| – | چەرخان | – | چەرخا | – | چەرخێ |
| – | شکان | – | شکا | – | شکێ |
| – | سووان | – | سووا | – | سووێ |
| – | فەوتان | – | فەوتا | – | فەوتێ |
| – | نان | – | نا | – | نێ |
| – | تەکان | – | تەکا | – | تەکێ |
| – | لەرزان | – | لەرزا | – | لەرزێ |

٤ – ئەو کارانەی ، کە بە یارمەتی (اندن) دارێژراون جۆرێکی تایبەتین لە جۆرەکانی کاری نەچەسپیودا . بناخەی کاری رانەبوردوو بناخەی رابوردووەوە دارێژراوەو بەلابردنی (د) کۆتایی بناخەی رابوردوودا ، لێرەدا (ا) دەگۆرێ بە (– ی) لە کرمانجی دا و بە (– ێ) لە سۆرانی دا :

(ا) ئەو کارانەی بە یارمەتی (– اندن) دارێژراون :

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| رژاندن | رژاند | رژاند | رژاند | رژین | رژێن |
| گەراندن | گەراندلە | گەراند | گەرین | گەرێن | |
| دراندن | دراندن | دراند | دراند | درین | درێن |
| خوراندن | خوراندن | خوراند | خوراند | خورین | خورێن |
| باراندن | باراند | باراند | باراند | بارین | بارێن |
| چێراندن | – | چێراند | – | چێرین | – |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| چڤاندن | چپاندن | چڤاند | چپاند | چڤین | چمێن |
| مراندن | مراند | مراند | مراند | مرین | مرێن |
| نەخشاندن | نەخشاندن | نەخشاند | نەخشاند | نەخشین | نەخشێن |
| رەڤاندن | رڤاندن | رەڤاند | رفاند | رەفین | رفێن |

ب – ئەو کارانەی ، کە (–اندن) بەشێکە لە رەگیان :

ئەگەرچی لە زمانی ئەمرۆی کوردیدا خوێندن بەکاریکی رەگی دەژمێردرێت ، بەڵام لە رووی پێك هاتنەوە مێژووسی‌یەو هەر بە یارمەتی (–اندن) دارێژراوەو بە رەگی نەچەسپیوی کاری تێنەپەرەوە لکاوە ، بۆ وێنە : شاندن ، کە هەر لەرووی مێژووەوە بە رەگی کاری چوون ، کە (چ) پێوەستەو لەگەڵ (شواندن)ی فارسی‌یەوەی بەراوردی بکە .

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| ستاندن | ساندن | ستاند | ساند | سێن | سێن |
| چاندن | چاندن | چاند | چاند | چین | چێن |
| نشاندن | – | نشاند | – | شین | – |
| خواندن [٨] | – | خواند | – | خوین | – |
| – | نواندن | – | نواند | – | نوێن |
| – | خاياندن | – | خاياند | – | خاێن |
| مان/ماین [٩] | مان | ما | ما | مین | مێن |

(٨) کاری خواندن لە دیالێکتی ژووروودا بێجگە لە شێوەی (خوین) شێوەی (خوون ، خوێن) یشی هەیە . لەناو ئەم شێوانەدا (خوون) لە هەموان زێتر بەکاردێن ، (خوین) لە بادینانو (خوێن) لە دیاربەکردا هەن ، ئەمەی دووایان لەگەڵ شێوەی بناخەی کاری رانەبوردووی دیالێکتی خوارووەدا رێك دەکەوێت بروانە بەندی ژمارە ١٩٥ .

(٩) کاری مان وەیا ماین بناخەی کاری رانەبوردووی (مین/مێن) ، کە لەگەڵ بناخەی کاری رانەبوردووی کاری ماندن ، کە (مان) لە فارسی‌دا رێکدەکەوێت ، بەڵام لە کۆنەوە یەگبوونی ئەم دووکارانە لە کوردی‌و لە فارسی‌دا سووی تێدا نیە . شێوەی بناخەی کاری رانەبوردووی ئەم کارە ئەوە روون دەکاتەوە ، کەوا ئەم کارە لەرووی دارشتنەوە بەر جۆری چوارەم دەکەوێت .

لەرووی دارنشتنی بناخەی کاری رانەبوردووەو . ئەم کارانە بۆ چۆری چوارەم دەگەرێنەوە . لەم بەشەدا کاری (مان) ، کە خۆی چاوگە کەچی لە شێوەدا وەکو بناخەی رانەبوردووە ، کەواتە چاوگەکە (– ند)ی لێ‌قرتاوە لەگەڵ (ماندن – ماند) ی فارسی‌یەوە بەراوورری یکە .

ە – ئەم گروپە ئەو کارانە دەگرێتەوە ، کە لە دارشتنی بناخەی کاری راندبوردوودا چەند دەنگێک بە ذەنگێکی نێزیگ لە خۆیان دەگۆرین ، وەگ ش/ژ ، س/ز . هو/ژ ، هو/ش .

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| کوشتن | کوشتن | کوشت | کوشت | کوژ | کوژ |
| گهیشتن | – | گهیشت | – | گهیژ | – |
| – | مشتن | – | مشت | – | مژ |
| – | رشتن | – | رشت | – | رێژ |
| – | چێشتن | – | چێشت | – | چێژ |
| – | ناشتن | – | ناشت | – | نێژ |
| – | هاویشتن | – | هاویشت | – | هاویژ |

ب – ئەو کارانەی ، کە دەنگی (س)یان تێدا بە (ز)یَ دەگۆرێت:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| گەستن | گەستن | گەست | گەست | گەز | گەز |
| لیستن | – | لیست | – | – | لیز |
| میستن | – | میست | – | – | میز[10] |
| خوەستن | خواستن | خوەست | خواست | خوەز | خواز |

حـ – ئەو کارانەی ، کە دەنگی (هـ)یان تێدا بە (ژ)یَ وەیا (ش)ی دەگۆریَ : لە بناخەی ئەم جۆرە کارانەدا دەنگی (ت)یَ ، کە دەکەوێتە بناخەیانەوە نامێنیَ . ئەم دەنگی (ی)یە هەر لە بنەرەتەوە لەگەڵ دەنگی (ە)ی هاتووە .

---

(۱۰) لە دیالێکتی کرمانجی خوارووش‌دا چاوگی میستن بۆ هەمان مەبەستی لەژووروودا روونکراوەتەوە بەکاروێت‌و بناخەی کاری رانەبوردووش بە هەمان شێوەی کرمانجی ژووروو دادەرێژرێت . وەرگێر .

ئەم دیاردەیە لە زمانانی دی ئێرانیش‌دا هەیە :
**سوختن – .ﺭز ، میختن – میز ، ریختن – ریز ، الیختن – الیز ، فروختن – فرونش .**
لەم گرویەدا کاری (ریتن)و (رێتن)و (اڤیتن)و هی‌دی دەنگی (ه)یان تێدا نەماوە . لە بەشە دیالێکتی ناوچەی مۆکادا دەنگی (هـ)سی تێدا هەرماوە :
**ریهتن ، رێهتن ، ئاڤیهتن وهی‌دی . . . ئەم جۆرە کارانە بە دیالێکتی ژووروودا تایبەتە :**

| چاوگ | بناخەی کاری ابوردوو | بناخەی کاری رانەبوردوو |
|---|---|---|
| ریتن (ریهتن) | ریت (ریهت) | رێژ- |
| رێتن (رێهتن) | رێت (رێهت) | رێژ |
| مێتن (مێهتن) | مێت (مێهت) | مێژ |
| سۆتن (سۆهتن) | سۆت (سۆهت) | سۆژ |
| کۆتن (کۆهتن) | کۆت (کوهت) | کۆژ |
| ئاڤیتن (ئاڤیهتن) | ئاڤیت (ئاڤیهت) | ئاڤێژ |
| دۆتن (دۆهتن) | دۆت (دۆهت) | (دۆش) |
| فرۆتن (فرۆهتن) | فرۆت (فرۆهت) | فرۆش |

٦ – ئەو کارانەی ، کە بناخەی کاری رابوردووو رانەبوردوویان وەکو یەکن : لە ئەنجامی لەنێوچوونی (– ت) ، (– د) لە کۆتایی بناخەی هێندیك کاردا بناخەی کاری رابوردووو رانەبوردیان وەکو یەکیان لێهاتووە :

| چاوگ | | بناخەی کاری رابوردوو | | بناخەی کاری رانەبوردوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| دروون | دروون | درو (ت) | دروو | درو | درو |
| جوون[11] | جوون | جور (ت) | جور | جور | جور |
| سوون | سوون | سور (ت) | سور | سور | سور |
| – | فەرمون | – | فەرمرو | – | فەرمرو |

(١١) لە دیالێکتی کرمانجی خوارووداکاری (جووین‌یش) بەرامبە بەکاری (جوون) بەکاروێت ، کەبناخەی کاری رابوردووی (جووی)و بناخەی کاری رانەبوردووی (جوو)ە ، وەرگێر.

ئەم کارانە لە دیالێکتی خوارووردا شێوەی دیشیان هەرلە ، کە کۆتاییان بە (- تن)دێت . درووتن ، جووتن ، سووتن . ئەم کارانەی دواین لەرووی دارنشتنی بناخەی کاری رانەبوردوو یانەوە دەگەرێنەوە سەر کاری چەسپیو .

٧ - ئەو کارانەی ، کە لە رەگی جیاجیا دادەرێژرێن :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دیتن | دیتن | دی | دی(ت) | بین | بین |
| - | بینین | - | بینی | - | بینی |
| هشتن | هێشتن | هشت | هێشت | هێل | هێل |
| گۆتن | ووتن | گۆ(ت) | ووت | بێژ | لێ |

١٩٧ هێندێك بناخەی کار لەرووی فۆنوتیکەوە جیاوازن ، هۆیەکنشی بۆ هەروو دیالێکتەکە دەگەرێتەوە ، بۆوێنە : -

| | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| ١ - | نڤیسین | نووسین |
| | بهێرین | نوارین |
| | گوهێرین | گۆرین |
| | گهیشتن | گەیشتن |
| | گوڤاشین | گوشین |
| | گوهاستن | گواستنەوە |
| | نڤین (نڤیستن) | نووستن |
| | پەرچڤین | پەرچاوتن |
| ب - | هنارتن | ئەنگاوتن |
| | نهارتن | ناردن |
| | ئانین | هێنان |
| | ئاڤیتن | هاویشتن |
| جـ - | دروون (درووتن) | دروون |
| | جوون (جووتن) | جوون |
| | سوون (سووتن) | سوون |
| | دین دیتن | دیتن |

١٩٨ – ئەم بابەتەی لەمەوبەر باسکرا ئەوە پیشان‌دەدات ، کەوا لە دیالیکتی کرمانجی‌و سۆرانی‌دا حەوت جۆرە بناخەی کاری نەچەسپیو هەیە بۆ دارشتن بناخەی کاری رابوردووو رانەبوردوو لە هەردوو دیالیکیەکەدا یەك جۆرە رۆهینانیان هەیە ، بە لام هیندیك کار ، لەلایەن رەگەوە لەهەردوو دیالیکتەکەدا یەکن ، لە کرمانجی ژووروودا بەر بناخەی کاری نەچەسپیووو لە کرمانجی خوارووودا بەر کاری چەسپیو دەکەون . لەنیو هەموو کارەکان‌دا بناخەی کاری رابوردوو لە بناخەی کاری نەچەسپیووەوە دادەریژرین ، بناخەی کاری رابوردووو رانەبوردووی کارەکان بۆ یەك جۆرە رەگ دەگەرینەوە .

## کاری پیکدراو

١٩٩ – مەبەست لە کاری لیکدراو لە زمانی کوردی‌دا ئەم کارەیە ، کە لەناوو کار وەیا پیشگرو کار پیك‌هاتووە . بەپیی ئەم جۆرە دارشتنە کاری لیکدراو دوو جۆرە :

١ – کاری لیکدراوی ناوی .

٢ – کاری لیکدراوی پیشگری .

زۆربەی کارەکانی هەردوو دیالیکتەکە بەر ئەم دوو جۆرە دارشتنە دەکەون .

## کاری لیکدراوی ناوی

٢٠٠ – کاری لیکدراوی ناوی لەکارو ناو دادەریژری ، هەموو کاریکی لیکدراو بەشی ناوەکەی بریتی دەبی لە ناو ، ئاوەلناو و ژمارە ، ئەم بەنشانەی ، کە بەنشی ناوی کاری لیکدراو پیکگ دین لەرووی سەربەخۆیی واتاوە یەکگ‌نین ، هیندیکیان واتایەکی سەربەخۆو تەواویان هەیە لە زمانیش‌دا بەتەنیا واتایەکی سەربەخۆ دەبەخشن . بەشیکی دی‌یان واتاو بەکارهینانی سەربەخۆیان یتیە ، بەلام ، کە لەگەل کاردا بەکاردین‌و لەگەلی‌دا واتایەکی نوی دەبەخشن ، جۆری سییەم ئەم ووشانە دەگرێتەوە ، کە باری ناوەنجی هەیە لە بەکارهاتنیدا . لەبەر ئەم جۆرە دارشتنانە هیندیگ جار وا روودەدات ، کەوا ناتواندری سنوور لەنیوان کاری لیکدراوو فریز دابندری .

کاری لیکدراوی ناوی لەرووی پیوەندی ریزمانی‌یەوە لەوانەیە جیاوازبن ئەو ناوانەی ، کە لەگەل کاری تیپەردا دین ، لە رستەدا رۆلی بەرکاری راستەوخۆ وەیا تیان‌دەگیرن . ئەو ووشە لیکدراوەی ، کە لەکاری تیپەرو ئاوەلناوەوە داریژراون بەشیوەیەکی گشتی بارو دۆخی شت وەیا گۆرینی بار دەبەخشن .

ووشەی دووەمی کاری لێکدراوی. ناوی برێتی دەبێ لەم کارانەی خوهرەوە :کرن (کردن–سۆرانی) ، دان ، خستن ، برن (بردن – سۆرانی) ، ئانین (هێنان –سۆرانی) .
گرتن ، کشاندن (کێشاندن – سۆرانی) ، دیتنو کاری تێنەپەری بوون ، کەتن (کەوتن – سۆرانی) هاتن ، چوون ، مانو هتد .

لەنێو ئەم کارانەی ژووروودا کاری بوونو کرن (کردن –سۆرانی) بەزۆری بەکاردێل .

ئەم کارانەی ژووروو لەکاتی بەکارهاتنیاندا بۆ ووشەی لێکدراو واتای سەرب خۆی خۆیان نابەخشن ، بەڵکو تایبەتیتی رێچکەی رووداو دەست نیشهن دەکەنر ووشەی یەکەم واتای ووشە لێکدراوەکە بەدیاردەخات .

### دارشتنی کاری لێکدراو بە یارمەتی کاری کرن (کردن – سۆرانی)

٢٠١ – کاری لێکدراوی ناوی بەیارمەتی کرن (کردن – سۆرانی) بەشێوەیەکی زۆر فراوان بەکاردێتو بێ ئەوەی بەواتاوە پێوەست بێتو وەکو کارێکی تێپەر گەردان دەکرێت :

**ناو + کرن (کردن)**

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| زێر کرن | – |
| ئاڤ زیڤکرن | – |
| زیڤکرن | – |
| زنجیرکرن | زنجیرکردن |
| نال کرن | نال کردن |
| خرابی کرن | خرابی کردن |
| ترالی کن | ترالی کردن |
| بێکاری کرن | بێکاری کردن |
| لاقردی کرن | گەمەکردن |
| تەماشا کرن | تەماشا کردن |
| قسەکرن | قسەکردن |
| داوا کرن | داوا کردن |
| شەرکرن | شەرکردن |

| دۆستێتی کرن | دۆستێتی کردن |
|---|---|
| ماڵئاوایی کرن | ماڵئاوایی کردن |

٢ – تەنێ لە دیالێکتی ژووروودا ئەوە بەرچاودەکەوێت ، کەوا ناوی رووداوی بەشداربووی لە دارشتنی کاری لێکدراودا کۆتایی بە (–ین) بێت :
(پیرۆبین‌کرن ، پرتین‌کرن ، نالین کرن ، قیژین‌کرن ، پستین‌کرن .

٣ – ئاوەڵناو + کرن (کردن)
لەم جۆرە دارشتنەدا لە دیالێکتی خوارووداپاشگری (–ەوە) دەکەوێتە کۆتایی کاری (کردن) ەوە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| رەش‌کردن | رەش‌کردنەوە |
| تژی‌کرن | پڕکردنەوە |
| خوارکرن | خوارکردنەوە |
| هوورکرن | ووردکردنەوە |
| سارکرن | سارد کردنەوە |
| ئاشکەرا کرن | ئاشکەرا کردنەوە |
| بەلاڤ‌کرن | بڵاو کردنەوە |
| وونداکرن | وون کردنەوە |
| سست‌کرن | سست‌کردنەوە (×) |

٤ – دووبارەکردنەوە + کرن (کردن)
کاری دارێژراو لە دووبارەکردنەوەو کاری کرن (کردن) واتای جیاکردنەوە ، تاکایەتی ، درێژی ، کورتی ، هێزی رووداو دەبەخشێت . واتای هەر ووشەیەکی لێکدراو بەو ووشە دووبارەکراوەوە پێوەستە ، کە ووشە لێکدراوەکەی لێ‌دارێژراوە ، بۆیە کارەکانی ئەم بەشە ئەم گروپانەی خوارەوە دەگرێتەوە .

---

(×) – لە دیالێکتی کرمانجی خوارووداپ مەرج نیە لە هەموو بارێکدا پاشگری (–ەوە) بەکردنەوە بلکێت ، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی لەو بارانەدا پێوەی دەلکێت ، کە واتای دووبارەکردنەوەی رووداو دەبەخشێت ، بۆ وێنە هەروەکو لە کرمانجی ژووروو دەگوترێ (رەش‌کردن ، پڕکردن ، خوارکردن ، وون‌کردن . . . (وەرگێر) .

ا - ئەو کارە لێکدراوانەی ، کە بە یارمەتی کاری کرن (کردن) و ناوی دووبارەکراوە داڕێژراون ، سوفیکسی (-ی ،-کی) دەکەوێتە نێوان ناووکارەکەوە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| هور-هوری کرن | وورده-وورده کردن |
| رەنك-رەنگی کرن | رەنگە-رەنگە کردن |
| زیتول - زیتول کرن | لەتە-لەتە کردن |
| زاخ-زاخ کرن | زاخ-زاخ کردن |
| قول-قولکی کرن | کون-کون کردن |

ب - ئەو کارە لێکدراوانەی ، کە ناوە دووبارەکراوەکانیان بە یارمەتی بزوێنی (-ە) لێك دەدرێن :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| نالە -نال کرن | نالّە-نالّ کردن |
| پستە - پست کرن | پستە-پست کردن |
| تەقە-تەق کرن | تەقە-تەق کردن |
| گرمە-گرم کرن | گرمە-گرم کردن |
| ڤزە-ڤزکرن | وزە-وز کردن |
| ئەوتە-ئەوت کرن | ئەوە-ئەو کردن |
| خرپە-خرپ کرن | خەرپە-خەرپ کردن |
| شربە-شرب-کرن | شەربە-شەرپ کردن |
| قیژە-قیژکرن | قیژە-قیژکردن |

ە - بناخەی کار + کرن (کردن)

لە دیالێکتی ژووروودا کاری لێکدراو لە بناخەی هێندێك کاری ڕانەبوردووەوە دەدەرێژرێت ،لەم بارەدا واتای کارەکە ناگۆڕێت

| کاری لە رەگ داڕێژراو | بناخەی کاری ڕانەبوردوو | کاری لێکدراو |
| --- | --- | --- |
| ڕێتن | ڕۆ | ڕۆکرن |

| | | |
|---|---|---|
| قيژين | قيژ | قيژكرن |
| ميّتن | ميژ- ،مژ | مژكرن |

## دارشتنى كارى ليّكوراو بەيارمەتى كارى (بوون)

٢٠٢ – كارى ليّكدراوى ناوى لە ئاوەلّناوو كارى (بوون)ەوە دادەريّژريّت ، ئەم جۆرە كارانە واتاى جۆراو چۆنيەتى كارو گۆرانى لە باريّكەوە بۆ باريّكى دى دەبەخشيّت .

١ – كارى ليّكدراو لە ئاوەلّناوى چۆنىو كارى بوون دادەريّژريّت ، لە سۆرانىدا پاشگرى (-/وە) بەكۆتايى كارە ليّكدراوەكەوە دەلكيّت :

| كرمانجى | سۆرانى |
|---|---|
| رەش‌بوون | رەش‌بوونەوە (*) |
| ساخ بوون | ساخ‌بوونەوە |
| جودا بوون | جودا بوونەوە |
| كۆر بوون | كويّربوونە (-كۆربوون-يش‌دەلّيّن ،وەرگيّر) |
| سڤك‌بوون | سووك بوونەوە |
| ئازا بوون | ئازا بوونەوە |
| رەحەت بوون | رەحەت بوونەوە |
| بلندبوون | بەرزبوونەوە(-بلندبوون-يش دەلّيّن ، وەرگيّر) |
| تژى‌بوون | پر بوونەوە |

٢ – كارى ليّكدراو لە دووبارەكردنەوەى ئاوەلّناوو ناو و ليّكدانى لەگەلّ (بوون)دا دادەريّژريّت ، ئەم جۆرە كارانە واتاى دووبارەكردنەوەو بەهيّزى رووداوەكە دەبەخشن :

| كرمانجى | سۆرانى |
|---|---|
| هورر-هوورى بوون | ووردە-ووردە بوون |
| رەنگ-رەنگى بوون | رەنگا-رەنگ بوون |
| قول-قولى بوون | كون-كون بوون |

(*) – لە دياليّكتى كرمانجى خواروودا (بوون) لەم بارانەى دياليّكتى ژووروودا بەبىّ پاشگرى (-وە)ش بەكاردێت . رەش‌بوون . ساخ‌بوون . جودابوون ، كويّربوون ، سووك‌بوون . . . وەرگيّر .

| | |
|---|---|
| پارچە-پارچە بوون | پارچە-پارچە بوون |
| پرتی-پرتی بوون | لەت - لەت بوون |

٢٠٣ - ئەو کارە لێکدراوانەی ، کە لەکاری (بوون)و (کرن) بە یارمەتی ئەو ووشانەی ، کە بەتەنیا واتای سەربەخۆ نابەخشن و هەروا بەتەنیا بەکاریش نایەن دادەرێژرێت بەر گروپێکی سەربەخۆ دەکەون ئەو ووشانەی ، کە واتای سەربەخۆ دەبەخشن لەوانەیە بەرناو وەیا ئاوەڵناو بکەون و لەگەڵ کاری (بوون)دا کاری لێکدراوی تێنەپەر و لەگەڵ کاریکردندا کاری لێکدراوی تێپەر رۆدەهێنن . هێندێك جار لە سۆرانیدا ئەم جۆرە کارانە بە یارمەتی پاشگری (-ەوە) شەوە لێك دەدرێن :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| هینبوون | فێربوون |
| هینکرن | فێرکردن |
| بەلاڤبوون | بلاوبوونەوە |
| بەلاڤ کرن | بلاو کردنەوە |
| ئاڤابوون | – |
| ئاڤا کرن | – |
| – | خر بوونەوە (×) |
| – | خر کردنەوە |
| – | ئاوەڵە بوونەوە |
| – | ئاوەڵە کردنەوە |
| – | راو بوونەوە |
| – | راو کردنەوە |
| کۆمبوون | کۆ بوونەوە |
| کۆمکرن | کۆ کردنەوە |
| شرۆکرن | شر کردن |
| ماچکرن | ماچکردن |

(×) - لە دیالیکتی کرمانجی خوارووودا ووشەی خرِ بەتەنیا واتا بەخشە ، وەرگێر.

| | |
|---|---|
| ئالۆزكرن | ئالۆزكردن |
| ووندا كرن | وونكردن |
| پارڤەكرن | دابەش كرن |
| زەوتكرن | داگيركردن |

### كارى لێكدراو بەيارمەتى كارى يارمەتى دەرى دى

٢٠٤ – ئەم كارانەى خوارەوەش هاوبەشى دارشتنى كارى لێكدراو دەكەن ، بەلاّم رادەى بەكارهێنانيان لەچاوكارەكانى پێشوو كەمترە :

هاتن ، دان ، ئانين (هێنان –سۆرانى) ، برن (بردن – سورانى) ، خستن ، كەتن (كەوتن – سۆرانى ، گرتن

| كرمانجى | سۆرانى |
|---|---|
| دەست‌خستن | دەست‌خستن |
| بير ئانين | بير هێنان |
| بير هاتن | بير هاتن |
| نيشان‌دان | نيشان‌دان ، پيشان‌دان |
| خاترگرتن | خاترگرتن |
| گرێ‌دان | گرێ‌دان |
| نەخوەش‌كەوتن | نەخۆش‌كەوتن |
| رێ برن | رێ بردن |
| جاب‌دان | وەلاّم‌دان |

زۆربەى ئەو كارە لێكدراوانەى ، كە لەسەروە باسكران بەلێكدانيان كارێكى فرێزيۆلۆژى پێك دەهێنن .

| كرمانجى | سۆرانى |
|---|---|
| جى‌گرتن | جى‌گرتن |
| رێ‌گرتن | رێ‌گرتن |
| رێ‌كەوتن | رێ كەوتن |
| تا كەوتن | تا كەوتن |
| دەست كەوتن | دەست‌كەوتن |

٢٠٥ بەشێك لە كاری لێكدراو بە یارمەتی ئەمانە دادەڕێژرێت ، ناو ، ئامراز ، پێشگر ، جیٚناو ، پاشكۆی ئامراز و كاری یارمەتی دەر .

لە بەكارهێنانی ئەمانەدا چەند جۆرە كارێكی لێكدراو رۆدەهێڵدرێت ، بەڵاٚم ناو ، جیٚناوی خۆیی بە بەشی سەرەكی ئەم دارشتنە دەژمێردرێن كە دۆخی خۆیەتی پێك دەهێنن و لە لێكدانی كارو ئامرازو پاشكۆی ئامرازو پێشگر رێچكەی رووداو پێشان دەدرێت .

كاری لێكدراوی ئەم جۆرە دارشتنانە بە لێكدانێكی چەسپیوو دەژمێردێت وەیابە دارشتنێكی ئیدیۆمی دەدرێتە قەڵەم ، كە شیكردنەوەیان لەم كارەی ئێستەدا بەدیاردەكەوێت .

بە پێی جۆراو جۆری ئەو بەشانەی ، كە هاوبەشی دارشتنی كاری لێكدراوە كە دەكەن دەتوانین دابەشیان بكەینە سەر ئەم گروپانەی خوارەوە :

١ -- كاری لێكدراو لە ناو ، جیٚناوی خۆیی وەیا جیٚناوی تێكرایی :

| كرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| خوە ووندا كرن | خۆ وون كردن |
| خوە ساخ كرن | خۆ ساخ كردن |
| خوە دوور خستن | خۆ دوور خستنەوە |
| هەڤ ماچ كرن | یەكتر ماچ كردن |
| راستی هەڤ هاتن | تووشی یەكتر هاتن |

٢ - كاری لێكدراو لە ئامراز ، ناووكار

| كرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ژ دەست چوون | لە دەست چوون |
| ژ بیر چوون | لە بیر چوون |
| ژ پاش كەتن | بە پاش كەوتن |
| ب دەست كەتن | بە دەست كەوتن |
| ژ هش چوون | لە هۆش چوون ، لە تاسەوە چوون . |

٣ - كاری لێكدراو لەناو ، ئامرازی لێكدراو - پێشگرو كار

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| ئاگا لیٚبوون ، گو لیٚبوون | ئاگا لیٚبوون |
| دەست پیٚکرن | دەست پیٚکرن |
| چاڤ پیٚکەتن | چاو پیٚکەوتن |
| تۆلە ژیٚستاندن | تۆڵە لیٚسەندن |

### پیٚشگرو دارشتنی کاری داریٚژراو بە یارمەتی پیٚشگر

۲۰٦ - لەزمانی کوردیدا بۆ دارشتنی کاری داریٚژراو کۆمەلیٚك پیٚشگر هاوبەشی ئەم دارشتنە دەکەن ، کە لە بنچینەی جیاجیاوەوەیە بۆ باری جۆراو جۆریش بەکاردیٚن .

لە زمانی ئەمرۆی کوردیدا پیٚشگری لیٚکدراوی جۆراو جۆر لەگەلّ رەگێ وەیا کاری داریٚژراو بە هۆیەکی سەرەکی دارشتنی کاری لیٚکدراو دەژمیٚردریٚ ، باوەکو دارشتنی کاری لیٚکدراو بەیارمەتی پیٚشگر هەتا ئیٚستە بە تەواوی لیٚ نەکۆلّدراوەتەوە ، بۆویٚنە لە بەرهەمی ریٚزمانی ئا . خودسکۆ ، س . س .و ئا سوچین ، پ . بەیدار ، لەو کارانە نەکۆلّدراوەتەوە ، کە بەهۆی پیٚشگرەوە دادریٚژریٚت .

لە بەرهەمی نی . سۆن ، ر . جاردن ، ل . فۆسومو نووسەری دی باسی پیٚشگر بە شیٚوەیەکی کورت و گشتی لە دارشتنی کاری داریٚژراودا باسکراوە ، لەو پیٚشگرە داریٚژراونەی لە بەرهەمەکانیاندا نیٚویان هیٚناوە ئەمانەن :

(هەلّ -وەیا هل- ، بەر ، وە - ،ڤە - ، دەر- ، دا- ، وەر- ، تیٚ- ، پیٚ - ، لیٚ-) ، کە ووتویاج ئەم پیٚشگرانە هاوبەش دارشتنی کاری داریٚژراو دەکەن ، ریٚچکەی رووداوەکەی دەستنیشان دەکەن .

ف . یوستی یەکەمین هەولّی ریٚك خستنی زانستی داوە بۆ پیٚشگر ، نیٚوبراو پیٚشگری دابەش کردۆتە سەر پیٚشگری جیاکەرو پیٚشگری جیانەکەر . دەربارەی پیٚشگری جیاکە ئەم پیٚشگرانەی نووسیوە : (دا- ،را- ، رازیٚ ، روو - ڤە- ، وەر- ، ور-)و بۆ پیٚشگری جیانەکەریش ئەمانەی ریٚزکردووە : هل- ، هن- ، هە- ،نە- ، پیٚ- ، بۆ- ،بە-) لەپالّ ئەمانەشدا پیٚشگری لە زمانەئیٚرانییەکانی دی بە ویٚنە هیٚناوەتەوە . ئەم جۆرە دابەشکردنەی پیٚشگری جیاکەرو جیانەکەر بۆ خزمەت و راژەی ف . یوستی دەگەریٚتەوە ، لیٚرەدا پیٚویستە ئەوە بوتریٚت ، کەوا ئەم جۆرە دابەشکردنەش کەم و کورتی تیٚدا هەیە ، بۆ ویٚنە لە بەشی پیٚشگری جیانەکەردا باسی پیٚشگری هەلّ (هل) دەکات ، کە لە راستیدا بەر جیاکەر دەکەون ، هەروا

لەهەمان گروپەدا باسی (بۆ) و (بە) وەکو پێشگر دەکات ، کە خۆیان لە ڕاستیدا ئامرازن .

ئەو وێنانەی ، کە بۆ ڕوونکردنەوەی هێناونەتەوە زیاتری ئەوانە دەگرێتەوە ، کە گۆ کردنێکی هاوبەشیان لەبەرکارهێنانیدا (ب) دا هەیە .

ئەوەی ، کە دەربارەی شێوەی (بۆ)ی نوسیوە ، وەك پێشگرێکی جودای لە قەڵەمداوە ، کەچی خۆی یان دەبێ ئامراز وەیا شێوەیەکی پارتیکلی (ب –) بێت .

لە بەشی پێشگری جودادا ف . یوستی شێوەی (ور–ڤەر)ی داوە ، هەروا شێوەکانی دی پێشگری (وەر)ی وەکو (وەل) ، کە لە کرمانجی ژووروودا هەیە باسکردووە . وەرگەڕدانو وەلگەڕاندن بەراوردبکە . بێجگە لەوەش ف . یوستی ووشەی (ڕازێ)ی لەگەڵ پێشگری جودادا باسکردووە .

کە خۆی شێوەی کاری فەرمانە وەیا بناخەی کاری ڕانەبوردووی چاوگەی (ڕازان)ە . ف .یوستی (ڕازێ)ی لەگەڵ (فراز)ی زمانی فارسی نوێدا بەراورد دەکات . لە زمانی کوردیدا هەڤراز (چوون هەڤراز – بەراوردبکە) بەرامبەر بە (فراز) .

ج . ئیدمۆنس لەو ووتارەیدا کە لە ئامرازو جێناوی لکاو لە دیالێکتی خوارووودا دەکۆڵێتەوە باسی پێشگری نەسادە دەکاتو دەنووسێ پێشگری (لێ ، پێ ، تێ) وەکو پێشگری (پێدا ، پێوە ، تیوە) لێکدراوە . نووسەر وینەیەکی باشی لەو پێشگرانە هێناوەتەوە ، کە بەجیاو بە لکاوی بەکارهاتووە . ( .ن . مەکەنزی باسی پێشگری سادەی (دا ،دەر ، هەل ،را ،وە) و پێشگری لێکدراوی (پێوە ، لێوە ، تێوە ، پێدا ، تێ ، پێ ، لێ ، لێك ، تێك ، پێك) دەکات .

٢٠٧ – پێشگر لە زمانی کوردیدا لەرووی بناخەو بنچینەوە دابەش دەکرێنە سەر کۆنو نوێ . لەرووی دارشتنەوەش سادەو نەسادەیەو لەلایەن بە کارهێنانەوە جوداو ناجودایە .

لەسەر بنچینەی سەرنجەکانی ئەمرۆ و گەران لەنێو کەرەستەی کۆنی دیالێکتی خوارووودا پێشگرێکی نەسادە زۆر بەرچاوەدەکەوێت ، کە لە کرمانجیو سۆرانیدا لەرووی پەیدابوون واتاو ئەرکەوە یەکن .

پێشگری سادە وەك ، دا ،را ، ڤە ،هل (هەل) ،سەر ،بەر ، پاش ، ناڤ ، پێش ،بن ،ژێر .

پێشگری نەسادە وەك ، پێ ،تێ ،لێ ،ژێ ، تێرا ، پێڤا (پێوە) ،پێدا ، سەررا ، ناڤرا ، بەررا ، سەردا ، پێشدا ،پاشدا ،لەڤ ،–پەڤ ، ژەڤ ، تەڤ ، لێك ، پێك ، تێك .

پێشگری نەسادە لەرووی تایبەتێتی دیالێکتیو دارشتنییەوە دابەش دەبێتە سەر :

ا – لیٚ ، پیٚ ، تیٚ ، ژیٚ

ب – لەڤ ، پەڤ ، تەڤ ، ژەڤ .

جـ – سەررا ، بەررا ، ناڤدا ، بنرا ، رەخرا ، رەخدا ، شووندا ، پێشدا ، پاشدا ، بندا ، سەردا .

د – پێڤا (پێوە – سۆرانی) ، پێدا ، تێرا .

هـ – لێك ، پێك ، تێك .

پێشگری سادەو نەسادە لەرووی بەکارهێنانەوە بەپێشگری جودا دەژمێردرێن ، بنچینەیان لە کەرەستەی کرمانجی ژووروودا ئاشکرایەو تایبەتێتی وەکو پێشگرێکی نەجودا بە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویەوە پێوەستە .

## پێشگری لکاو

٢٠٨ – پێشگری (ni ، ا ، هن (هەن) – ئەن ، ب – ، تە–) بەر جۆری لکاو دەکەوێت .

ئەم پێشگرانە لەگەڵ کار بەکاردێن ، لەرووی دارشتنو واتاوەش بوونەتە بەشێك لەو بەرادەیەك لە گەردانکردنیشدا لێی جیانابێتەوە . بۆ لێکۆڵینەوەی پراکتێکی زمانەوانی هیچ واتایەك نابەخشنو ناتواندرێ بە دوورو درێژی هەر یەکەیان بەتەنیا باسبکرێن ، گەرچی باسکردنی هەر یەکێك لەمانە واتایەکی گرنگ دەبەخشێت بۆ گەیشتن بە روونکردنەوەی بەسەرهاتی رووداوانی زمانەوانی بۆ ئەم پێشگرانە لە کۆنەوە تا ئەمرۆ .

پێشگری لکاو لەگەڵ ئەم کارانەی خوارەوەدا لە دیالێکتی کرمانجیدا بەکاردێت :

ا – ن – (ni) : نخامتن (لەگەڵ ختماندن و ختمن)دا بەراوردی بکە . روونشتن (دانشتن – سۆرانی)

لێرەدا روو ، و ، دا بە پێشگری جۆری دووەم دەژمێردرێن . بە لاچوونیان (نشتن) دەمێنێتەوە ، کە لە کرمانجی رۆژئاوەدا بەکارنایەتو لە سۆرانیدا بۆ باڵندان بەکاردێت لە (نشتن)دا (ن –) بە پێشگر دەژمێردرێت لەگەڵ (نشستن)ی فارسی بەراوردی بکە .

ب – ئالاستن (لێستن – سۆرانی) ، لەگەڵ (لیسیدان)ی فارسی بەراوردی بکە .

جـ – هن (هەن ، –ەن) : هنارتن وەیا هەناردن (ناردن – سۆرانی) هنجراندن (هەنجراندن – سۆرانی) .

د – ب–شکافتن (پشکوتن – سۆرانی) لەگەڵ شکەفتدا بەراوردی بکە .

هـ – تە – تەمراندن لەگەڵ مراندنو تەمرینو مرنو مردندا بەراوردی بکە .

## پێشگری جودا

٢٠٩ - هەموو پێشگرێکی کۆنو نوێو سادەو نەسادە بە پێشگری جودا دەژمێردرێن

### پێشگری کۆنی سادە

٢١٠ - لە کرمانجی دا (هل - ، وەر-- ، - را- ، دا - ، فە- ، ڤێ- ، روو-)و لە سۆرانی دا (هەڵ - ، وەر - ،را ،دا) بە پێشگری کۆنی سادە دەژمێردرێن .

رۆلی کاری ئەم پێشگرانە بە واتای کارەوە پێوەستە ، کە لەگەڵی دا بەکاردێنو رێچکەی پێشان دەدەن .

٢١١ - پێشگری وەر - واتای گۆرینی بار وەیا شت دەگەیەنێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| وەرئانین | وەرهێنان |
| وەردان | وەردان |
| وەرکرن | - |
| وەرگەراندن | وەرگەراندن |

٢١٢ - پێشگری دا - واتای رێچکەی رووداو لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەبەخشێت . ئەم پێشگرە زۆر بەرهەمدارە ، باوەکو لە کرمانجیو سۆرانی دا یەکن ، بەلاًم ژمارەی ئەو کارانەی لەگەڵی بەکاردێن کەمن :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| داهشتن | داهێشتن |
| داکەتن | داکەوتن |
| دانین | دانان |
| داخستن | داخستن |
| داهاتن | داهاتن |
| داگرتن | داگرتن |

بێچگە لەم کارانەی ژووروو ئەم کارانەش لە کرمانجی خوارەوەدا لەگەڵ (دا) دا بەکاردێن :
داپالاندن (پالاندن) ، داپالین (پالین) ، داقورتاندن (قورتاندن) ، داوان (دان) ، داوەشاندن

(وەشاندن) ، داگەراندن (گەراندن) ، داگەرین (گەرین) ، دابهارین ، دابەلاندن ، دالقاندن ، دالقین . هەرسیٚ کاری هەرە دواێی بێ پێشگری (دا) بەکارنایەن .

لەسۆرانیدا ئەم کارانەش لەگەلٚ (دا-)دیٚن :

دانشتن (رونشتن - کرمانجی) ، داکولان (کولان-سۆرانی) ، کەلاندن - کرمانجی) ، داکولاندن ، دارشتن (رشتن) ، دامەزراندن ، داگیرساندن . هەرسیٚ کاری هەرە دواێی بەبێ پێشگری (دا-) بەکارنایەن .

٢١٣ - دەربارەی پێشگری (را-) ف . یوستی لەگەلٚ (فارا) ی فارسی بەراورد کردووە . پێشگری (را-) لە زمانی کوردیدا ریٚچکەی رووداو بەرەو قسەکەر وەیا لە قسەکەرەوە پێشان دەدات . واتای جۆراو جۆری لەگەلٚ ئەو کارانەدا بەدیار دەکەویٚت ، کە لەگەلٚی بەکاردیٚت . پێشگری (را-) کاری سادە دەگۆریٚت .

لە دیالیٚکتی کرمانجیو سۆرانیدا پێشگری (را-) لەگەلٚ کار بەکاردیٚت :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| راخستن | راخستن |
| راکشاندن | راکشاندن |
| راگرتن | راگرتن |
| رادان | رادان |

بیٚجگە لەم بەکارهیٚنانەی سەرەوە پێشگری (را-) لە کرمانجیدا لەگەلٚ هیٚندیٚك کاری دیشدا بەکاردیٚت :

راقەیتین ، راقەتاندن ، راپیٚچان ، راپیٚچاندن لە سورانیدا لەگەلٚ هیٚندیك کاری دیدا بەکاردیٚت .

راهاتن ، راگەیاندن ، راگەیشتن ، رامالٚین ، رامان ، راهیٚنان ، راتکاندن ، راتەکان ، راوەشان ، راوەشاندن ، راسپاردن ، رابواردن .

هیٚندیك کار لە زمانی کوردیدا هەن ، کە بەبێ (را-) بەکارنایەن :-

لە کرمانجیدا : راموسان ، راموساندن (لەگەلٚ - بوسیدن - ی فارسی بەراوردیبکە) رازان ، رازاندن .

لە سۆرانیدا : راپەرین ، راپسکان ، رابواردن .

له کرمانجی دا هێندێك کاری لێکدراو هەن ، کە بە یارمەتی ناو وەیا بناخەی کار لەگەل پێشگری (را–)و کارێك‌دا دادەرێژرێن .

راچاڤ‌کرن ، راچاڤ‌بوون ، (چاڤ) ، راراووکرن (روو) راسەرکرن (سەر)

راڤەکرن (ڤەکرن)

راپێچکران (پێچ) (پێچان)

لەم جۆرە کارانە لە دیالێکتی‌خوارووی‌دا بەرچاوناکەون ، هێندێك کاری نەسادەی دی . کە بە یارمەتی پێشگری (را–) دارێژراون لەگەلّ کاردا لە دیالێکتی کرمانجی‌و سۆرانی‌دا واتای جۆراو جۆر دەبەخشن .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| راکرن | راکردن |
| راهشتن | راهێشتن |
| رادان | رادان |

٢١٤ – پێشگری (هەر) لە ووشەی ئێرانی (ئاراچ)ەوە وەرگیراوە ، ئەم پێشگرە وەکو پێشگرێك لەگەلّ کاردا تەنیا لە کرمانجی‌دا بەکاردێت‌و لەرووی دارشتن وئەرکی‌یەوە بەرامبەر بە پێشگری (–ەوە)ی سۆرانی‌یە ، (بروانە ٢٤٨ – ٢٥٠) واتای پێشان‌دانی رێچکەی رووداو بۆ دواوە ، بۆ دەوروبەری جیاواز ، بۆ دووپات‌کردنەوەی رووداو دەبەخشێت :

ڤەکشین (کشین) ، ڤەکشاندن ، (کشاندن) ، ڤەگەرین (گەرین) ، ڤەگەراندن (گەراندن) ، ڤەکۆلان (کۆلان) ، ڤەقەتین (قەتین) ، ڤەقەتاندن (قەتاندن) ، ڤەرساندن (رساندن) ، ڤەکرن (کرن) ، ڤەهووناندن (هوناندن) ڤەگوهێراندن (گوهێراندن) ، ڤەدراندن (دراندن) ، ڤەدرین (درین) ، ڤەبرین (برین) . هیندیك کار هەن ، کە بەبێ پێشگری (ڤە) بەکارنایەن وەکو : ڤەشارتن ، ڤەجنقاندن ، (ڤەجنقین) .

٢١٥ – پێشگری هل (هەلّ – سورانی) لەرووی دارشتن‌و ئەسلەوە بە ووشەی (هێلان)ەوە پێوەستە ، رەگی ئەو ووشەیە هێل لەگەلّ پاشگری شوێنی (–ان) پێك‌هاتووە (کورران لە کوور)ەوە و (گولان لە گول) ەوە وەرگیراون بەراورد بکە) . پێشگری هل (هەلّ) جوولانی رووداني کار لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەبەخشێت .

| سورانی | کرمانجی |
| --- | --- |
| هەڵکردن | هل‌کرن |
| هەڵگرتن | هل‌گرتن |
| هەڵدان | هل‌دان |
| هەڵ کێشان | هل‌کشاندن |
| هەڵنان | هل‌ئانین |
| هەڵ کەوتن | هل‌کەتن |
| هەڵ هاتن | هل هاتن |
| هەڵ کشان | هل کشان |
| هەڵ هاویشتن | هل ئاڤتن |
| هەڵ برین | هل برین |

هێندیك کاری دیش هەن ، کە لەگەڵ (هەل)دا بەکاردێن ، لە سۆرانیدا بۆوێنە :

**هەل : هەلۆەشاندن ، هەلپەرین ، هەلپروزاندن ، هەلقولین ،**
**هەلپاچین ، هەلتوقاندن ، هەلخلیسکاندن ، هەلتەکاندن ،**
**هەلبەستن ، هەلالین ، هەلبەزین ، هەللەرزین ،**
**هەلکزلین ، هەلچەقاندن ، هەلخلیسکان ،**

ئەم کارانەی خوارەوە بەبێ پێشگری هەڵ لە سۆرانیدا بەکار نایەن :
هەڵوەشاندن ، هەڵسان ، هەڵستان ، هەڵپروزاندن ، هەڵتروکاندن ، هەڵقوڵین .
پێشگری (هل -) لە کرمانجیدا لەگەڵ ئەم کارانەشدا بەکاردێت :
هلشاندن ، هلشین ، هلقتاندن ، هلچاندن ، هلژەندن ، هلقوشین ، هلچوون .
٢١٦ - پێشگری (روو-) تەنیا لە دیالێکتی ژووروودا بەکاردێت ، کە دوو کاری لێ دادەرێژرێت ، روونشتن ، روونشتاندن .
٢١٧ - پێشگری (ڤی-) بە شێوەیەکی پێشگری (ڤە-) دەژمێردرێت ، کە تەنێ لەرووی فۆنێمەوە جیاوازن . ئەم پێشگرە هەر لە کرمانجیدا لەگەڵ سێ کاردا بەکاردێت ، ڤێکەتن ، ڤێخستن ، ڤێساندن .

## پێشگری سادەی نوێ

٢١٨ - ئەم پێشگرانە (بەر- ، سەر ، دەر ، پێش- ، پاش- ، پەی- ، دوو (دوا - سۆرانی) ، ناڤ (ناو ، نێو - سۆرانی) ، بن - ژێر-) بەر گروپەی پێشگری سادەی نوێ دەکەوێت . ئەم پێشگرانە بە تەنیاش واتا بەخشن و لە هەمان کاتیش‌دا بەر ئامراز ، پاشبەندی ئامرازو ئاوەڵکاریش دەکەونو لەگەڵ کاریش وەکو پێشگرێك رەفتار دەکەن . ئەم پێشگرانە رێچکەی رووداو دەست‌نیشان دەکەنو هێندیك جار واتای کارەکەش دەگۆرن ، کاتێ ئەم پێشگرانەی دەوری ئاوەڵکار دەگێرن دەکەونە پاش کارەوە .

٢١٩ - پێشگری (سەر ) جووڵانەوەی رووداو بەرەو سەرەوە پێشان دەداتو زۆر جاریش ئامرازی ل - ،- (لە ،لە- سورانی) بەپێش ئەم پێشگرە دەکەوێت ئەم ئامرازانە بۆ زێتر دەست نیشان کردنی رێچکەی رووداو بەکاردێن .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| سەرکەوتن | سەرکەوتن |
| لسەر رێتن | لەسەر رشتن |
| ژ سەر ئاڤێتن | لەسەر هاویشتن |
| ژ سەر گەرین | لەسەر گەران |
| ژسەر دانین | لەسەر نان |
| ژ سەر دروون | لەسەر دروون |
| ژسەر کەتن | لەسەر کەوتن |
| ژسەر نڤیسین | لەسەر نووسین |

پێشگری (سەر) دەکەوێتە دوای کارەوەو رێچکەی رووداو پێشان دەداو واتای کارەکە دەگۆرێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| کرن سەر | کردن‌سەر |
| ئاڤێتن سەر | هاویشتن سەر |
| ئانین سەر | هێنان سەر |
| کەتن سەر | کەوتن سەر |

| | |
|---|---|
| چوون سەر | چوون سەر |
| هاتن سەر | هاتن سەر |

٢٢٠ - پێشگری (دەر) رێچکەی رووداو بۆ دەرەوە پێشان دەدات

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| دەرکەتن | دەرکەوتن |
| دەرئانین | دەرهێنان |
| دەرکرن | دەرکردن |
| دەرکشاندن | دەرکێشان |
| دەرچوون | دەرچوون |
| دەرهاتن | دەرهاتن |

(دەر) دەکەوێتە دوای کاریشەوەو واتای جوولاّن بۆ دەرەوە دەبەخشێت وپاشبەندی (-ەوە)ش لە سۆرانیدا لەگەڵیدا بەکاردێت ، بەلاّم لە کرمانجیدا بەبێ پاشبەندی (-ڤ) بەکاردێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| چوونەدەر | چوون دەرەوە |
| ئانین دەر | هێنان دەرەوە |
| کشاندن دەر | کێشان دەرەوە |
| برن دەر | بردن دەرەوە |
| هاتن دەر | هاتن دەرەوە |

٢٢١ - پێشگری (بەر-)یش شێوەی جوولاّنەوە روونەدەکاتەوە ،کە ئەویش جوولاّنی ئۆبێکتەو بە گشتیش ئامرازی (ل و ژ) ، ل ،لە-سۆرانی) بەپێش دەکەوێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ژ بەر برن | لەبەر بردن |
| ژبەر ئاڤیتن | لەبەر هاویشتن |

| | |
|---|---|
| ژبەر ڕێتن | لەبەر ڕشتن |
| ژبەر چوون | لەبەر چوون |
| ژ بەر گرتن | لەبەر گرتن |
| ژبەر نڤیسین | لەبەر نووسین |
| ژ بەر کشاندن | لەبەر کێشان |
| ژ بەر کشین | لەبەر کشان |

بەر دەکەوێتە پاش کاریش‌و ڕێچکەی ڕووداو بەرەو ئۆبێکت پێشان دەدات .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئانین بەر | هێنان‌بەر |
| چوون بەر | چوون بەر |
| ئاڤێتن بەر | هاویشتن بەر |
| هاتن بەر | هاتن بەر |
| کرن بەر | کردن بەر |
| کشین بەر | کشان بەر |
| ڕێتن بەر | ڕشتن بەر |
| کشاندن بەر | کێشان بەر |

٢٢٢ – پێشگری (بن)یش ڕووداو پێشان دەدات ، کە بەرەو خوارەوەیەو بە شێوەیەکی گشتی ئامرازی ژ ، ل (لە ، لە–سۆرانی)یان بەپێش دەکەوێت . لە سۆرانی پێشگری (ژێر)یش بۆ بەکاردێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ل‌بن‌خستن | لەبن‌خستن ، لەژێرخستن |
| ژبن‌کشین | لەبن‌کشان ، لەژێرکشان |
| ژ بن‌کشاندن | لەبن‌کێشان ، لەژێرکێشان |
| ژ بن ڕێتن | لەبن ڕشتن ، لەژێر ڕشتن |
| ل‌بن‌گرتن | لەبن گرتن ، لەژێر گرتن |
| ل‌بن‌دانن | لەبن نان ، لەژێر نان |

پێشگری بن (بن // ژێر – سۆرانی) لە بەکارهاتنیدا دەتوانێ بکەوێتە دوای کارەوەش ، کە ڕێچکەی جوولاّنی ڕووداو بەرەو ژوێرێکت پێشان دەدات .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| کەتن بن | کەوتن‌بن ، کەوتن‌ژێر (٭) |
| دانین بن | نان بن ، نان‌ژێر |
| کشین بن | کشان‌بن ، کشان‌ژێر |
| ئاڤێتن‌بن | هاویشتن‌بن |
| بەردان بن | بردان‌بن ، بەردان ژێر |
| ڕێتن بن | ڕشتن بن ، ڕشتن ژێر |

٢٢٣ – پێشگری (پێش) چۆنیەتی جوولاّن بەرەو پێشەوە پێشان دەدات :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| پێش‌کەتن | پێش‌کەوتن |
| پێش‌برن | پێش‌بردن |
| پێش‌هاتن | پێش هاتن |
| پێش‌خستن | پێش‌خستن |
| پێش‌گۆتن | پێش ووتن |
| پێش‌دیتن | پێش‌دیتن ، پێش بینین |

پێشگری (پێش) دەکەوێتە دوای کارەوەش‌و هەمان واتاش دەبەخشێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| چوون‌پێش | چوون‌پێش (٭) |
| ئانین‌پێش | هێنان‌پێش |
| دانین‌پێش | نان‌پێش |

---

(٭) (٭) لەم جۆرە دارشتنانەدا لە دیالێکتی کرمانجی خوارووددا بزوێنی (ە) دەکەوێتە نێوان کارو پێشگرەوە ، بۆ وێنە دەڵێن کەوتنەبن . کەوتنەژێر ، نانەبن ، چوونەپێش ، هێنانەپێش . . . وەرگێر .

٢٢٤ – پێشگری پاش ڕێچکەی جوولآنی ڕووداوەکە بەرەو پشتەوە پێشان دەدات .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| پاش‌کەتن | پاش کەوتن |
| پاش خستن | پاش‌خستن |
| پاش‌مان | پاش مان |
| پاش چوون | پاش چوون |
| پاش کشین | پاش کشان |
| پاش برن | پاش بردن |
| پاش دان | پاش‌دان ، بۆپاشەوەدان |

پێشگری (پاش)یش بۆی هەیە بکەوێتە دوای کارەوەو جوولآنی ڕووداو بەرەو پشتەوە پێشان بدات ، ئەم بارە لە سۆرانی‌دا بەهۆی پاشبەندی (–ەوە)و بە یارمەتی ئامرازی (بۆ) دادەرێژرێت .

| | |
| --- | --- |
| چوون پاش | چوون پاشەوە ، چوون بۆپاشەوە (×) |
| خستن پاش | خستن بۆ پاشەوە |
| دان پاش | دان بۆ پاشەوە |
| برن پاش | بردن بۆ پاشەوە |
| مان پاش | مان بۆ پاشەوە |

٢٢٥ پێشگری ناڤ (ناو ، نێو – سۆرانی) ڕێچکەی ڕوودان بۆ نێوەوە دەست نیشان‌دەکات . ئەم پێشگرە لە کرمانجی‌دا بەپێش هەروا بە پاش کارەوە دەکەوێت ، بەلآم لە سۆرانی‌دا تەنیا لەیەك شوێن‌دا دەبێت ، کە ئەویش دوای‌کارە .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| ناڤ کەتن | – |
| ناڤ دانین | – |

(×) کەوتنی پێشگری پاش بۆ پشت کارەوە وەنەبێ هەر بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی بۆ و پاشبەندەکەی (–ەوە) بێت . بەڵکو بەیارمەتی بزوێنی (ە)ش دەبێت . کە دەکەوێتە نێوان کارو پێشگرەکەوە ، کە خۆشی هەمان دەورو واتای (بۆ) دەگێڕێت‌و دەبەخشێت ، وەك : چوونەپاش ، خستنەپاش ، مانەپاش بردنە پاش . . . وەرگێر .

| | |
|---|---|
| ناڤ خستن | – |
| کەتن ناڤ | کەوتن ناو (نێو) (×) |
| کرن ناڤ | کردن ناو (نێو) |
| دانین‌ناڤ | دانان ناو (نێو) |
| ئاژۆتن‌ناڤ | ئاژۆتن ناو (نێو) |
| خستن‌ناڤ | خستن ناو (نێو) |

٢٢٦ – پێشگری (پەی–) تەنیا لە کرمانجی‌دا بەکاردێت ، کە هاو واتای پێشگری دوو (دوا – سۆرانی)یە . ئەم پێشگرە رێچکەی جوولاْنی رووداو بەشوێن کەسێك وەیا شتێك‌دا دەست‌نیشان دەکات :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پەی‌چوون ، دووچوون | دوا چوون (×) |
| پەی‌خستن ، دووخستن | دوا خستن |
| پەی مان ، دوومان | دوا مان |
| پەی‌گەرین ، دووگەرین | دوا گەران |
| پەی‌کەتن ، دووکەتن | دوا کەوتن |
| پەی هاتن ، دوو هاتن | دوا هاتن |

## پێشگری لێکدراوی گرووپی یەکەم

٢٢٧ – پێشگری لێکدراوی گرووپی یەکەم (لێ ، پێ ، تێ ، ژێ) لە لێکدانی (ل – ، ب – ، د– ، ژ–) (لە ، (ە ، لە – سۆرانی)ی لەگەڵ جێ‌ناوی – ێ داڕێژراوە .

٢٢٨ – پێشگری (لێ–) رێچکەی کاریگەری رووداو بۆ بەرکار (ئۆبێکت) پێشان دەدات :

---

(×) – لە دیالێکتی کرمانجی خوارووداا ئەم جۆرە دارشتنە بە یارمەتی بزوێنی (–ە) ، کە دەکەوێتە نێوان کارو پێشگرەکەوە دادەرێژرێت ، بۆ وێنە ، کەوتنەناو (نێو) ، کردنەناو (نێو) ، دانانە ناو (نێو) ، چوونە ناو (نێو) ، خستنە ناو (نێو) . . . (وەرگێر) .

(×) – لە دیالێکتی کرمانجی خوارووداا ئامرازی (بە)ش هاوبەشی ئەم جۆرە دارشتنە دەکات ، بۆ ئەم واتایەی ، کە نووسەر لێرەدا مەبەستێتی ، بۆوێنە دەڵێن ، بەدواچوون ، بەدواخستن ، بەدوامان . . (وەرگێر) .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| لێدان | لێدان |
| لێکەتن | لێکەوتن |
| لێهاتن | لێهاتن |
| لیٚ‌ئالاٚندن | لیٚ ئالاٚندن |
| لیٚ گەرین | لێگەران |
| لیٚ‌خستن | لێنان |
| – | لێبردن |

پێشگری (لیٚ–) لەگەڵ فرێزی کاریش بەکاردێت‌و هەمان واتاش دەبەخشێت :

| | |
|---|---|
| چاڤ لیٚ‌کەتن | چاو لیٚ‌کەوتن |
| تان لیٚ‌دان | تەوس لیٚ‌دان |
| تەماشە لیٚ‌کرن | تەماش لیٚ‌کردن |

٢٢٩ - پێشگری (ژیٚ) تەنیا لە کرمانجی‌دا بەکاردێت ، سەرەتای دەست پێکردنی رووداو پێشان دەدات . لە سۆرانی‌دا پێشگری (لیٚ)ی بەرامبەرە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ژیٚ پرسین | لیٚ پرسین |
| ژیٚ کەتن | لیٚ کەوتن |
| ژیٚ دەرکەتن | لیٚ دەرکەوتن |
| ژیٚ ستاندن | لیٚ ستاندن |
| ژیٚ دەرخستن | لیٚ دەرخستن |
| ژیٚ کرن | لیٚ‌کردنەوە |
| ژیٚ برین | لیٚ برین |
| ژیٚ وەرگرتن | لیٚ وەرگرتن |

پێشگری (ژیٚ) بەشداری دارشتنی ووشەی لێکدراوی کاریش دەکات ، کە بەرامبەرەکەی لە سورانی‌دا (لیٚ)یە .

| | |
|---|---|
| تۆله ژیٚ ستاندن | تۆڵه لیٚ سەندن |
| ژیٚ کیٚم کرن | لیٚ کەم کردن |
| ژیٚ دوورکەتن | لیٚ دوور کەوتن |
| پرس ژیٚ کرن | پرس لیٚ کردن |

٢٣٠ – پێشگری (پیٚ) رێچکەی روودان بەرەو ئۆبێکت پێشان‌دەدات‌و هاوکاری دارشتنی وشەی لێکدراوی کاریش دەکات .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پیٚ‌کەنین | پیٚ‌کەنین |
| پیٚ‌کەتن | پیٚ‌کەوتن |
| دەست پیٚ‌کرن | دەست‌پیٚ‌کردن |
| باوەر پیٚ‌کرن | باوەر پیٚ‌کردن |
| پال پیٚ‌دانین | پاڵ پیٚ‌نان |

٢٣١ – پێشگری (تیٚ) رێچکەی رووداو بۆ نێوەوە پێشان‌دەدات :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| تیٚ‌کەتن | تیٚ‌کەوتن |
| تیٚ‌کرن | تیٚ‌کردن |
| تیٚ‌مان | تیٚ‌مان |
| تیٚ‌دان | تیٚ‌دان |
| تیٚ‌خستن | تیٚ خستن |
| تیٚ‌گهیشتن | تیٚ‌گەیشتن |
| – | تیٚ‌فکرین |

## پێشگری لێکدراوی جۆری دووەم

٢٣٢ – له کرمانجی‌دا پێشگری (لەڤ ، پەڤ ، تەڤ ، ژەڤ)و له سۆرانی‌دا (لێك ، پێك ، تێك) به پێشگری لێکدراو دەژمێردرێن . پێشگری (لەڤ ، پەڤ ،تەڤ ،ژەڤ) له

لێکدانی ئامرازی (ل ،ب ،د ،ژ)و جیٚناوی هەڤ داڕێژراون ، ل + هەڤ = لەڤ ، ژ + هەڤ = ژەڤ ، د + هەڤ = تەڤ ، ب + هەڤ = بەڤ .
٢٣٣ – پێشگری لەڤ (ل + هەڤ) ڕێچکەی ڕووداو بەرەو یەك شوێن پێشان‌دەدات ، هەروا ڕێك‌کەوتن‌و یەکگرتنی ڕێچکەش دەست نیشان دەکات :

لەڤ‌هاتن
لەڤ‌کەتن
لەڤ گرتن
لەڤ دان
لەڤ ئانین

٢٣٤ – پێشگری (پەڤ)یش ڕێچکەی ڕووداو بەرەو یەك شوێن‌و هەروا ڕێك‌کەوتن‌و یەکگرتنی ئەم ڕیچکەیە دەست نیشان‌دەکات .

پەڤ کەتن
پەڤ خستن
پەڤ گرێدان
پەڤ درووتن

پێشگری (تەڤ) کۆمەلیك ڕووداو پێشان دەدات ، کە کۆمەڵێك شتی یەکگرتوو دەگرێتەوە .

تەڤ‌بوون ، تەڤ‌کرن ، تەڤ‌دان ، تەڤ‌چوون .

٢٣٥ – پێشگری (ژەڤ) ڕێچکەی ڕووداو بەرەو دەوروبەری جیاجیا پێشان دەدات :

ژەڤ چوون
ژەڤ‌کەتن
ژەڤ بەردن
ژەڤ کشاندن
ژەڤ ئاڤێتن

### پێشگری لێکدراوی جۆری سیٚیەم

٢٣٦ – پێشگری سەررا ، بەررا ، ناڤ‌را ، بن‌را ، ڕەخ‌را ڕەخ‌دا ، شوون‌دا ، پێش‌دا ، پاش‌دا ، بن‌دا ، بەربەشی لێکدراوی جۆری سیٚیەم دەکەوێت .

پێشگری سەررا ، سەردا ، بەررا ، ناڤـرا ، بنرا ، بندا ، رەخرا ، پێشدا ، پاشدا ، شوندا ، بەکرمانجیبەوە تایبەتنو لە لێکدانی ئامرازی سەر ، بەر ،بن ، ناڤ ، پاش ،پێش شوون لەگەڵ پاشبەندی ئامراز (را ،دا)دا داڕێژراون . لە سۆرانیدا زۆر کەم ئەم پێشگرانەی کرمانجی بەکاردێنو لە شێوەی بندا ، سەرەوە ، سەردا ، ناودا و ئامرازی پێوەندی (لە ،بە) شیان بەپێش دەکەوێت . هەموو پێشگرەکانی جۆری سێیەم لەگەڵ کاری جوولاْن بەکاردێن .

٢٣٧ – پێشگری سەررا رێچکەی ڕووداو بۆ سەرەوە وەیا بۆ سەرشت پێشاندەداتو تەنێ لە کرمانجیدا بەکاردێت ، سەررا چوون سەررابرن ، سەررافرین ، سەرراڤیتن ، سەرراڤانین ، سەرراڤاژۆتن ، سەرراهاتن .

٢٣٨ – پێشگری سەردا رێچکەی ڕووداو بەرەو بەرکار پێشانددداتو هەر لە کرمانجیشدا بەکاردێت ، سەرداچوون ، سەردا رێتن ، (سەردارشتن - سۆرانی – بەسەردا رشتن – وەرگێر) ، سەردا ئاژۆتن ، سەرداکرن ، سەرداگرتن .

٢٣٩ – پێشگری بەررا رێچکەی ڕووداو بەرەو وەیا بەلای بەرکاردا ڕوون دەکاتەوە لەگەڵ ئەو کارەی ، کە لەگەڵیدا دێتو تەنێ لە کرمانجیدا بەکاردێت . بەرراچوون ، بەررابرن ، بەرراهاتن ، بەرراڤاژۆتن ، بەررارەڤین ، بەررافرین بەررابەردان ، بەرراکشاندن .

٢٤٠ – پێشگری ناڤـرا (ناودا – سۆرانی) رێچکەی ڕووداو لەنێوان وەیا بەهۆی بەرکارەوە پێشاندەدات . ئامرازی د ،ب (بە –سۆرانی) بەپێش پێشگر دەکەوێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ناڤـرا چوون ، ب(د) ناڤـرا چوون | بە ناودا چوون |
| ناڤـرا برن ، ب(د) ناڤـرا برن | بە ناودا بردن |
| ناڤـرا کشاندن ، ب(د) ناڤـرا کشاندن | بە ناودا کێشان |
| ناڤـرا بەردان ، ب(د) ناڤـرا بەردان | بە ناودا بەردان |
| ناڤـرا فرین ، ب (د) ناڤـرا فرین | بە ناودا فرین |
| ناڤـرا هاتن ، ب(د) ناڤـرا هاتن | بە ناودا هاتن |

٢٤١ – پێشگری (بنرا) رێچکەی ڕووداو بۆ خوارەوەی بەرکار پێشان دەدات ، پێشگری بندا بە یارمەتی ئامرازی د ،ب (بە – سۆرانی) هەمان دەوردەگێڕیو هەمان واتا دەبەخشێت .

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| بنرا چوون ، ب (د)بندا چوون | بەبندا چوون |
| بنرا کرن ، ب (د) بندا برن | بەبندا بردن |
| بنرا قەلأشتن ، ب (د)بندا قەلأشتن | بەبن قەلاشان |
| بنرا کشین ، ب (د) بندا کشین | بەبندا کشان |
| بنرا فرین ، ب(د) بندا فرین | بەبندا فرین |
| بنرا کرن ، ب(د) بندا کرن | بەبندا کرن (×) |

٢٤٢ - پێشگری رەخرا ، رەخدا رێچکەی رووداں بۆ دەوروبەری نێزیکی بەرکار پێشان‌دەدات ، شێوەی لێکدراوی ووشەی تەنشت‌دا بەیارمەتی ئامرازی پێوەندی (بە) لەم دیالێکتەو هی دی‌دا بۆ هەمان دەور بەکاردێت :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| رەخدا ،رەخرا چوون | بە تەنیشت‌دا چوون |
| رەخدا ، رەخرا هاتن | بە تەنیشت‌دا هاتن |
| رەخدا ، رەخرا ئانین | بە تەنیشت‌دا هێنان |
| رەخدا ، رەخرا فرین | بەتەنیشت‌دا فرین |
| رەخدا ، رەخرا ئاژۆتن | بەتەنیشت‌دا تێخورین |
| رەخدا ، رەخرا برن | بەتەنیشت‌دا بردن |

٢٤٣ - پێشگری پێش‌دا ، پاش‌دا ، شوون‌دا ، کە لە کرمانجی‌دا بەکاردێت .

لە پێشگری پێش ، پاش ، شوونو پاشبەندی (دا) دادەرێژرێت .

پێش‌داچوون ، پێش‌دابرن ، پێش‌داهاتن ، پێش‌دا ئانین ، پێش‌دا کشاندن ، پێش‌دا دان .

پێشگری پاش‌دا رێچکەی رووداو بەرەو پاشەوە پێشان دەدات .

پاش‌دامان ، پاش‌داکەتن ، پاش‌داهشتن ، پاش‌داکشاندن ، پاش‌دا برن .

---

(×) لە دیالێکتی کوردی موکریش‌دا پێشگری (بنرا) بەیارمەتی ئامرازی (بە) بەکاردێت‌و بۆ هەمان واتاو رۆلی رێزمانی ، بەبنراچوون ، بەبنرابردن ، بەبنرا کشان . . .(وەرگێر) .

پێشگری شووندا هەمان رۆلی پێشگری پاشدا دەگێرێت :
شووندا‌چوون ، شووندا‌مان ، شووندا ئانین ، شووندا‌برن ، شووندا کشاندن ، شووندا‌خستن .

## پێشگری لێکدراوی جۆری چوارەم

پێشگری پێڤا (پێوە – سۆرانی) ، پێدا ، تێرا ، لە لێکدانی پێشگری پیێ ، تیٚو پاشبەندی را ، دا ، ڤا دارەرێژرێت .

٢٤٤ – پێشگری پێڤا (پێوە – سۆرانی) رێچکەی رووداو بەرەو بەرکار دەستنیشان دەکات .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پێڤا گرێدان | پێوەبەستن ، پێوەگرێدان |
| پێڤا زەلقین | پێوە پساندن |
| پێڤا درووتن | پێوە دروون |
| پێڤا ئالاندن | پێوە ئالاندن |

٢٤٥ – پێشگری پێدا رێچکەی رووداو بۆ سەر بەرکار پێشان دەدات :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| پێدا کەوتن | پێدا کەوتن |
| پێدا رێتن | پێدا رشتن |
| پێدا چوون | پێدا چوون |
| پێدا هاتن | پێدا هاتن |

پێشگری تێرا رێچکەی رووداو بەنێو وەیا بەهۆی بەرکاردا پێشان دەداتو لە کرمانجیدا بەکارێت ؛
تێراکرن ، تێرادەرکەتن ، تێراکشان .

## پێشگری لێکدراوی جۆری پێنجەم

پێشگری لێك ، پێك ، تێك بەر ئەم جۆرە دەکەوێتو لە لێکدانی ئامرازی لە ، بە ، دەو ژمارە (یەك)دا دارێژراون . نێزیکـکردن ، یەکگرتنو رێکـکەوتنی رووداو وەیا واتای پێچەوانەی ئەمانەی رووداو ، کە لێك جیابوونەوەیە پێشان دەدات :

| | | |
|---|---|---|
| لێك كەوتن | پێگ کەوتن | تێگ وان |
| لێگ ئالاندن | پێك‌نان (هێنان) | تێك وەشاندل |
| لێگ بەستن | پێگ هاتن | تێك شكان |
| لێك دان | پێگ خستن | تێك چوون |
| لێك دانەمرە | – | تێگ دراندن |
| لێك دروون | – | تێك شكاندن |

### دارشتنی کاری دارێژراو بە یارمەتی پاشگری –ەوە

٢٤٨ – یەکێگ لە تایبەتێتێکانی سۆرانی دارنشتنی کاری دارێژراو بە یارمەتی پاشگری –ەوە–یە ، کە بە کۆتایی هەموو کارێکەوە دەلکێت .

پاشگری –ەوە بە شێوەیەکی فراوان لە بەری خوارووی رۆژهەلاتی بەشە دیالێکتەکانی خوارووا بەکاردێت . ئەم پاشگرە هەر لە کۆنەوە سەرنجی لێکۆلەرەوەکانی راکێشاوە ئۆسکار مان لە بەرهەمە رێزمانییەکانی‌دا لەو تێکستە کوردی‌یانەی ، کە چاپی‌کردوون‌و بەشێوەیەکی گشتی ، بنچینەو بناخەی ئەم پاشگرە بە (باز)ی فارسی‌یەوە دەبەستێت‌و واتای دووبارەکرنەوەو گەرانەوە سەرلەنوێی ، بۆ پاشەوە چوون دەبەخشێت .

لەبەرهەمە رێزمانییەکانی سۆرانیش‌دا ئەم بارە دیسانەوە دووبارەکراوەتەوە . بەرامبەر بە پاشگری (–ەوە)ی سۆرانی لە کرمانجی‌دا پێشگری (ڤە –) بەکاروێت ، کە لە بنچینەی دارشتنی‌یەوە بە (باز)ی فارسی‌یەوە پێوەستەو لە رووی واتاو ئەرکی رێزمانی‌یەوە هەر وەکو پاشگری (–ەوە) سۆرانیە .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ڤەکرن | کردنەوە |
| ڤەخوارن | خواردنەوە |
| ڤەگرین | گەرانەوە |
| ڤەدروون | دروونەوە |
| ڤەمرین | مردنەوە |
| ڤەنڤیسین | نووسینەوە |
| ڤەرژاندن | رژاندنەوە |
| ڤەبرین | برینەوە |

| | |
|---|---|
| ڤەچوون | چوونەوە |
| ڤەکۆلین | کۆڵینەوە |
| ڤەکوشتن | کوژاندنەوە |
| ڤەرەشین | رشانەوە |
| ڤەکشین | کشانەوە |
| ڤەگوهێرین | گۆرینەوە |

٢٤٩ – پاشگری (ـەوە) لەچاو پێشگری (ڤە –) زیاتر بەکاردێت‌و بەرهەم‌دارترە . وەنەبێ پێشگری (– ـەوە) هەر بۆ دارشتنی کاری دارێژراو بەکاربێت ، بەتکو هاوبەشی دارشتنی کاری پێکدراویش دەکات ، کە لە کرمانجی‌دا بەکارهێنانی (ڤە)ی بەرامبەر نی‌یە وەیا هەر هیچ جۆرە کارێکی بەرامبەر نییە :

| | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| ا – | هێسابوون | هێسانەوە (حەسانەوە) |
| | هوون‌نان | هۆنینەوە |
| | رووت‌کرن | رووتاندنەوە |
| | سووتن | سوونەوە |
| | گوهاستن | گواستنەوە |
| | پێچان | پێچانەوە |
| | ژیاندن | ژیاندنەوە |
| | برژاندن | برژاندنەوە |
| | خەملاندن | خەملاندنەوە |
| | خەملین | خەملانەوە |
| | پالاندن | پاڵاوتنەوە |
| ب – | | رازاندنەوە |
| | – | پساندنەوە |
| | – | خزانەوە |
| | – | برژاندنەوە |
| | – | دۆزینەوە |

– **دۆراندنەوە**
– **تواندنەوە**
– **سوورانەوە**
– **توانەوە**
– **بەزاندنەوە**
– **چەکانەوە**
– **بزووتنەوە**
– **چەرخانەوە**
– **گرژینەوە**

٢٥٠ – پاشگری (–ەوە)و پێشگری (ڤە –) لە زمانی کوردیدا هاوبەشی دارشتنی کۆمەڵێك کار دەکات ، کە ئەم کارانە بە بێ ئەم دووانە یەواتا بەتەنیا بەکارنایەنو هیچ واتایەکیش نابەخشن .

لە کرمانجیدا

**ڤەرسین** ، **ڤەچرین** ، **ڤەچراندن** ، **ڤیساندن** ، **ڤەگڤزین** ، **ڤەگەڤزاندن** ، **ڤەجنقین** ، **ڤەشارتن** .

لە سۆرانیدا

دۆزینەوە ، تروسکانەوە ، درەونشانەوە ، پەستینەوە ، حەسانەوە ، وەرزانەوە ، جوولانەوە ، رشانەوە ، توانەوە ، تواندنەوە ، قلیشانەوە .

پێشگرو پاشگر لە بەکارهێناندا واتای دووپاتکردنەوەو رووداوی دووری بەردەوامی دەگەیەنێت ، ئەم کارانەی خوارەوە بەشێوەیەکی فراوان بۆ ئەم مەبەستانەی ژووروو بەکاردێن . وێنە بۆ پاشگری (– ەوە) : –

**سوونەوە (سوون)** ، **چوونەوە (چوون)** ، **نووسینەوە (نووسین)** ، **گۆرینەوە (گۆرین)** ، **دروونەوە (دروون)** .

**کاری ناوی**

٢٥١ – لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرە کارە ناوییانە بەرچاودەکەون .

ا – ناوی رووداو (چاوگ) .

ب – ناوی بکەرو کراوی کاتی رابردوو .

جـ - ناوی بکەرو کراوی کاتی رانەبردوو .

## ناوی رووداو

۲۵۲ - پاشگری (ن// n, in) بە نیشانەی ناوی رووداو (چاوگ) دەژمێردرێ . ناوی ووداو نە زماندا وەکو ناوی کاری بەکاردێت . لە کرمانجیدا لەپاڵ ئەمەشدا ئەم ناوی رووداوە بۆ دارشتنی کاری نادیارو کاری ئیلزامی بەکاردێت ، بڕوانە بەندی ۲۸٦ - ۲۹۲ .

لە کرمانجیو موکریو بەشە دیالێکتەکانی شێوەی ئاخافتنی سۆرانی ناوی رووداو بەر رەسەنی مێ دەکەوێت ، بەلام لە زمانی وێژەیی سۆرانیدا ناوی رووداو وەکو هەر ناوێکی دی لە رووی رەسەنی نێرو مێوە بێ لایەنە . ناوی رووداو لە رستەدا ئەرکی سینتاکسی جۆراو جۆر دەبەخشێتو نیشانەی رێزمانی تایبەتیش بەم بارانەی دەچێتە سەر .

ناوی رووداو لە رۆڵی نیهاددا :

هاتنو چوون قەدەغەیە (چوونو هاتن قەدەغەیە - سۆرانی)

خوەندن نەتشتەکی رەحەتە (خوێندن شتێکی ئاسان نییە - سۆرانی) .

لـ دوو گەلەك کەنین گرین تێ (پێکەنینی زۆر گریانیلە دوایە - سۆرانی) .

پاراستنا وەلات دەبێ هەر کەسەکییە (پاراستنی وولات قەرزی هەر کەسە - سۆرانی .

ناوی رووداو لە رۆڵی دیارخەردا :

وەختێ خوەندنێ دەست پێکرییە ( وەختی دەستی پێکردووە - سۆرانی .

ئوتاخا خوەندنێ مەزن بوو (ژوورەکەی خوێندن مەزن بوو - سۆرانی) .

ناوی رووداو لە رۆڵی بەرکاردا :

لازمە ئەم دەست ژ براکوشتنێ بکشینن (پێویستە ئێمە دەست لە براکوشتن بکێشینەوە - سۆرانی) .

ئەو ژ مرنێ خەلاس بوو (ئەو لە مردن رزگار بوو - سۆرانی) .

## ناوی بکەرو ناویکراو

۲۵۳ - ناوی بکەرو ناویکراو لە زمانی کوردیدا زۆر کەم پەرەی سەندووە ، هەردووکیان لە رووی کەتیگۆرییەوە گەراونەتە سەرناو و وەکو ناو ، ئاوەڵناو ئەرکی رێزمانی دەگێرن .

لە دیالێکتی کرمانجیو سۆرانیدا دارشتنی ناوی بکەر وەکو یەکنو بە هاوکاری پاشگری (-ی)و(-وو) ، کە دەچنە سەر بناخەی کارەوە دادەرێژرێت .

٢٥٤ - ناوی بکەر لە کرمانجی‌دا وەکو دیاردەیەك‌و پاشماوەی هێندیك ناون ، کە لە کاری تێپەرو تێنەپەر وەرگیراون‌و لە رەگی کاری رانەبردووەوە داڕێژراون‌و بەیارمەتی پاشگری (-ەك . - ۆك) ، کە لە رەگەزەوە بە نیشانەی ناوی بکەری زمانی دی ئێرانی پێوەستن وەك (-اگا ،-اك) ئەم شێوەی پاشماوانە لەزمان‌دا تەنێ وەکو ناو ئەرك دەگێرن :

| چاوگ | بناخەی‌کاری رانەبردوو | بناخەی کاری رابردوو |
|---|---|---|
| گەستن | گەز- | گەزەك |
| مێتن | مێژ- | مێژۆك |
| زڤرن | زڤر- | زڤرۆك |
| گەرین | گەر- | گەرۆك |

لە دیالێکتی کرمانجی‌و سۆرانی‌دا یەك شێوەی ناوی بکەر هەیە ، کە بەیارمەتی پاشگری (-ی) لە کرمانجی‌و (-وو) لە سۆرانی‌دا لەگەڵ بناخەی کاری رابردوو دادەرێژرێت . ناوی بکەر دەمکاتی نییە ، بەڵکو لەرووی واتاوەش هەر بەو کارەوە پێوەستە ، کە لێیەوە وەرگیراوە . پاشگری (-وو) لە سۆرانی‌دا بە رەگی کارێکەوە دەبەسترێت ، کە کۆتایی بە (-ا ، -وو . -ی)و هاتووە شێوەی (و-(w وەردەگرێت . لە کرمانجی‌دا نیوە دەنگداری (-ی ، y-)ی دەکەوێتە نێوان کۆتایی رەگی کارو نیشانەی ناوی بکەرەوە (-ا ،-ی) ، بەڵام لەگەڵ ئەوکارانەی ، کە کۆتاییان بەدەنگی (-ی) هاتووە ، ئەوسا (-ی) نیشانەی ناوی بکەر لەگەڵ (-ی) کۆتایی رەگەکە لێك‌دەدەن .

ناوی بکەری لە کاری تێنەپەرەوە وەرگیراوە لە هەردوو دیالێکتەکەدا لە رووی واتاو ئەرکەوە وەکو یەکن ، بەڵام ئەو ناوی بکەرانەی ، کە لە کاری تێپەرەوە وەرگیراون زۆر ‌‌لێك‌ناچن . لە کرمانجی‌دا ئەو ناوی بکەرانەی ، کە لە کاری تێپەری رابردووەوە وەرگیراون واتای دیار و نادیا دەبەخشن .

لێرەدا دەمکاتی کارەکان رۆلی سینتاکسی لە رستەدا دەگێرێت ، وەك رۆلی نیهاد ، دیارخەر . . هەروا ئەو ناوانەی ، کە لە کاری تێپەری رابردووەوە وەرگیراون واتای ناوی کراویش دەدەن‌و لەرووی دەمکاتی رابردووەوە لەلایەن واتاو ئەرکەوە لەگەڵ ناوی کراوی سۆرانی‌دا یەك‌دەگرنەوە .

لە سۆرانی‌دا دەمکاتی نادیاری کاری تێپەر بەیارمەتی (–وو) دادەرێژرێت لە بناخەی کاری رابردووی نادیارەوە (بروانە بەندی ٢٨٩ – ٢٩٠) . ئەم ناوی کراوە لە رووی ئەرکی رێزمانی‌یەوە لەگەڵ ناوی کراوی شێوەی کاری رابردووی کرمانجی‌دا یەکدەگرن .

| بناخەی کاری رابردوو | | ناوی بکەری کاری رانەبردوو | |
|---|---|---|---|
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| هات | هات | هاتی | هاتو |
| کەت | کەوت | کەتی | کەوتو |
| مری | مرد | مری | مردوو |
| بوو | بوو | بوونی | بووو |
| گەرییا | گەرا | گەرییابی | گەراو |
| لەرزی | لەرزی | لەرزی | لەرزیو |
| ماما | – | مابی | ماو |

ناوی بکەری شێوەی کاری رابردووی دیار

| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|---|
| کوشت | کوشت | کوشتی | کوشتوو |
| خواند | خواند | خواندی | خواندوو |
| نڤیسی | نووسی | نڤیسی | نووسیو |
| رێخست | رێخست | رێخستی | رێخستوو |
| پێچا | پێچا | پێچابی | – |
| دروو | دروو | درووتی | دروو |

| شێوەی نادیار | | ناوی کراوی کاری رابردوو (نادیار) | |
|---|---|---|---|
| کوشت | کوژرا | کوشتی | کوژراو |
| خواند | خوێنرا | خواندی | خوێنراو |
| نڤیسی | نووسرا | نڤیسی | نووسراو |

| پێچا | پێچرا | پێچابێ | پێچراو |
|---|---|---|---|
| درووت | درر | درووێ | درراو |

٢٥٦ – ناوی بکەرو ناوی کراو ، کە لە کاری رابوردووەوە دارێژراوە ، لە رستەدا دەبێتە دیارخەرو دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوە :

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| کتێب نڤیساندی | کتێبی نووسراو |
| دەرگەنێ داخستی | دەرگەی داخراو |
| ناما هنارتی | نامەی هێنراو |
| وەلاتێ سەرکەتی | وولاّتی سەرکەوتوو |
| وەلاتێد یەکبووی | وولاّتانی یەکگرتوو |

ناوی بکەرو ناوی کراو لە رووی رۆلی سینتاکسی لە رستەدا پێوەستن بە شێوەکانی وەکو خۆیان . ناوی بکەرو ناوی‌کراو لە کرمانجی‌دا دەگەرینەوە سەر ناوی رەسەنی گشتی :

کرمانجی :

شاندێ مە ، دەسگرتیا من ، خواندێ دەواتێ ، گەر (ی) پاێی در(ی) یاێی .

سۆرانی :

هێنراوی ئێمە .

چوومە ژوورەوە بۆم دەرکەوت ، کەوا نوسراویان بۆ هاتووە ، رۆژی نوێ ، ژمارە –١١ ، ٢٦

بزووتنەوەیەکی پێشکەوتووی وەکو بزووتنەوەی نیشتمانی گەلی کورد رابەری قازانجی چینە رەنج خوراوەکان ئەکات ، رۆژی ، ١١ ، ٧)

نوێنەری رۆژنامەی ناوبراو .

نەتەوەی کوردمان لەو بەشی کوردستانە دابەشکراوەدا بە هەموو مافەکانی خۆی شادبوو ، رۆژی نوێ ، ژمارە –٢– لاپەرە –١٨

گەلێك لەو برادەرانە نووسراوی زۆریان بۆ ناردووم ، رۆژی نوێ ، ژمارە –٢ ، لاپەرە – ٨٦

چاپکراوەکانتان بۆ بنێرن ، رۆژی نوێ ، ژمارە –٢ ، لاپەرە ١٠٧

## کاری تێپەر و تێنەپەر

٢٥٧ - تێپەرو تێنەپەر بەواتای کارەکەوە خۆی پێوەستە ، بۆ وێنە :

کاری هاتن ، کەتن (کەوتن - سۆرانی) ، مرن (مردن - سۆرانی) ، لە رووی واتاوە پێویستی‌یان بە بەرکار نییە

گرتن ، هنارتن (ناردن - سۆرانی) ،برن (بردن - سۆرانی) پێوەیستی‌یان بە بەرکار هەیەو بێ ئەوەی واتای تەواو نابەخشن کاری تێنەپەر بزووتنەوەی فیزیکی ، فسیولۆژی بکەر دەردەبرێ هەوا کاریگەری ناوەوەو دیاردەی دەرەوەو گۆرین لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی دەخاتەروو .

کاری تێپەر رووداوی بکەر و رێچکەی بەرەو بەرکار پێشان دەدات ، زۆربەی ئەو کارانەی ، کە کۆتاییان بە (-اندن) دێت بەر ئەو گروپە دەکەون ، لە زمانی کوردی‌دا سنووری نێوان کاری تێپەرو تێنەپەر لە رووی واتاو مۆرفۆلۆژی‌یەوەیە . ئەم دوو هۆیە بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار لە بەکارهێنان‌دا لە رستەدا بەدیاردەکەوێت .

کاری تێنەپەر گەردان‌کردنی بکەری کەسی خۆی هەیە ، کە بە شێوەکانی کاتەوە پێوەست نییە ، بەڵام کاری تێپەر گەردان‌کردنی (بکەرو بەرکاری)ی هەیەو بەپێی شێوەکانی کاتەوە پێوەستە .

نیهاد لەگەڵ کاری تێنەپەردا هەمیشە لە دۆخی راستەو خۆ دایە . نیهاد لەگەڵ کاری تێپەردا ، هەروا بەرکاریش بە پێی شێوەکانی کات‌و تایبەتێکانی دیالێکتی لە دۆخی راستەوخۆو تیان‌و لە شێوەی بێ‌لایەن‌دا دەبن .

## کات ، دەمکات‌و چۆنیەتی دارشتنیان

٢٥٨ - لە زمانی کوردی‌دا بۆ دارشتنی کار بە پێی‌کات‌و دەمکات چوار رەگەز بەشداری دەکەن . بناخەی کاتی رانەبوردوو وەیا رابوردووی ، پێشگرو پاشگر ، کۆتایی کەسی کارو کاری یارمەتیدەر .

لە بناخەی کاتی رانەبوردوودا کاری رانەبوردوو داهاتوو ، دەمکاتی ئیخباری :ادەرێژرێت ، هەروا شیوەی ئیلزامی دەمکاتی داهاتوو شیوەی دەمکاتی فەرمان .

بناخەی کاتی رابردوو بۆ دارشتنی شیوەی رابوردوو (دوور ،سادە ،بەردەوام ، نێزیك ، ەمکاتی ئیلزامی شیوەی رابوردوو و رانەبوردوو .

کاتی کار ئەم شیوانە دەگرێتەوە .

رانەبوردوو ، داهاتوو ، رابوردووی سادە ، رابوردووی نێزیك ، رابوردووی بەردەوامی ، رابوردووی دوور ، دەمکاتەکانیش ، دیار ، نادیار ، ئیلزامی ، خۆیی . ئیخباری‌و فەرمان .

لە زمانی کوردی‌دا ئەم شێوانەی لەسەرەوە باسکراودا بە باشی‌و بەتەواوی لێیان‌کۆڵدراوەتەوە ، لەنێو بەرهەمە چاپکراوە رێزمانی‌یەکان‌دا لە رووی دارشتن‌و هۆیەکانی دارشتنیش کۆڵدراوەتەوە . شێوەکانی کات‌و واتاو بەکار هێنانی کار لە کرمانجی ژووروودا لەنێو لێکۆڵینەوەکانی کوردناسانی یەکێتی سۆڤێت‌دا رەنگی داوەتەوە (٣ ، ٧٩–٩٧ ، ٤ ، ٣٧ ، ٩٩ ، ١٠ ، ١٤١ ، ٢٣٣ ، ١٤ ، ٥٠٧ – ٦١٨ ، ٢٦ ، ٢٠٧ – ٢٧٠ ، ٥٥ ، ٨٩ ، ١٢٠ – ١٣٢) ، بەلاّم بەراوردکردنی کار لەنێوان هەردوو دیالێکتەکەدا ، تاوەکو نهۆ نەکراوە .

٢٥٩ – پێشگری د (دە ، ئە سۆرانی) بۆ دارشتنی شێوەی رانەبوردوو و رابوردووی بەردەوامی بەکاردێت ، بێجگە لەمەش هێندێك واتای جۆراو جۆریش دەبەخشێت ، چۆنیەتی رووداو لە رووی دووبارەکردنەوەی هەمیشەیی کۆتایی نەهاتوویی دەست‌نیشان دەکات .

ئەم واتایانە لەوانەیە بەهۆی سیمانتیك‌و سینتاکس دەربرێن . لە کرمانجی‌دا هۆی دەربرینی سینتاکسی لە کاری لێکدراودا بەرچاو دەکەوێت وەکو دووبارەکردنەوەی رەگەزێك لەو رەگەزانەی کارە لێکدراوەکەی لێی دارێژراوە ، بۆ وێنە ، نالە – نالەکرن و کرنەنالە – نال . لێرەدا ئاڵ‌وگۆڕکردنی ئەم رەگەزانە سەرەتای واتای د ردەبرێت . لە سۆرانی‌دا دەربرینی حەر تای واتا بە یارمەتی کاری هاتن‌و کەوتن دادەرێژرێت (لەرزین بەراوردبکە ، من کەوتمە نووسین ، قوتابی‌یەکە کەوتە پرس‌کردن (پرس‌کردن بەراوردبکە) ، پێشگری (ب –) بۆ دارشتنی کاری ئیلزامی و فەرمان بەکاردێت . لە دیالێکتی ژووروودا بە یارمەتی ئەم پێشگرە شێوەی داهاتوو و فەرمان دادەرێژرێت .

## پیتی نا کرنێ

٢٦٠ – لە زمانی کوردی‌دا ئەم پیتانەی خوارەوە بۆ (نا) کرنێ بەکاردێن (نە ،مە ،نا ،نی ،ن)

(نە–)لەگەڵ کاری رابوردوو شێوەی دەمکاتی ئیلزامی بەکاردێت . (مە) لە سۆرانی‌دا بۆ دارشتنی دەمکاتی فەرمان بەکاردێت . لە کرمانجی‌دا لەگەڵ ئەم پیتەدا پیتی (نە–)ش بەکاردێت .

(ن –) له کرمانجی‌دا تەنیٚ لەگەڵ شێوەکانی کاری (کارن) و (زانین) بەکاردێت (نی –) لەگەڵ کاری یارمەتیدەری (هەبوون)و (هەبین) بەکاردێت . له کرمانجی‌دا لەگەڵ شێوەکانی کاری رابوردوو و رانەبوردووش بەکاردێت . له سۆرانی‌دا تەنیٚ لەگەڵ کاری رانەبوردوو دێت ، بەڵام بۆ شێوەی رابوردوو تەنیٚ پێتی (نە–) بەکاردێت .

## کۆتایی کەسی کار

٢٦١ – لەگەڵ جیاوازی کەس‌و ژمارەی کاردا کۆتایی کەسی هەیە . ژمارەی تاك کەسی یەکەم‌و دووەم و سێیەمە . ژمارەی کۆش کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمە ، له دیالێکتی خوارووداو هەموو شێوەکانی هەرسیٚ کەس له کرمانجی‌دا هەیە ، که له هەردووان‌دا یەك چین ، تەنیٚ له کەسی سێیەمی تاك‌دا نەبێت ، له سۆرانی‌و هیندیك بەشە دیالێکتی کرمانجی‌دا یەك‌ناگرنەوە .

کۆتایی کەسی دیالێکتی خواروو و ژووروو سەرچاوەیەکی رەسەنی‌یان نییە ، له رووی بەکارهێنانیانەوە دابەش‌دەکرێنە سەر دوو گرووپ ، یەکەمیان : ئەو کۆتاییە کەسی‌یانە دەگرێتەوە ،که دەچنە سەر بناخەی کاری رانەبوردوو .

دووەمیان : ئەو کۆتاییە کەس‌یانەی ، که دەچنە سەر بناخەی کاری رابوردوو :

| | تاك | | | کۆ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | یەکەم | دووەم | سێیەم | یەکەم | دووەم | سێیەم |
| | م | – ی | – ە ، – یٚ ، رێت | (in,n) ن ، ین ، نە | ن | ن |
| سۆرانی | م | – ی (ت) | – ی ، رت ، –ات | yn – inین ، ین | ن | ن |
| کرمانجی | م | – ی | ——— | (n , in) ن | ن | ن |
| سۆرانی | م | – ی(ت) | ——— | ین (yn) ، ین (in) | ن | ن |

له بەراوردکردنی ئەم خشتەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا لە هەردوو دیالێکتەکەدا یەك جۆرە کۆتایی کەسی هەیە .

## کاری یارمەتیدەر

٢٦٢ – (بوون) ، دان (دایین) ، هاتن ، هەبین بەرکاری یارمەتیدەر دەکەون ، کە شێوەودەمکاتەکانی کاری لێکدراویان لێ دادەرێژرێت .

کاری (بوون) بۆ دارشتن دەمکاتی کاری ئیخباری و کاری لێکدراوی ئیلزامیی و دەمکاتی داهاتوو بەکاردێت . کاری کەتن دکەوتن – سۆرانی) ؛ (لە هێندێك بەشە دیالێکتی کرمانجی خوارووش دا – کەتن – بەکاردێت – وەرگێر) وەکو کاری بوون کەروان دەکرێ و بەکاررێت .

کاری دان بۆ دارشتن دەمکاتی ئیلزامی بەکاردێتو لە رووی دارشتنەوەش تێنەپەرە .

٢٦٣ – کاری هاتن بۆ دارێژراون هیندێگ بنچینەیی دیالێکتی هەیە . ئەمە ئەوە پتشان دەوات ، کەوا هەمان بناخەی کاری رانەوردووی (هاتن) لە بەنشە ، کە ئەمانەن ؛ (هێ ، – یێ ، – ە) . لەپاڵ ئەمانەنش دا لە دیالێکتی ژووروودا ئەم بناخەیە شێوەی (تی –)نشی دەبێت ، کە لە لێکدانی پێشگری (د –) لەگەڵ بناخەی (– یێ) (لە رووی مێرووەوە – هێ) دەنگی (د)ی لەبەر دەنگی (هـ) بە (ت)ی دەگۆرێ .

لە بەشە دیالێکتی موکری‌دا شێوەی تەواوی بناخەی کاری رانەبردووی ، کە رانەبوردووی (هاتن)ە تەنیێ شێوەی (– ە)ی ماوە .

### رانەبوردوو
### شێوەی چەسپیو

| کرمانجی | سلێمانی | موکری |
|---|---|---|
| ئەزتێم | من یێم | من دەهێم |
| توتێی | تۆ یێت | تۆ دەهێی |
| ئەوتێ | ئەو یێت | ئەو دەهێ |
| ئەمتێن | ئێمە یێین | ئێمە دەهێین |
| هونتێن | ئێوە ین | ئێوە دەهێن |
| ئەوانتێن | ئەوان ین | ئەوان دەهێن |

لە شێوەی نەچەسپیودا پیتی (نا) بە کۆتایی بناخەی کارەوە (– یێ ، – ە ، هێ)وە دەلکێت :

| | | |
|---|---|---|
| ئەز نائم ، نائیم | من نایەم | من ناهێم |
| تو نائی ، نائي | تۆ نایەی | تۆ ناهێی |
| ئەو نائی ، نائێ | ئەو نایە | ئەو ناهێ |
| ئەم نائن ، نائین | ئێمە نایەین | ئێمە ناهێین |
| هوون نائن ، نائین | ئێوە نایەن | ئێوە ناهێن |
| ئەوان نائن ، نائین | ئەوان نایەن | ئەوان ناهێن |

شێوەی داهاتووی هاتن لە بەنشە دیالێکتی سلێمانیو موکری هەر شێوەی رانەبوردووە ، بەڵام لە شێوەی داهاتووی لەکرمانجیدا لە بناخەی رانەبوردووە (رێ)و پێشگری (– – bi ، ب–) ، کە بزوێنی (i) بزرۆکەی لەنێودەچێت :

| کرمانجی | سلێمانی | موکری |
|---|---|---|
| ئەزێ بێم | منێم | مندەهێم |
| تویێ بێی | تو یەێت | تۆ دەهێی |
| ئەوێ بێ | ئەو یێت | ئەو دەهێ |
| ئەمێ بێن | ئێمە یێن | ئێمە دەهێین |
| هوونێ بێن | ئێوە یێن | ئێوە دەهێن |
| ئەواناێ بێن | ئەوان دەێن | ئەوان دەهێن |

شێوەی ناکراوی کاری داهاتوو لەگەڵ شێوەی ناکراوی کاری انەبوردوو وەکویەکن .
هەموو شێوەکانی کاری ابوردووی (هاتن) لەگەڵ کاری تێنەپەری کەتن (کەوتن – سۆرانی) لە رووی گەردانکردندا یەکن .

٢٦٤ – کاری (هەبین) ، کە واتاو ئەرکی تایبەتی خۆی لە زماندا هەیە ، وەکو کارێکی پێوەستە ، ئەم کارە تەنێ شێوەی رانەبوردووی هەیە (بروانە بەندی ژمارە ٣٢٣ – ٣٢٤) ، کە وەکو کاری پێوەست دەبێتو بناخەی دێرینیخۆی ، کە (هە)یە لە دەست دەداتو هەر شێوەی کەسەکانی هەن : ئەز هاتمە ، توهایتی ، ئەوهاتیە هتد وەیا ئەزکوردم ، توکوردی ، ئەوکوردە هتد .

### شێوەی کۆتایی کاری پێوەست

| | جۆری یەکەم — لە دوای بزوێن | | جۆری دووەم — لە دوای نەبزوێن | |
|---|---|---|---|---|
| | کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| تاك | — مە یەکەمی تاگ | — م | — م | — م |
| | — نی دووەمی تاگ | — ی(ت) | — ی | — ی(ت) |
| | — یە سێیەمی تاگ | — یە | — ە | — ە |
| کۆ | نە | ین | ن | ین |
| | نە | ن | ن | ن |
| | نە | ن | ن | ن |

### دارشتنی کاتی کار
### دەمکاتی ئیخباری

٢٦٥ — لە زمانی کوردیدا هیچ هۆیەکی مۆرفۆلۆژی جیاواز بۆ کاری جۆراو جۆر نییە . شێوەکانی دارنشتنی کار لە بناخەی کاری رانەبوردووی تێپەرو تێنەپەرو بناخەی کاری رابوردووی تێنەپەر لە هەردوو دیالێکتەکەدا یەکن . جیاوازی تەنێ لە کاری تێپەری رابوردوودا هەیە .

**تێبینی**

لە هەموو کاتێکی شێوەکانی کاری بزووتنەوەدا بزوێنی (— ە)ی دەچێتە سەر ، کە لە ئامرازی (وە)یە (بروانە بەندی ژمارە — ١٣٧٨) . ئەم دیاردەیە لەم بارانەدا بەرچاودەکەون ، کە لەدوای کاردا بەرکاری تیان وەیا ئادڤێربلی شوێن دێن .

### کاتی رانەبوردوو

٢٦٦ — شێوەی کاتی رانەبوردووی کاری تێپەرو تێنەپەر بە بەپێش‌کەوتنی پێشگری (دە ، ئە — سۆرانی) بە پێش بناخەی کارەوەو پێوەلکانی کۆتایی کەسی جۆری یەکەم بە کۆتایی بناخەکەوە دادەرێژرێت . پێشگری (د) لە زۆربەی زۆری شێوەکانی دیالێکتەکانی ژووروودا بەکاردێت‌و لەنێو تێکستی زمانی وێژەیی کلاسیکی بەشە دیالێکتی کوردی سوریا ، تورکیا ، شێوە زمانی ئەو

کوردانەی ، کە لەبەری رۆژئاواو باکووری رۆژئاوای گۆمی رەزاییەو بەشە دیالێکتی کوردەکانی موسل ، شەنگار (لە عیراق) لە بەنشە دیالێکتی کوردکانی ئەرمەنستان ، گورجستانو ئازربایجاندا بەرچاودەکەوێت . شێوەی (دە --) لە موکری‌و بەشە دیالێکتی هەولێرو رەواندزو کەرکوك هەروا بەنشە دیالێکتی کوردی تورکمنستانیش بەکاردێت .

کۆتایی کەسی شێوەکانی کاری رانەبوردووی دیالێکتی ژووروو و خواروو لە بناخەوە یەگ دەگرنەوەو وەکو یەکن ، تەنیا لە کەسی سێیەمی تاك‌و دووەمی کۆدا هێندیك جیاوازی‌یان هەیە .

لە بەشە دیالێکتەکانی ژووروودا کۆتایی کەسی هی سێیەمی تاگ لە شێوەی (ە)دا دەبێت . شێوەی (–ی) کورت‌کراوەی (–ێت)ە ، کە لە دەسنووسە و یژەییەکانی سەرەکانی نێوەراستدا بەرچاودەکەوێت‌و هەروا لە تێکستە فۆلکلۆری‌یەکانی بادنیان‌و بەشە دیالێکتەکانی ژووروی جزیرەو موسل‌و هەکاری‌و هی‌دی . لە هێندیك بەنشە دیالێکتدا کۆتایی کەسی (– یٚ) وەکو (– ی) گۆدەکرێت ، وەگ بەنشە دیالێکتەکانی کوردی تورکمنستان‌و ئازربایجان .

لە بەنشە دیالێکتەکانی خوارووداکەسی سێیەمی تاگ لە شێوەی (ریٚ)دا دەبێت‌و کورت‌کراوەی (– ێت)ە بۆیە هێندیك‌جار (ێت) یش بەکاوێت ، هەروا کەسی سێیەمی تاگ لە هێندیك کاردا لە شێوەی (– ات)دا دەبێت ، ئەو کارانەی ، کە کۆتاییەکانیان بە دەنگێکی بزوێن دێت لە کەسی سێیەمی تاك کۆتایی کەسیان نییە ، کۆتایی کەسی کەسی یەکەمی کۆ لەم شێوانەدا (in – n) و (in – yn – ne, ine – ne) دا دەبن . لە بەنشە دیالێکتەکانی ژووروودا شێوەی in n لەگەلٚ کەسی‌دووەم‌و سێیەمی تاکی هەردوو دیالێکتەکدا یەکن ، کۆتایی کەسی یەکەمی کۆ لە بەشە دیالێکتی کوردانی تورکمنستاندا لە شێوەی ine)و (ne و لە بەنشە دیالێکتی دیاربەکردا لە شێوەی (ine ne)دا بەکاردێن .

لە دیالێکتی خوارووداکۆتایی کەسی کەسی یەکەمی کۆ لە شێوەی ین// in و ynدا دەبێت .

**شێوەی چەسپیو**

**تاك**

| | **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|---|
| **کەسی یەکەمی تاك** | **ئەز دکەڤم** | **من دەکەوم (ئەکەوم)** |
| **کەسی دووەمی تاگ** | **تو دکەڤی** | **تۆ دەکەوی (ئەکەوی)** |
| **کەسی سیٚیەمی تاگ** | **ئەو دکەڤە** | **ئەو دەکەویٚ (ئەکەویٚ)** |

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| کەسی یەکەمی تاك | ئەز دنڤیسم | من دەنووسم (ئەنووسم) |
| کەسی دووەمی تاك | تو دنڤیسی | تۆ دەنووسی (ئەنووسی) |
| کەسی سێیەمی تاك | ئەو دنڤیسە | ئەو دەنووسێ (ئەنووسێ) |

کۆ

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| کەسی یەکەمی کۆ | ئەم | ئێمە دەکەوین (ئەکەوین) |
| کەسی دووەمی کۆ | هوون دکەڤن | ئێوە دەکەون (ئەکەون) |
| کەسی سێیەمی کۆ | ئەوان | ئەوان دەکەون (ئەکەون |
| کەسی یەکەمی کۆ | ئەم | ئێمە دەنووسین (ئەنووسین) |
| کەسی دووەمی کۆ | هوون دنڤیسن | ئێوە دەنووسن (ئەنووسن) |
| کەسی سێیەمی کۆ | ئەوان | ئەوان دەنووسن (ئەنووسن) |

شێوەی ناکراو (نەچەسپیو) (تاك)

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەز ناکەڤم | من ناکەوم |
| دووەمی تاك | تو ناکەڤی | تۆ ناکەوی |
| سێیەمی تاك | ئەو ناکەڤە | ئەو ناکەوێ |
| یەکەمی تاك | ئەز نانڤیسم | من نانووسم |
| دووچی تاك | تو نانڤیسی | تۆ نانووسی |
| سێیەمی تاك | ئەو نانڤیسە | ئەو نانووسێ |

کۆ

| کەسی | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی کۆ | ئەم | ئێمە ناکەوین |
| دووەمی کۆ | هوون ناکەڤن | ئێوە ناکەون |
| سێیەمی کۆ | ئەوان | ئەوان ناکەون |

| یەکەمی کۆ | ئەم | ئیمە نانووسین |
| --- | --- | --- |
| دووەمی کۆ | هوون نانڤیسن | ئیوە نانووسن |
| سی‌یەمی کۆ | ئەوان | ئەوان نانووسن |

٢٦٧ – شێوەی کاری رانەبوردوو واتای رووداو دەبەخشێت لە کاتی روودان (لە کاتی قسەکردندا) وەیا ئەو رووداوە دەخاتەروو ، کە بە شێوەیەکی گشتی‌و هەمیشەیی روودەدات ، بی‌ئەوەی بۆ هیچ سەردەمێکی کات بگەرێنەوە :

دەچوومە سەر بەحریٚ توراندا و ماسییان دەگرم ، مەکەتری – ١٥٤ .

سیتۆك پیاوێکی راستگۆیە ، حەز لە چاکە ئەکات ، راستی پی‌خۆشە ، حکایەتی زادیج – ٧٧ .

سیتۆك مەرڤەکی راستگۆیە ، ئەو گەنجی حەزدکە ، راستی گەلەکی پیٚ خۆشە – کرمانجی .

ئیستە سیٚ سالە ئەم‌سیٚ برایەم مقابلی بە لەشکەری قرالی ئەسکەریٚ قرالی فرەنگ شەر ئەکەن ، مەکەتری –١٢

نها سیٚ سالە ئەڤ سیٚ بریٚد من مقابل ئەسکەری قرالیٚ فرەنگ شەر دکن – کرمانجی .

شوان مەر نالەوەرێنیٚ ، شڤان پەز ناچیرینە–کرمانجی .

پشیلە گۆشت ناخوا ، پشیلە گوشت ناخوە – کرمانجی .

تۆ سەرخۆشی من وا ئەزانم ئەمە رۆژە مانگ نییە ، مەکەتری – ٧٦

تو سەرخوەشی ،ئەز وا دزانم ، ئەڤا رۆژە نە مەهە ، کرمانجی

کابرایەك ئەچیٚ بۆ پۆلیس‌خانە ،شکات لە رەفیقەکەی ئەکات ، مەکەتری–٧٦ .

## کاتی داهاتوو

٢٦٨ – کاری داهاتوو لە بناخەی کاری رانەبوردوو دادەرێژرێت‌و بە پێوە لکانی کۆتایی کەسی جۆری یەکەم ( بروانە بەندی ژمارە –٢٦١) . لە دیالێکتی خوارروودا هیچ نیشانەیەکی مۆرفۆلۆژی بۆ کاتی داهاتوو نییە ، بۆ ئەم ئەرکە هەر تەنیا شێوەی رانەبوردوو بەکاردێت .

لە کرمانجی دا بە پێچەوانەیە ، چەند نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دارشتنی کاری داهاتوو هەیە . لەوانە نیشانەی (ب –) ، کە بەپێش بناخەی کاری رانەبوردووەوە دەلکێت ، هەروا نیشانەی (–یٚ) وەیا ویٚ ، دیٚ بە پێی شێوەی دیالێکتەکە لەگەلٚ کاری داهاتوودا بەکاردێت کاتیٚ دەکەوێتە دوای نیهادەوە ، بەم جۆرە :

| | | |
|---|---|---|
| ئەزێ بکم | ئەز وێ بکم | وەیا ئەز دێ بکم |
| تونێ بکی | توی وێ بکی | وەیا تو دێ بکی |
| ئەمێ بکن | هوون ێ بکن | وەیا ئەوانا دێ بکن |

گەر لە رستەی چەسپیودا شێوەکانی کاری داهاتوو لە دیالێکتی ژووروو و خوارووودا لەیەك سەرچاوەوە ببرون ئەوا شێوەی ناکراویمان وەکو یەکدەبن و پیتی (نا) شوێنی (ب —)ی دەگرێتەوەو نیشانەکانی دی داهاتووش بەکارنایەن .

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئەز ناکەڤم | من ناکەوم |
| ئەز ناکم | من ناکەم |
| ئەز نانڤیسم | من نانووسم |

٢٦٩ — کاری داهاتوو رووداو لە داهاتوودا پێشان دەدات ، بێئەوەی کاتی رووداوەکە بە تەواوی دیاربخات .

کاری داهاتوو لە کرمانجی دا لەگەڵ کاری دەمکاتی ئیلزامی یەك دەگرێتەوە ، لەرووی ئەو ووشە جیاوازانەی ، کە لە رستەدا بەکاردێن . پێوەندی جیاوازی جیاجیا دەردەبرێت لە هیڤی داری ، توانایی ، مەرجی هتد (بروانە بەندی ژمارە — ٢٩٧)

باوەکو لە سۆرانی دا شێوەی داهاتووی کار لەگەڵ دەمکاتی ئیلزامی دا یەکناگرنەوە ، بەڵام لە رووی واتا دەربرینەوە هەر هەمان پێوەندی جیاواز جیاواز بە پێی ئەو وشانەی لێی دارێژراون پێشان دەدرێت :

**دەسگیرانم رۆیشتووە ، ئەچم بەدوایەوە ، بزانم لە کوێ ئەیدۆزمەوە ، مەکەتری —١٤**

**دەستگرتیا من چوویە ، ئەزێ هەرم ، بزانم لە کو وێ ببینم — کرمانجی**

**لەم باخە خانوویەك ئەکەین ، تیا دانیشین ، مەکەتری —٣٠)**

**دڤی باخی دا ئەم خانیکی چێکن تێدا روونین — کرمانجی**

**کوری گەورە ووتی : بابە گیان ، تۆ خۆش بی لەگەڵ برا ناوجوانما ئەچین بۆت یەنین ، مەکەتری —٤٤**

**کورێ مەزن گۆت : باڤێ جان ، تو خوەش بی ، ئەمێ دگەل براێی مە نەوجوان هەرن ، ژ تەرا بینن — کرمانجی .**

## کاری رابردووی سادە

٢٧٠ – لە سۆرانیو کرمانجیدا کاری رابردووی سادە لە بناخەی کاتی رابوردوو دادەرێژرێتو کۆتایی کەسی جۆری دووەمی پێوە دەلکێت ، (بروانە بەندی ژمارە ٢٦١) .

**شێوەی چەسپیو**

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەز کەتم | من کەوتم |
| دووەمی تاك | تو کەتی | تۆ کەوتی |
| سێیەمی تاك | ئەو کەت | ئەو کەوت |
| یەکەمی کۆ | ئەم کەتن | ئێمە کەوتین |
| دووەمی کۆ | هوون کەتن | ئێوە کەوتن |
| سێیەمی کۆ | ئەوان کەتن | ئەوان کەوتن |

لە شێوەی ناکراودا پێتی (نە –) بەپێش کاری رابوردووی سادە دەکەوێت .

٢٧١ – کاری رابوردووی سادە لە رووی واتاوە لە کاری رابوردووی نێزیك ، ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌یکە . لەوانەیە واتای تەواوی روودانی رووداو لە رابوردوودا پێشان بدات ، بەڵام بێ دەست نیشانکردنی کاتی کۆنکریتی رووداوەکە . کاری رابوردووی سادە لە رووی نێزیکی کاتی روودانی کارەکەدا بە پێچەوانەی کاری رابوردووی دوورە :–

**کە چوونە ئەوێ ، شێخول عەرەب لەماڵەوە نەبوو ، ژنەکەی هات بە پیریانەوە ، مەکەتری –١٠**

**کو چوونەوێ ، شێخول عەرەب نەماڵبوو ، ژنا وی هات ب پیرگیا وی – کرمانجی**

**کور روو بەرووی ئاسك رۆیشتن ، تا لێی نێزیك بوونەوە ، مەکەتری –٦**

**کور بەر ب ئاسکێ چوون هەتا لێ نێزیکبوون – کرمانجی .**

**ماڵێ ئاوایمان لە تەمۆی شەشتلی خواستو بەرێکەوتینو گەیشتینە گوندی براخۆرا ، توفیق ووردی – ٤٦**

**مە ماڵ ئاڤایی ژتەموێی شەشتلی خوەستو ئەم برێکەتنو گهشتینە گوندێ برا خۆرا – کرمانجی**

٢٧٢ – له رستەی تێکەڵدا دەتواندرێ شێوەی دەمکانی ئیلزامی له برێتی کاری سادە بەکاربێت :

**شەرتمان کرد لەگەڵ یەکتری ، کە من مردم ئەو شوونەکا ، ئەگەر ئەویش مرد من ژن نەیەنم ، مەکەتری –٦٠**

**مە ب‌هەڤرا شەرت گرت کو ئەز مرم ئەو مێر نەکا ، ئەگەر ئەو مر ، ئەز ژنێ نانیم–کرمنجی .**

## کاری رابوردووی نێزیك

٢٧٣ – شێوەی کاری رابوردووی نێزیك له هەردوو دیالێکتەکەدا وەکو یەکن . کاری رابوردووی نێزیك له ناوی بکەرو کاتی رابوردوو دادەرێژرێت‌و کۆتایی کەسی کاری (هەبین)ی پێوە دەلکێت (بروانە بەندی ژمارە ٢٦٤) ، له کرمانجی‌دا پاشگری (–ی) ناوی بکەر لەم جۆرە بارانەدا لەنێو دەچێت : ئەز هاتمە ، تە ئەز شاندمە . ئەوی ئەم گرتنە .

پاشگری (–ی) ناوی بکەر له کەسی دووەم‌و سێ‌یەمی تاكدا لەنێو ناچێت ، بەڵکو بەکاردێت ، باری نەچەسپیوی پاشگری ناوی بکەر له دارشتنی کاری رابوردووی نێزیك‌دا لەگەڵ هێزی کارەکەدا ، کە دەکەوێتە سەر برگەی هەرە دوایی کارەکەوە تێکەڵ دەبێت .

له دیالێکتی خوارووداکاری رابوردووی نێزیك بە لکانی کۆتایی کەسی کاری (هەبین) بە جۆری دووەمی کۆتایی ناوی بکەرەوە دادەرێژرێت ، (بروانە بەندی ژمارە ٢٦٤) لەم دیالێکتەدا پاشگری ناوی بکەر بە هیچ جۆر لەنێو ناچێت ، کە له شێوەی (وو) وەیا (و)دا دەبێت ، (بروانە بەندی ژمارە (٥٥) لەم دارشتنەدا پیتی (و /(w دەکەوێتە نێوان ناوی بکەرو کۆتایی کەسی کاری پێوەستەوە (بروانە بەندی ژمارە ٢٨ ، ٣٢) ـ

لەنێوچوونی پاشگری ناوی بکەر و لەنێوچوونی تەواوی له هێندیك کارداو له یەکچوونی دوو شێوەی رێزمانی لەرووی سیمانتیکەوە پێشان‌دەدات ، کە بریتین له ناوی بکەر ، کە له بناخەی کاری رابوردووەوە دارێژراوەو ئەمە سەرنجێك دەخاتەروو ، کە ئەویش ئەوەیە ، کاری رابوردووی نێزیك له کرمانجی‌دا وەنەبێ له ناوی بکەرەوە دابرێژرێت ، بەڵکو له بناخەی کاتی رابوردووەوە ، بەلام بوونی وەیا دارشتنی ئەم کارە له دیالێکتی خوارووداە بە یارمەتی پاشگری ناوی بکەر (وو ،ز)وەیە و له دیالێکتی ژووررووش‌دا له کەسی دووەم‌و سێ‌یەم‌دا هەیە . ئەمە روون‌دەکاتەوە ، کەواکاری رابوردووی نێزیك لەسەر بناخەی ناوی بکەرەوە دادەرێژرێت .

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەز کەتمە | من کەوتووم |
| دووەمی تاك | تو کەتیی | تۆ کەوتووی(ت) |
| سێیەمی تاك | ئەو کەتی‌یە | ئەو کەوتووە |
| یەکەمی کۆ | ئەم کەتنە | ئێمە کەوتووین |
| دووەمی کۆ | هوون کەتنە | ئێوە کەوتوون |
| سێیەمی کۆ | ئەوان کەتنە | ئەوان کەوتوون |

بۆ ناکردنی ئەم دارشتنەی سەرەوەدا پیتی (نە) لە هەردوو دیالێکتەکەدا بەپێش کارەکەوە دەکەوێت :

**ئەز نەکەتمە ، من نەکەوتووم – سۆرانی .**

٢٧٤ – کاری رابوردووی نێزیك رووداوێك پێشان‌دەدات ،کە لە رابوردوودا رووی‌داوە ، بەلاّم ئەنجامی روودانەکە بەرەو کاتی رانەبودووش هاتووە :

**دەسگیرانم رۆیشتووە ، ئەچم بەدوای ، بزانم لەکویێ ئەیدۆزمەوە – مەکەتری –١٢**

**دەسگرتیا من چوویە ، ئەزێ پەی وێ هەرم ، بزانم لـکو وێ ببینم – کرمانجی .**

**ئەی ! سولتان مەحموود ، خێرا واهاتووی ؟ ووتی : هاتووم لە جیاقی حەسەن ، مەکەتری –٣٨**

**ئای ! سولتان مەحموود ، چی وا زوو هاتی‌یە ؟ گۆت : دەوسا حەسن هاتمە – کرمانجی .**

**دایکی سمرغەکان هاتووە ، تەماشای‌کرد زەلامێك لەبن هێلانەی بەچکەکانی‌یەوە نوستووە ، مەکەتری –٤٦**

**دایکا سمرغان هات ، تەماشاکر زلامەك لـهێلینا جووجکێد وێ‌دا رازاییە – کرمانجی**

**بەقەدەری چەند رۆژێکی لێرانە دانیشتوونە ، مەکەتری –٢١٢**

**بـقەدەرا چەند رۆژان ئەم لـڤرا روونشتنە – کرمانجی .**

## رابوردووی دوور

٢٧٥ – کاری رابوردووی دوور لە دیالێکتی ژووروو و خواروودا لە ناوی بکەری کاتی رابوردوو و کاری یارمەتیدەری (بوون) لە شێوەی کاتی رابوردووی سادەدایە .

لێرەدا لەنێوچوون وەیا نەمانی ناوی بکەر لەچاو کاری رابوردووی نێزیك‌دا بەهێزترە ، چونکە لە هیچ شێوەیەکی کاردا ناوی بکەر بەتەواوی بەکارنایەت ، بەڵکو لە هێندیك بەشە دیالێکت‌دا پاشگری ناوی کورت‌کراوەتەو بووە بە (i) بزرۆکە ، نەبوونی ئەم بزرۆکەیەش لە دارشتنی رابوردووی دووردا هیچ زیانێك وەیا کەمییەکی ناداتێ . بەم جۆرە ناوی بکەرو بناخەی کاری رابوردووی کارەکە وەکو یەك دەبن .

**شێوەی چەسپیو**

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەز کەتبووم | من کەوتبووم |
| دووەمی تاك | تو کەتبووی | تۆ کەوتبووی(ت) |
| سێیەمی تاك | ئەو کەتبوو | ئەو کەوتبوو |
| یەکەمی کۆ | ئەم کەتبوون | ئێمە کەوتبووین |
| دووەمی کۆ | هوون کەتیوون | ئێوە کەوتبوون |
| سێیەمی کۆ | ئەوان کەتبوون | ئەوان کەوتبوون |

**شێوەی ناکراوی ئەم کارە بە یارمەتی پێتی (نە) دادەرێژرێت :**

**ئەز نەکەتبووم ، من نەکەوتبووم — سۆرانی**

**تو نەکەتبووی ، تۆ نەکەوتبووی — سۆرانی**

٢٧٦ — کاری رابوردووی دوور ئەنجامی تەواوبوونی رووداوی رووداوێکی دی پێشان‌دەدات بەواتا یەکێك لەم دوو رووداوانە لەرووی رووداناوە بە ئەوی دی کەوتووە .

لەو تێکستە کرمانجی‌یانەی ، کە ر . لیسکۆ کۆی کردوونەتەوە شێوەی کاری رابوردووی نێزیك هی کەسی دووەم‌و سێیەمی تاك لەگەڵ کاری رانەبوردوودا یەك‌دەگرنەوە : لۆ — لۆ .

ما ئەڤ مغارە بێ‌خوە دیە ، توێ هاتیە لێ روونشتیە ؟ تێکستی کوردی —١١

تو شاش بوویە ، تو کەتیە هوندور ، سەرچاوەی پێشوو —١١

تو ئیرۆ هاتیە ، هەکە مێری هەرە پەیڤا خوە هلینە ، سەرچاوەی پێشوو ، ١١ ، ٨٦

لەو وەختە ، کە ئەو لە مەکتەب دەرچوو منیش لێرە نەبووم چووبووم بۆ بانی بۆ خوێنین . مەکەتری —٧٠

وەی وەختیدا . کو ئەو ژ مەکتەبێ دەرچوو ، ئەزژی نە لڤرابووم ، چووبووم ناڤ باغ بۆنا خوەندنێ - کرمانجی .

بەکووچە تاریکەکان گەرا منالەکانی برسی چاوپێکەوت ، رەنگیان زەرد هەڵگەرابوو ، هەڵبژاردە - ٩٤

د کووچێ تاریدا گەریا ،چاڤ بزارۆیێد برچیکەت ، رەنگێ وان زەربوو بوو - کرمانجی .

## کاری رابوردووی بەردەوامی (هەمیشەیی)

٢٧٧ - کاری رابوردووی بەردەوامی لە بناخەی کاتی رابوردوو بەپێشکەوتنی پیتی (د) لە کرمانجی (دە)[×] لە موکریو (ئە) لە بەشە دیالێکتی سلێمانیو کوردانی تورکمنستان بەپێش بناخەوەو پێوەلکانی کۆتایی کەسی جۆری دووەم ، (بروانە بەندی ژمارە ٢٦١)

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەز دکەتم | من دەکەوتم (ئەکەوتم) |
| دووەمی تاك | تو دکەتی | تۆ دەکەوتی(ئەکەوتی) |
| سێیەمی تاك | ئەو دکەت | ئەو دەکەوت (ئەکەوت) |
| یەکەمی کۆ | ئەم دکەتن | ئێمە دەکەوتین(ئەکەوتین) |
| دووەمی کۆ | هوون دکەتن | ئێوە دەکەوتن (ئەکەوتن) |
| سێیەمی کۆ | ئەوان دکەتن | ئەوان دەکەوتن(ئەکەوتن) |

شێوەی ناکراوی کاری رابوردووی بەردەوامی بەبەکارهێنانی پیتی(نە)یە ، کە دەکەوێتە پێش کارەوە :

(×) - وەنەبێ (دە) هەر لە موکریدا بەکاربێت . بەڵکو لە هێندیك بەشە دیالێکتی دیش لە کرمانجی خوارووادا بەکاردێت ، وەك بەشە دیالێکتی هەولێرقەلادزەو پژدەر . وەرگێر.

ئەز نەدەکەتم ،من نەئەکەوتم – سۆرانی .

٢٧٨ – کاری رابوردووی بەردەوامی رووداوێکی دوور وەیا دووبارەکراوە پیشاندەدات ، کاتی رووداوەکە لە رابوردووە ، بەلاّم نازاندرێ چ رابوردوویەك :

دەو سالەدا وەستا رەجەب ناوکوردەکی وەستاکارو دان لە تۆپ دارشتن دەکۆشا ، میرانی سۆران – ٤٦ .

د وێ سالێدا هوستا رەجەب ناڤ کوردەکی هۆستکار و زانا دتۆپ رێتنێدا دخەتبی -کرمانجی

هەر چوار بە تۆپزێ زیوەوە لەپێش دەرۆیشتن ، میرانی سۆرانی – ٥١

هەرچار ب تۆپزێ زیڤا ل پێشیا وی دچوون – کرمانجی

کەلۆس لە هەمدیانێ بە شووانی دەژیا ، میران سۆران – ٣

کەلۆس ل هەمدیانێ بشڤانی دژیا – کرمانجی

٢٧٩ – لە کاتی گەردانکردنی شێوەکانی کاری بزووتنەوە وەیا تێکەلێ پیتی (نە) دەکەوێتە کۆتایی کارەکەوەو رێچکەی رووداوەکە دەست نیشان دەکەنو لە کاتی گەردانکردنی هێندێك کاردا ئەم پیتە دەوری کۆتایی کەسی دەگێرێ :

من هاتوومەتە گوند

ئەو کەوتوتە مال

تکام لە میر هەیە ، چەند رۆژکە ، کەنیزیکەکی بابلی جووان هاتووتە ئەم کۆشکە ، ئەمر بکەن با بروانەوە بۆ بابل ، چیرۆکی زادیج –٤٤

ئەز لاڤا ژمیر دکم ، ئەڤا چەند رۆژە ، کوکەنیزەکا بدەو ژبابلێ هاتیە ڤێ کۆشکێ ئەمربکن بلا بێ بابلێ – کرمانجی .

ئەو ئێلە خیانەتی لەگەلێ کورد کردووە ، خۆی فرۆشتۆتە دژمن ، خانزاد –ێ

ئەوی عێلێ بەکوردانرا کریە ، خوە فرۆشیە دژمن – کرمانجی

بیست و پێنج کەس لە لادێیەکانی تۆ چوونەتە مەهابادو بوونەتە پێشمەرگە ، رەحیمی قازی – ١٦

بیست و پێنج کەس ژ گوندێ تە چوونە مەهابادێو بوونە پێشمەرگە – کرمانجی

ئەوەی تۆ دیوتە ، ئەوە لاوی تۆ نی یە ، ئەوە کچی شێخولعەرەبەو هاتوو وەتە ئێرە ، مەکەتری –٨

ئەوا تە دیتیێ ، ئەو نێچیرا تە نینە ، ئەو کچا منە ، کچا شیخولعەرەبە هاتیە ڤرا – کرمانجی

بەڵام داخەکەم هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەو پایەی ، کە بتوانین مێژووی پەندی پێشینانمان بنووسین ، پەندی پێشینان –٧

لێ مخابن ئەم هێ نەگهشتینە وی پایێ کو تاریخا پەندێ پێشیێد مە بکاربن بنڤیسن – کرمانجی

## گەردانکردنی کاری تێپەری رابوردوو

٢٨٠ – ئەو رستانەی ، کە بەشی گوزارەیان برێتیە لە کارێکی تێپەری رابوردوو هێندێك تایبەتێتی خۆی هەیە ، لە دیالێکتی ژووروودا سوبێکت (نیهاد //بکەر) لە دۆخی تیاندا دەبێ ، بەڵام ئۆبێکت (بەرکار) لە دۆخی راستەوخۆدا دەبێت . کارەکە لەگەڵ بەرکاردا رێك‌دەکەوێت ، نەك لەگەڵ نیهاد ، سوبێکت لە رووی ژمارەوە هەر ئەوەیە ، کە بەخۆیەوەیە ، بەڵام ژمارەی ئۆبێکت لەنێو کارەکەدا پێشان دەدرێت . لە کاتی نەبوونی بەرکاردا کار لەرووی شێوەوە لەگەڵ کەسی سێ‌یەمی تاکدا یەك‌دەگرنەوە .

نیهاد و بەرکار لە زمانی ویژەیی سۆرانی‌دا شێوەی بێ‌لایەنیان دەبێ ، ژمارە لە شێوەی نیهادو بەرکاردا پێشان‌دەدرێت . لە بواری کوردۆلۆژی‌دا ئەم شێوە دارشتنە لەلایەن لێکۆڵەرەوەکانەوە روون‌کردنەوەی جیاواز جیاوازیان بۆ کراوە ، وەکو ف . یوستی (٦٩ ، ٢٤٣ – ٢٤٥) و ر .جاردن (٦٨ ، ٢٨ –٣٠) کە وای بۆچوون ، ئەم دیاردە رێزمانی‌یە وەکو شێوەی نادیاری فارسی کۆنە . ima tya mana krtam // ئەمە ئەوە ، لەگەڵ من کرا .

لەگەڵ ئەم روون‌کردنەوەو راڤەکردنەوەی ژووروودا نابێ رێك‌بکەوین بەر لەهەموو شتێك لە زمانی کوردی ئەمرۆدا ئەم بارە لە شێوەی نادیاردا نییە ، بەڵکو لە شێوەی دیارو چەسپیودایە ، بۆ وێنە ، کە دەڵێ : من کر ئەوە ناگەیەنێت ، کە لەگەڵ من کرا .

من چووك گرت ئەوە ناگەیەنێت ، کە چووك لە لایەن منەوە گیرا هتد . . ئەم دارشتنە بۆ ئەو جۆرە کارانە بەکاردێت ، کە تێپەرو رابوردوون .

لە زمانی کوردی ئەمرۆدا شێوەیەکی تایبەتی کاری نادیار هەیە ، کە لە رووی نێوەرۆك‌و دارشتنەوە لەگەڵ دارشتنی کاری تێپەری رابوردوو جیاوازە کاری تێپەری رابوردوو لە کرمانجی‌دا لەرووی رواڵەتی دەرەوەی‌دا لەگەڵ فارسی کۆنی (ima tya mana krtam) دا رێك دەکەوێت ، بەڵام ئێمە بەڵگەیەکی مێژوویمان بەدەستەوە نییە ، بۆ ئەوەی بڵێین ئەم جۆرە دارشتنەی کاری تێپەری رابوردوو لە کوردی‌دا بەردەوامی راستەوخۆی فارسی کۆنە .

تاکە بناخەیەکی دارشتنی ، کە لەم دارشتنەی باسکراودا نێزیك بێت و خزمەتی ئەم بیرەی سەرەوە بکات دارشتنی ناوی کراوی کاری تێپەری رابوردووە هەرچ بەڵگەو بیانوویەکی دی ، کە بۆ ئەم گرێیانە بەسوودبێت نییە . نێوی (دارشتنی نادیار) لە زمانی ئەمرۆدا پڕ بەپری نێوەرۆکەکەی نییە ، ب .ڤ . میللەر ئەم پێکهێنانەی بە دارشتنی ئێرگەتیف (sergative) نێو بردووە (مەبەست لە ئێرگەتیف ئەو شێوە دۆخانەی هێندیك زمانە ، کە سەرچاوەی رووداو لەگەڵ کاری نادیاردا پێشاندەدات ، وەرگێر) ، کە ئەم زاراوەیەش لە هیچ کام لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بۆ ناونانی ئەم جۆرە دارشتنە ناگەیەنێت و دەست نادات . ئێرگەتیف ئەو دارشتنە دەگرێتەوە ، کە نیهادی رستەکە لەگەڵ کاری تێپەردا شێوەیەکی تایبەتی بێت ، کە جیاوازبێت لەگەڵ هەموو جۆرە دۆخەکانی دی . ئەو کارەی کە برێتیە لە گوزارە لەگەڵ نیهادوا رێك ناکەوێت ، بەڵکو لەگەڵ بەرکاری راستەوخۆدا .

شێوەی نیهاد لە زمانی کوردیدا لەم جۆرە دارشتنەدا ، لە دۆخی تیاندا دەبێت . لەو دوو دۆخانەی ، کە هەن (راستەوخۆوتیانو بێ لایەن) دەبێ . لە زمانی وێژەیی سۆرانیداو کە هەر تەنیا ئەم شێوەیەش لەم دیالێکتەدا هەیە .

لێرەدا ناتواندرێ ئەمانە لە دۆخی ئێرگەتیفیش دابنێن . بەم لێکدانەوەیە ئەوە روون دەبێتەوە ، کەوا زاراوەی دارشتنی ئێرگەتیڤی تایبەتێتی کاری تێپەری رابوردووە لە دیالێکتی ژووروو و دیالێکتی خوارووش دا .

ئوسکارمان لەو بەشە رێزمانییە کورتەی ، کە لەگەڵ تێکستی موکریدا نووسیویەتی ئەم دارشتنەی کاری تێپەری رابوردووی بە دارشتنێکی تایبەتی دانوە ، کە لە ئەنجامی پێوەلکانی جیناوی لکاو بەناوی کراوەوە دادەرێژرێت مان لەو باوەردابووە ، کە ئەم جۆرە دارشتنە لە دارشتنی زمانی کۆنی فارسی نێزیکە ، بەلام لە رووی نێوەرۆکەوە لەگەڵ ئەم زمانە کۆنەی فارسییەدا یەك ناگرێتەوە .

د .ن .مەکەنزی لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا ، ئەوانەی دەربارەی دیالێکتەکانی کوردین . ئەم جۆرە دارشتنە لە دیالێکتی خوارووداە بە نێوی (agentia) بەواتا نوێنەر وەیا جێگرو لە بادینانداە بەنادیار دەبات . د .ن . مەکەنزی لە روونکردنەوەکەیدا ئەم دارشتنەی ، کە لە کاری رابوردوووەوەیە لە دیالێکتی خوارووە و ژووروودا لە رووی شێوەو نێوەرۆکەوە بەراوردکردووە .

ئەم جۆرە بەراوردکردنە لە زمانی ئەمرۆدا بۆ ئەم دارشتنە بەکارێکی بێ بناخەو ناراست دەژمێردرێت ،چونکە ئەم کارەی یەکێتی هەردوو دیالێکتەکە لێك دوور دەخاتەوە ،کە

هەردوویان بە شێوەیەکی گشتی خێوی یەك جۆرە دارشتن ، بەم جۆرە ، ئەم روونکردنەوەیەی مەکەتری پرسیاری یەكبوونی ئەم جۆرە دارشتنە لە رووی بنچینەو سیمانتیکەوە لەنێودەبات .

لە کوردەوانی سۆڤیەتیدا زاراوەی دارشتنی ئۆبێکتی بەکارهاتووە ، کە پر بە پری ئەم دارشتنەیە لە دیالێکتی ژووروودا . بوونی ئەم جۆرە دارشتنە لە دیالێکتی خوارووش‌دا ئێمە پێشنیازدەکەین ، کە زاراوەی (دارشتنی ئۆبێکتی‌و بێ‌ئۆبێکتی) بۆ بەکاربێت ، کە وەنەبێ هەر شێوەی دەرەوەی ئەم دارشتنە بەڵکو نێوەرۆکەکەشی لەهەردوو دیالێکتەکەدا دەگرێتەوە .

٢٨١ - بۆ دیارخستنی پێوەندی کاری تێپەری رابوردوو لە هەردوو دیالێکتەکەدا پێویستە دوو جۆرە رستە پێشانبدرێ . رستەیەك لەگەڵ بەرکاری راستەوخۆو دارشتنەکەشی ئۆبێکتی بێت‌و رستەیەکیش بە بێ بەرکاری راستەوخۆ بێت ئۆبێکتیشی نادیاربێت . بەراوردکردنی شیکردنەوەی تەواوی ئەم جۆرە دارشتنە بنچینەکەی پێشاندەدات . لێرەدا بوونی جێ‌ناوی لکاو سەرهەڵدەدات ، کە کاری تێپەری رابوردوو لە دیالێکتی خوارووڤدا بێ‌جێ‌ناوی لکاو نابێت ، هەر وەکو چۆن کاری تێپەری رابوردوو لە دیالێکتی ژووروودا بێ‌جێ‌ناوی کەسی دۆخی تیان نابێت .

## دارشتنی بێ‌ئۆبێکتی

٢٨٢ - لە دیالێکتی ژووروودا یەك جۆرە دارشتنی کاری تێپەری رابوردوو بۆ هەموو کەسەکان ژمارەی تاك‌و کۆ هەیە ، بەڵام لە دیالێکتی خوارووڤدا بە پێچەوانەی دیالێکتی ژووروو لەگەڵ ئەم کارەدا جێ‌ناوی لکاوی جۆری دووەم دێت (بروانە بەندی ژمارە ١٥٩ ، ١٦٢ ، ١٦٦) ، کە لە رووی شێوەوە پێشان دەدرێت‌و کۆتایی کەسی کارەکەن ، نەبوونی نیهاد لە رووی رێزمانەوە لەم جۆرە دارشتنەی دیالێکتی کرمانجی ژووروودا نابێ ، هەروەکو چۆن کارەکە لە رووی پێوەندی کەس‌و ژمارەوە بێ‌لایەنەو بریتیە لە بناخەی کاری رابوردووەوە ، دیارنەبوونی نیهاد لە سۆرانی‌دا کار ناکاتە سەر بیری دارشتنەکە ، چونکە جێ‌ناوی لکاو جێگری گیرانی دەوری نیهادە . بۆ ناکردنی ئەم جۆرە دارشتنەش پیتی (نە) بە پێش کارەکەوە دەکەوێت لە کرمانجی‌دا ، (من نەکر) لە سۆرانی‌دا (نە) لەگەڵ جێ‌ناوی لکاو لێك‌دەدات‌و بەهەردووکیان بەپێش کارەکە دەکەون ، من نەمکرد ، نەمکرد .

یەکبوونی شێوەی ناکراوی کار لە دیالێکتی ژووروو و خوارووڤدا لە رووی شوێنی پیتی (نە) ، بەپێش کارەکەوە دەکەوێت لەم شێوانەدا جێ‌ناوی لکاو بە کۆتایی کارەکەوە نالکێت ، بکو بە (نە) وە دەلکێت‌و دەکەوێتە پێش کارەوە :

## شێوەی رابوردووی سادە

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | من | من کردم |
| دووەمی تاك | تە | تۆ کردت |
| سێیەمی تاك | وی کر | ئەو کردی |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مە | ئێمە کردمان |
| دووەمی کۆ | وە کر | ئێوە کردتان |
| سێیەمی کۆ | وان | ئەوان کردیان |

## شێوەی ناکراوی

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | من | (من) نەمکرد |
| دووەمی تاك | تە نەکر | (تۆ) نەتکرد |
| سێیەمی تاك | وی | (ئەو) نەیکرد |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مە | (ئێمە) نەمانکردن |
| دووەمی کۆ | وە نەکر | (ئێوە) نەتانکرد |
| سێیەمی کۆ | وان | (ئەوان) نەیانکرد |

وێنە :

ئینجا وەکو ووتمان ئازادو نەوزاد هەریەگ بەرەنگێگ ناویان دەرکرد ، هیوا ، ژمارە – ە – ١٩٥٧ .

ئیجار چاوا مە گوت ئازادو نەوزاد ناڤێ خوە دەرخستن – کرمانجی

کور ووتی : (کاکە گیان ئێژ من بە دوای ئەچم بۆ لای مەرازی خۆمەوە ، مەکەتری – ٨) .

کور گۆت : برا جان د ها ئەزێ بەدووا هەرم بەر بەمەرامێ خوە – کرمانجی لەناکاو دیتم قوماندانێك بە لەشکەرەوە فەرمانی پاوشای هێناوە (چیرۆکی زادیج – ١٢٧ .

نشکێڤا می دیت ، کو قوماندارەکی بەئەسکەرڤا فەرمان پادشا ئانین – کرمانجی نەم سوتاند ، چیرۆکی زادیج – ٩٤ .

من نەشموتاند – کرمانجی .
سێتۆك دیتی ، چیرۆکی زادیچ – ٨٩ .
سیتۆك دیت – کرمانجی .
وویتان ، کە مادەم وایە ئیمەنشی بکوژە ، مەکەمزی – ١٨ .
وان گۆت ، کو ووسانە مەژی بکوژە – کرمانجی .

### شێوەی رابوردووی نێزیك

بۆ دارشتنی کاری ناکراوی شێوەی رابوردووی نێزیك (نە) بەپێش کارە تێپەرەکەوە دەکەوێت لە دیالێکتی ژووررووودا کۆتایی کەسی کاری پێوەست بە کۆتایی ناوی بکەرەوە دەلکێت و لە دیالێکتی خوارووودا لە باری ناکراودا (نە) بەپێش کار دەکەوێت و چێناوی لکاویش بە (نە)وە دەلکێت ، لە باری چەسپیودا چێناوە لکاوەکان بە کۆتایی کارەکەوە دەلکێت :

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | من | من کردوومە |
| دووەمی تاك | تە کری‌یە | تۆ کردووتە |
| سێیەمی تاك | وی | ئەو کردوویە |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مە | ئێمە کردوومانە |
| دووەمی کۆ | وە کری‌یە | ئێوە کردووتانە |
| سێیەمی کۆ | وان | ئەوان کردوویانە |

### شێوەی ناکراو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاگ | من | نەم کردووە |
| دووەمی تاگ | تە نەکری‌یە | نەت کردووە |
| سێیەمی تاگ | وی | نەی کردووە |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مە | نەمان کردووە |
| دووەمی کۆ | وە نەکری‌یە | نەتان کردووە |
| سێیەمی کۆ | وان | نەیان کردووە |

وێنه :

ووتی : کاکه گیان به خوا من هێناومه ، پشنجا نازانم ئەوەیانه ، مەکەمزی – ٤٤ گۆت :
کاکێ جان بـخودێ مه ئانی‌یه ، نها نزانم ئەوه یان نا کرمانجی
ئەگەر بیستووته تکا ئەکەم بۆمان باس بکه ، مەکەنزی – ٧٢ ئەگەر ته بهیستی‌یه لاڤا دکم ژمەرا بێژه – کرمانجی .

له مەیدانی دلێریدا خۆی نەنواندووه ، خۆی تاقی‌نەکردۆتەوه ، چیرۆکی زادیچ .
دمەیدانا دلێرێدا خوه نیشاننەکر ، خوه نەجرباند – کرمانجی .

## شێوەی کاری رابوردووی دوور

له رستەی بێ تۆبێکتی له دیالێکتی ژووروودا کاری یارمەتیدەر شێوەی بێلایەنی دەبێت . له دیالێکتی خوارووداجێناوی لکاو به کۆتایی کاری یارمەتی‌دەرەوه دەلکێت ، له شێوەی ناکراودا چیێناوی لکاو به (نه)وەو دەلکێت بەپێش کارەکەوەو دەکەون ، لەم بارەدا لەگەڵ دیالێکتی ژووروودا یەگ‌دەگرنەوه :

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | من | من کردبودم |
| دووەمی تاك | ته کربوو | تۆ کردبووت |
| سێیەمی تاك | وی | ئەو کردبووی |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مه | ئێمه کردبوومان |
| دووەمی کۆ | وه کربوو | ئێوه کردبووتان |
| سێیەمی کۆ | وان | ئەوان کردبوویان |

### شێوەی ناکراو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | من | من نەمکردبوو |
| دووەمی تاك | ته ژکربوو | تۆ نەتکردبوو |
| سێیەمی تاك | وی | ئەونەیکردبوو |
| | وێ | |

| یەکەمی کۆ | مە | ئێمە نەمانکردبوو |
| --- | --- | --- |
| دووەمی کۆ | وە نەکربوو | ئێوە نەتانکردبوو |
| سێیەمی کۆ | وان | ئەوان نەیانکردبوو |

### شێوەی : رابوردووی بەردەوامی

دارشتنی کاری رابوردووی بەردەوامی لە هەردوو دیالێکتەکەی ژووروو خواروو وەکو یەکن . لە سۆرانیدا جێناوی لکاو بە پێشگری (دە//ئە)وە دەلکێت لە باری چەسپیودا وە لەباری ناکراودا بە (نە)وە دەلکێت :

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاک | من | من دەمکرد |
| دووەمی تاک | تە دکر | تۆ دەتکرد |
| سێیەمی تاک | وی | ئەو دەیکرد |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مە | ئێمە دەمانکرد |
| دووەمی کۆ | وە دکر | ئێوە دەتامەکرد |
| سێیەمی کۆ | وان | ئەوان دەیاکرد |

### شێوەی ناکراو

| | | |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاک | من | من نەمدەکرد |
| دووەمی تاک | تە نەدکر | تۆ نەتدەکرد |
| سێیەمی تاک | وی | ئەو نەیدەکرد |
| | وێ | |
| یەکەمی کۆ | مە | ئێمە نەماندەکرد |
| دووەمی کۆ | وە نەدکر | ئێوە نەتاندەکرد |
| سێیەمی کۆ | وان | ئەوان نەیاندەکرد |

وێنە :

مندالأنی نەیان دەهێشت خەو بچێتە چاوی کاکە مامەندەوە ، رەحیمی قازی - ۸
مندالانێد وی نەدهشت خەو بکڤە چاڤێ کاکێ مامەند - کرمانجی .

لە دڵی خۆما ئەمووت ، هیوا ژمارە ۵ - ۱۹۵۷ .
لـدلێ خوەرا من دگوت - کرمانجی .

ئەمویست شتێک بکەم نەشم ئەزانی چ بکەم حەزم ئەکرد قسە بکەم ، هیوا ، ژمارە - ۵ ، لاپەرە - ۵ - ۱۹۵۷ .
من دخوەست تشتەك بکم من نزانی چ بکم من حەز دکر قسە بکم - کرمانجی .

## دارشتنی ئۆبێکتی

۲۸۳ - شێوەی دارشتنی ئۆبێکتی لەگەڵ کاری تێپەردا لە رستەی دیالێکتی ژووروودا بەرکار راستەوخۆ دەبێت ، هەروەکو لەمەوپێش ووترا . نیهادی لە دۆخی تیان‌دا دەبێت ، کارەکە لەگەڵ بەرکاری راستەوخۆدا یەک‌دەگرێت ، لە دیالێکتی خوارووداو بەرکارو نیهاد شێوەی بێلایەنیان دەبێت . جێناوی لکاو بە بەرکارە وە دەلکێت ، کار لەگەڵ هیچیان دا رێک ناکەوێت . لە سۆرانی‌دا کاری رستەی ئۆبێکتی لە رووی شێوەوە لەگەڵ کاری هەمان دارشتن لە کرمانجی‌دا وەکو یەک نین ، بەلاّم رستەی بێ‌ئۆبێکتی دا لە رووی شێوەوە لە هەردوو دیالێکتەکەدا وەکو یەکن :

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | کور ئەز دیتم [1] | کور منی دیت |
| دووەمی تاك | کور تو دیتی | کور تۆی دیت |
| سێ‌یەمی تاك | کور ئەو دیت | کور ئەوی دیت |
| - | ژنێ ئەو دیت | ژن ئەوی دیت |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم | کور ئێمەی دیت |
| دووەمی کۆ | کور هون | کور ئێوەی دیت |
| سێ‌یەمی کۆ | کورئەوان | کور ئەوانی دیت |

(۱) - کاك وریا عومەر ئەمینیش هەروەکو دکتۆر قەناتی کوردۆ باسی دارشتنی ئۆبێکتی دەکا ، بروانە کاروان . ژمارە ۲ . ۱۹۸۲ ، لاپەرە ٤۱ - ٤۳

| | | |
|---|---|---|
| | ژنی کور | ژن کورەکانی دیت |
| یەکەمی تاك | کور ئەز نەدیتم | کور منی نەدیت |
| دووەمی تاك | کور تو نەدیتی | کور تۆی نەدیت |
| سێیەمی تاك | کور ئەو نەدیت | کور ئەوی نەدیت |
| | ژنێ ئەو نەدیت | ژن ئەوی نەدیت |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم | کور ئێمەی نەدیت |
| دووەمی کۆ | کور هون | کور ئێوەی نەدیت |
| سێیەمی کۆ | کور ئەو(ان) نەدیتن | کور ئەوانی نەدیت |
| | ژنێ کور | ژن کورەکانی نەدیت |

وێنە :

بەیانی نانیان خوارد . مەکەنزی -٦٠

سێ وان نان خوەر -- کرمانجی

چیرۆکم خوێندەوە . ڕێزمانی کوردی - ١١٩

من چیرۆك خوەند -- کرمانجی

شوشەکەمان شکاند . ڕێزمانی کوردی -١٢١

مە شوشە شکێناند -- کرمانجی

خانوکەتان فرۆشت . ڕێزمانی کوردی -١٢١

وە خانی فرۆت - کرمانجی

کور هاتە دەرەوە قالیچەی داخست . لە سەری دانیشت . مەکەنزی -٦٢

کور هاتەدەر . خالیچە راخست لسەر روونشت - کرمانجی

پیرەژن چووە ژوورەوە . دەرگای داخست . مەکەنزی -٢٦

پیرەژن چوو ئۆتاخێ دەرگە داخست - کرمانجی

شێوەی رابوردووی نێزیك

باری چەسپیو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | کور ئەز دیتمە | کور منی دیتووە |
| دووەمی تاك | کور تو دیتیێ | کور توی دیتووە |
| سێیەمی تاك | کور ئەو دیتیە | کور ئەوی دیتووە |

| | | |
|---|---|---|
| | ژنێ کور دیتی‌یە | ژن کوری دیتووە |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم دیتنە | کور ئێمەی دیتووە |
| دووەمی کۆ | کور هوون دیتنە | کور ئێوەی دیتووە |
| سێیەمی کۆ | کور ئەو(ان) دیتنە | کور ئەوانی دیتووە |
| | ژنی کور دیتنە | ژن کورەکانی دیتووە |

**باری ناکراو**

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | کور ئەز نەدیتمە | کور منی نەدیتووە |
| دووەمی تاك | کور تو نەدیتی | کور تۆی نەدیتووە |
| سێیەمی تاك | کور ئەو نەدیتی‌یە | کور ئەوی نەدیتووە |
| | ژنێ کور نەدیتی‌یە | ژن کوری نەدیتووە |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم نەدیتنە | کور ئێمەی نەدیتووە |
| دووەمی کۆ | کور هون نەدیتنە | کور ئێوەی نەدیتووە |
| سێیەمی کۆ | کور (ەو(ان) نەدیتنە | کور ئەوانی نەدیتووە |
| | ژنێ کور نەدیتنە | ژن کورەکانی نەدیتووە |

وێنە :

ئەمن ئەگەر کوری تۆ نیم بۆچیت کردوومە کوری خۆ؟ مەکەلزی – ١٥٠
ئەگەر ئەز نە کورێ تەمە ، چی تە ئەز کرمە کورێ خوە ؟ – کرمانجی
من خاوەنی ئەم نامەیەم نەدیوە ، بەلأم ناوم بیستووە ، چیرۆکی زادیج – ١٢٧
من خوەنێ ڤێ نامێ نەدیتی‌یە ، لێ من ناوێ وی بهیستی‌یە – کرمانجی
رەفیقەکانم بەجێ‌هێشتووە ، ئەبێ بگەرێمەوە بۆ لایان ، مەکەنزی –٨
من هەڤالێت خۆ و جێ‌دا هێشتنە ، دبیت ئەز ڤەگەرم جەم وان – کرمانجی
من ئەرۆم وبزانم بۆچی برامی وا دەولەمەند کردووە ، ئەمنی وا فەقیر کردووە ، مەکەنزی
–٦٤
ئەز هەرم بزانم بۆچ ئەوی برائێ من دەولەمەند کری‌یە ، ئەز وا فەقیر کرمە – کرمانجی

رابوردووی دوور (باری چەسپیو)

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | کور ئەز دیتبووم | کور منی دیتبوو |
| دووەمی تاك | کور تو دیتبووی | کور توی دیتبوو |
| سێیەمی تاك | کور ئەو دیتبوو | کور ئەوی دیتبوو |
| | ژنێ کور دیتبوو | ژن کوری دیتبوو |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم دیتبوو | کور ئێمەی دیتبوو |
| دووەمی کۆ | کور هوون دیتبوو | کور ئەوانی دیتبوو |
| سێیەمی کۆ | کور ئەوان دیتبوو | کور ئەوانی دیتبوو |
| | ژنێ کور دیتبوو | ژن کورەکانی دیتبوو |

باری ناکراو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | کور ئەز نەدیتبووم | کوری منی نەدیتبوو |
| دووەمی تاك | کور تو نەدیتبووی | کور تۆی نەدیتبوو |
| سێیەمی تاك | کور ئەو نەدیتبوو | کور ئەوی نەدیتبوو |
| | ژنێ کور نەدیتبوو | ژن کوری نەدیتبوو |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم نەدیتبوو | کور ئێمەی نەدیتبوو |
| دووەمی کۆ | کور هوون نەدیتبوو | کور ئێوەی نەدیتبوو |
| سێیەمی کۆ | کور (ەو(ان) نەدیتبوو | کور ئەوانی نەدیتبوو |
| | ژنێ کور نەدیتبوو | ژن کورەکانی نەدیتبوو |

وێنە :

زادیج وەختو سەعاتی خۆی جوان دابەش‌کردوو ، پێش نیوەرۆژ ئیش‌وکاری عالەمی بەجێ دەهێنا . چیرۆکی زادیج - ٤٨

زادیج وەختو سەعاتا خوە باش پارڤەکروو بەری نیڤ‌رۆژ ئیش‌و کارێ عالەمی دانی سەری - کرمانجی

سەری خۆیان داخستبوو . پشتیان کوور کردبۆوە ، دەستیان خستبۆ ناو گیرفانەوە ، بزانن چۆن هەڵ ئەبەرن . چیرۆکی زادیج - ١٠٤ وان سەرێ خوە کربوو بەر خوە ، پشتا خوە کوور کربوو . دەستێ خوە کربوو جێیا خوە بزانن وێ چاوان برەڤسن - کرمانجی .

## رابوردووی بەردەوامی
### باری چەسپیو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | کور ئەز دویتم | کور منی دەدیت |
| دووەمی تاك | کور تو ددیتی | کور تۆی دەدیت |
| سیٚیەمی تاك | کور ئەو ددیت | کور ئەوی دەدیت |
| | ژنیٚ کور ددیت | ژن کوری دەدیت |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم ددیتن | کور ئیٚمەی دەدیت |
| دووەمی کۆ | کور هوون ددیتن | کور ئیٚوەی دەدیت |
| سیٚیەمی کۆ | کور ئەو(ان) ددیتن | کور ئەوانی دەدت |
| | ژنیٚ کور ددیتن | ژن کورەکان دەدیت |

### باری ناکراو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | کور ئەز نەددیتم | کور منی نەدەدیت |
| دووەمی تاك | کور تو نەددیتی | کور تۆی نەدەدیت |
| سیٚیەمی تاك | کور ئەو نەددیت | کور ئەوی نەدەدیت |
| | ژنیٚ کوی نەددیت | ژن کوری نەدەدیت |
| یەکەمی کۆ | کور ئەم نەددتین | کور ئیٚمەی نەدەدیت |
| دووەمی کۆ | کورهوون نەددیتن | کور ئیٚوەی نەدەدیت |
| سیٚیەمی کۆ | کور (ئەو(ان)نەددیتن | کور ئەوانی نەدەدت |
| | ژنیٚ کور نەددیتن | ژن کورەکان نەدەدیت |

وێنە :

کابرایەك بە پیاوەتی‌دا بوویە ، پینەچێتی ئەکرد ، چی دەست بکەوتایە ئەیدا بە کولێرەو پیٚخۆرەك ،ئێواران لەگەلٚ خۆی ئەی‌هێنایەوە ئەیان‌خوارد ، هیوا – ۱۹۵۷ مێرەك مەرۆڤێتیدا بوو پینەچی دکر . چ دەست بکەبتا ئەو ددا کولێرو پێخوەرن ، ئێڤاران ب خوەرادانی دخوەر – کرمانجی .

٢٨٤ – لە دیالێکتی ژووروودا لەو رستانەدا ، کە تۆبێکتین هێندیك جار دیاردەی رێککەوتنی کاری تێپەری رابوردوو لەگەڵ نیهاددا دەبێت :

**وەردا دێ رابوو ، چار خولامێ خوە هلدا ، فۆلکلۆری کرمانجی –١٠٨**

**کەرو کولکێ سلێمین هاتن بلە جان ئانین ، فۆلکلۆری کرمانجی –١٠٣**

**هەردوو برا گلێی قەرەتاژدین قبوولکرن ، هەسپا مەمێ دانە کشاندنێ ، یەکێ دزگن گرت ، یەکێ زین لێکر ، مەمێ سیارکرن ، فۆلکلۆری کوردی – ٢٧٤**

دەبینین ، کەوا رێکەوتنی گوزارە لەگەڵ نیهادی لۆگیکی‌دا لەو بارانەدایە ، کە سوبێکتی رووداو کەسی سێ‌یەمی بێت ، دیاردەی کەسی یەکەمو دووەم بەرچاونەکەوتووە . لەم وێنانەی خوارەوەدا ، کە نیهاد برێتیە لەناو وەیا جێ‌ناو ، کە لە چوار رستە پێك‌هاتووە ، لە روودانی‌دا نیهادو کار رێك‌کەوتوون :

١ – ژنێ (ئەوی) نامە نڤیسی

٢ – ژنێ (ئەوێ) نامە نڤیسین

٣ – ژنان (ئەوان) نامە نڤیسی

٤ – ژنان (ئەوان) نامە نڤیسین .

لەم رێککەوتنە رێککەوتەدا ، کە ریچکەی کار بەرەو سوبێکتی رستەکە پێشان‌دەدات ، بۆی هەیە تۆبێکتیش لەگەڵ بێت ، باوەکو لە رووی شێوەوەشی لە دۆخی تیان‌دا بێت .

٢٨٥ – بەم جۆرە لە دیالێکتی ژووروودا دارشتنی کاری بێ‌تۆبێکتی لە شێوەکانی رابوردوودا یەك جۆرە شێوەی هەیە ، کە لەگەڵ کەسی سێ‌یەمی تاکی کاری تێنەپەردا یەك دەگرێتەوە . لێرەدا بوونی نیشانەی رێزمانی نیهاد بۆ کەسی یەکەمو دووەمی هەموو شێوەکانی کاری رابوردوو پێویستە ، کە هەمیشە لە دۆخی تیان‌دا دەبێت ، جا چ برێتی بێت لە ناو وەیا جێ‌ناو .

جیاوازی نێوان دیالێکتی ژووروو لەگەڵ دیالێکتی خوارووودا لە نەبوونی نیشانەی رێزمانی نیهادە لە دارشتنی بێ‌تۆبێکتی‌دا ، کە نەبوونیشی هیچ واتایەکی گوتراو ناگۆرێت ، چونکە جێ‌ناوی لکاو کەس و ژمارەی نیهاد دەردەبرێت پێشان‌دەدات . واتای رێزمانی جێ‌ناوی لکاو هەروەکو لە سەرەوەدا هاتووە لەگەڵ شێوەی تیانی جێ‌ناوی لکاوی دیالێکتی ژووروودا رێك‌دەکەوێت ، بەم جۆرە دارشتنی بێ‌تۆبێکتی دیالێکتی ژووروو و خواروو لێك‌نێزیك دەبنەوە ، بەلام شێوەی کارەکانیان یەك‌چینن .

پێوەلکانی جێ‌ناوی لکاو بە کاری رابوردووەوە بە تایبەتێتیکی دیالێکتی خواروو دەژمێردرێ ، بەلام ئەم پێوەلکانە هەر لە رووی شێوەوەیە ، چونکە جێ‌ناوی لکاو هەر لە باری

چەسپیویە ب کهرەو د لکێتـر ل باری لهکرهوده ب پیتی لهکریلەر د لکێتـر ب ە ردوریال وە دەك ون پێش کار کەر ، هەررا ي ك رنە نێرال نیخهن ی ڕێزمانیو کارەکەوەش لە دارشتنی رابوردووی بەردەوامیدا . ئەم جێگۆرگییەی جیٚناوی لکاوو مانەوەی کاری رابوردوو بە تەنیا . ئەم شێوەیەی لەگەڵ کاری رابوردووی دیالێکتی ژووروودا ڕێك‌دەکەوێت بەم جۆرە شیکردنەوەی دارشتنی ئۆبێکتی و بیٚ ئۆبێکتی لەم دیالێکتە وەیا لە ئەوەی دیدا تایبەتێتی دیالێکتی دەست‌نیشان دەکات ، بۆ وێنە لە دارشتنی ئۆبێکتیدا لە دیالێکتی ژووروودا گەردانکردنی کاری تێپەر تایبەتەو تایبەتێتی دیالێکتی خوارووش بەکارهاتنی جیٚناوی لکاوە .

## دەمکات

٢٨٦ – لە زمانی کوردیدا دەمکات بەدوو ڕێگەوە دەردەبرێت یەکەمیان بەهۆی گەردانکردن ، دووەمیان بەهۆی شیکردنەوە :

لە دیالێکتی ژووروو و خوارووودا دەمکاتی دیار ، نێوەراست ، نادیار ، ئیلزامی ، خۆیی هەیە .

دەمکاتی دیار لەنێو گەردانکردنی کاری تێپەردا لە شێوەی ڕانەبردوو و ڕابردوودا پێوەندی نێوان سوبێکتو ئۆبێکت پێشاندەدات ، لەوکاتەدا ، کە کەتیگۆری ڕێزمانی نیهادو بەرکار لەگەڵ کەتیگۆری سوبێکتیو ئوبێکتیدا ڕێك‌دەکەون ، هەروا لە شێوەکانی کاری ڕابردوودا . کاتی ، کە شێوەی ڕێزمانی لەگەڵ کەتیگۆرییەکاندا ناگونجێن بەواتە ، کە سوبێکتی ڕووداوەکە لە دۆخی تیانو بەرکاریش لە دۆخی ڕاستەوخۆدا دەبێت .

دەمکاتی نێوەراست هیچ پێوەندیەکی نێوان سوبێکتو ئوبێکتو ڕووداو پێشاننادات ، لەم بارەدا وەکو بڵێی ڕووداوەکە هەر لەنێو سوبێکتەکەدا ڕوودەدات وایە .

لە دەمکاتی نێوەراستدا کار لە هەموو کاتو شێوەکانیدا لەگەڵ سوبێکتی ڕووداو ڕێك‌دەکەوێت (بڕوانە بەندی ژمارە ٢٦٦ – ٢٧٩)

لە دیالێکتی ژووروو و خوارووودا بۆ دەرخستنی پێوەندی دەمکاتی نادیار شێوەی تایبەتی کارەکە هەیە . ئەم دارشتنە لە دارشتنی دەمکاتی نادیاری زمانی ڕووسیدا پێك‌دەچێت ، وەك ئەم وێنەیە : خانوو لەلایەن کرێکارانەوە بنیات دەندرێت .

(gom ctpouTcя Pusozumu.) هەروا شێوەکەی دی دارشتنی نادیار (gom noctpoe H.)

خانوو بنیات نرا .

له زمانی کوردی‌دا دارشتنی نادیار وەنەبێت هەر لە نادیاردا بەکاربێت ، بەڵکو بە شێوەیەکی فراوان لەگەڵ ئەو دارشتنانەش بەکاردێت ، کە نیهاد نادیارەو بەرکاریش لە رستەکەدا نییەو سوبێکتی رووداوەکە ئەم دەورە دەبینێ و بەدیاری دەخات .

شێوەی ئیلزامی کار وەنەبێ پێوەندی نێوان سوبێکت بۆ رووداوەکە پێشان بدات ، بەڵکو بەهۆوە دەری دەخات . لە سوبێکتەوە تەنێ دیارخستنی فەرمان بەدیاردەکەوێت هەتا لە رووداوەکە خۆی بەهۆی کەسی نادیارەوە بەدیار دەکەوێت .

### دەمکانی نادیار

٢٨٧ -- دەمکانی نادیار تەنیا لەکاری تێپەرەوە دادەرێژرێت لەگەڵ نیهادی تیانو دۆخی راستەوخۆ لە دیالێکتی ژووروو و دۆخی بێ‌لایەن لە خوارووودا . لە زمانی کوردی‌دا هۆیەکی تایبەتی دارشتنی دەمکانی نادیار لە دیالێکتی ژووروو و خوارووودا نییە . لە دیالێکتی ژووروودا بەهۆی شی‌کردنەوە دادەرێژرێت‌و لە دیالێکتی خوارووودا بەهۆی گەردان کردنەوە .

بۆ دارشتنی بەرکاری تیان ئامرازی پێوەندی ب ، پێ ، ئامرازی ب (بە – سۆرانی) پێش ناو دەکەوێت ، ئامرازی (پێ) تەنێ لەو بارانەدا بەکاردێت ، کە بەرکار بەهۆی رووداو دادەندرێت‌و دەژمێردرێت . لەو بارانەش‌دا ، کە رووداو کەس دەنوێنێت ئامرازی ب (بە --سۆرانی) لەگەڵ ووشەی (دەست)دا لێك دەدرێت .

ئەڤا نامە بقەلەمێ هاتیە نڤیساندن (ێ) .

ئەم نامەیە بە قەڵەم نوسراوە ، سۆرانی .

ئەڤا نامە ب دەستێ عوسمان هاتیە نڤیساندن (ێ)

ئەم نامەیە بە دەستی عوسمانەوە نووسراوە .

لە پاڵ ئەوانەش‌دا لە دیالێکتی خوارووودا هۆیەکی دی بۆ دارشتنی بەرکار هەیە ، کە بە شێوەیەکی فراوان بەکار دێت ، ئەویش لە لێکدانی ئامرازی پێوەندی (لە) لەگەڵ ووشەی لا وەیا لایان ، کە دەکەوێتە پێش بەرکارەوەو پاشکۆی ئامرازی پێوەندی (–ەوە) دەکەوێتە کۆتاییەوە لەلایەن منەوە .

پاش ئەوە ، کە سولەیمان بەگ لەلایەن عوسمانییەکانەوە لەناوبرا (خانزاد – ١٩)

٢٨٨ – لە کرمانجی‌دا هەموو شێوە دارشتنێکی دەمکانی نادیار بە یارمەتی کاری (هاتن)ەوە دادەرێژرێت (بروانە بەندی ژمارە –٢٦٣) لەگەڵ چاوگەی کارەکە ، کە بە بێ یارمەتی دەکەوێتە دوای کاری هاتنەوەو نیشانەی دۆخی تیانی رەسەنی مێ (–ێ) بە چاوگەکەوە دەلکێت :–

ئەز تێم کوتانێ
تۆ تێی کوتانێ
ئەم تێن کوتانێ

کوردستان تێ زیراندن (ێ) ب دەستێ ئیمپریالیستان .

٢٨٩ – لە سۆرانیدا هەموو شێوەکانی دەمکاتی نادیار لە دوو بناخەوە دادەرێژرێت . بناخەی کاری رانەبردوو و بناخەی کاری رابردوو .

بناخەی دەمکاتی نادیار لە بناخەی کاری رانەبردوو و پێوەلکانی پاشگری (–رێ) و (–را) . پێك دێت پاشگری (–رێ) بناخەی کاری رانەبردووی نادیار رۆدەهێلێتو (–را) بناخەی رابردووی نادیار دادەرێژێت .

١ – لە راستیدا بناخەی دەمکاتی نادیار لە بناخەی کاری رانەبردووی دیارەوە پێك دێت :–

| چاوگ | بناخەی رانەبردووی دیار | بناخەی نادیار | |
|---|---|---|---|
| | | رانەبردوو | رابردوو |
| زانین | زان | زانرێ | زانرا |
| نووسین | نووس | نووسرێ | نووسرا |
| هێنان | هێن | هێنرێ | هێنرا |

لە بەشە دیالێکتی سولەیمانیدا لە کاری (چاندن ، سەندن) دەنگی (ر)ی دەکەوێتە نێوان بناخەی کاری رانەبردوو و پاشگرەکەوە :–

| چاوگ | بناخەی رانەبردووی دیار | بناخەی نادیار | |
|---|---|---|---|
| | | رانەبردوو | رابردوو |
| سەندن | سێن | سێن (د)رێ | سێن (د)را |
| چاندن | چێن | چێن(د)ێ | چێن (د)را |
| شکاندن | شکێن | شکێن (د)رێ | شکێن (د)را |

٢ – هێندێك ڕەگی كار بناخەی كاری نادیار دادڕێژێت ، لە بناخەی كاری ڕانەبردوو بە یارمەتی پاشگری (–ێن) ، كە پاشگری (–ڕێ) و (–ڕا) شیان پێوە دەلكێت :–

| | | | |
|---|---|---|---|
| گەزین | گەز | گەزێنرێ | گەزێنرا |
| پۆشین | پۆشن | پۆشێنرێ | پۆشێنرا |
| دۆزین | دۆز | دۆزێنرێ | دۆزێنرا |

٣ – هێندیك كار بناخەی دەمكاتی نادیاری لە بناخەی كاری ڕابردووی دیارەوە دادەڕێژرێت :–

| | | | |
|---|---|---|---|
| بەستن | بەست | بەسترێ | بەسترا |
| ووتن | ووت | ووترێ | ووترا |
| ویستن | ویست | ویسترێ | ویسترا |

٤ – هێندێك كار بناخەی نادیاری بە پێوەلكانی پاشگری (–ڕێ) (–ڕا) بە كۆتایی چاوگەكەوە خۆی ڕۆدەهێڵدرێت

| | | |
|---|---|---|
| دان | دانرێ | دانرا |
| قلشان | قلشانرێ | قلشانرا |

٢٩٠ – شێوەی ڕانەبردوو و داهاتووی دەمكاتی نادیار لە سۆرانی‌دا لە بناخەی ڕانەبردووی نادیارەوە دادەڕێژرێت‌و بە یارمەتی پێوەلكانی كۆتایی كەسی جۆری یەكەم (بڕوانە بەندی ژمارە ٢٦١) .

لە شێوەی ڕانەبردوو و داهاتووی دەمكاتی نادیار لە سۆرانی‌دا لە بناخەی ڕانەبردووی نادیارەوە دادەڕێژرێت‌و بە یارمەتی پێوەلكانی كۆتایی كەسی جۆری یەكەم (بڕوانە بەندی ژمارە ٢٦١) .

لە شێوەی نێزیكی دەمكاتی نادیاردا نیشانەی (وو)ی ناوی بكەر لە وێنەی (و W //) دەبێت :–

ئەم جارە بە تەواوی واها چووە مێشكی‌یەوە ، كە لە ڕۆژی ئەزەل دا لە قەزاو قەدەرەوە نەگبەتی بۆ نووسراوە (زادیج – ١٥٨)

زادیج گوتی : ڕاستە موبدار كوژراوە ؟ (حكایەتی زادیج – ١٠٧)

ئەویش لەبەر چاوم وێرانو تالآن كرا (سەرچاوەی پێشوو – ١٢٥)

خەزنەدار ئەمری‌دا ئەوانی تر هەموویان جەرمە بکرێن ماڵێکی زۆریان لێ بستێندرێ (سەرچاوەی پێشوو - ١٠٤)

مەسۆفینشن بە دیل گیرا (سەرچاوەی پێشوو - ١٤١)

لە بەردەمی ژوورەکە ئالآیەکی سپی هەڵکرا (سەرچاوەی پێشوو - ١٥١)

خانووەکەی منیش تالان‌کرا ، لەوەدا ئاگری تێ بەردرا (سەرچاوەی پێشوو - ١٢٨)

زەنگی رۆژگاری چەرخی ناهەمواری بە ئەرکی ناخۆشی تۆیا ئەبینراوە ئەخوێندرایەوە (زمانی کوردی - ٦٧)

٢٩١ - شێوەی نادیار بۆی هەیە بڕێتی بێت لە هۆی دیش لەوانە ناوی بکەر ، کە لەکاری تێپەری رابردووەوە داڕێژراوە بە یارمەتی کاری پێوەست : ئەز گرتیمە ، تو گرتیی هتد . . .

ئەز گرتیمە ، ئەز گرتیبووم ، ئەزی گرتیبووم .

ئەم دارشتنە باری ئۆبێکتی رووداوەکە دەست نیشان دەکات ، کە لە دۆخی راست‌و خۆدایە .

ئەو ناوە بکەرەی ، کە لە کاری رابردووەوە بە یارمەتی کاری پێوەستەوە بۆ کەسی دووەمی تاك داڕێژراوە (گرتیی) لەگەڵ شێوەی رابردووی نێزیکی کەسی دووەمی تاکدا یەك دەگرنەوە .

ناوی بکەری کەسی سێیەمی تاك ، کە بە هاوکاری کاری پێوەستەوە داڕێژراوە (گرتییە) لەگەڵ شێوەی رابردووی نێزیکی کەسی سێیەمی تاکدا یەك دەگرنەوە .

من تو گرتیی

من ئەو گرتییە

ئەوان گرتیینە

لەو دارشتنانەی ، کە بەشی نیهاد بڕێتی دەبێت لە ناوی بکەرو لە دۆخی راستەوخۆدا دەبێت بەرکار بۆی هەیە لەگەڵ ئامرازی پێوەندی (ب) ، بێت‌و دۆخەکەشی ببێتە تیان .

تۆسن ، لێ دەرێ دکانا دادایینە ، ئەمێ نان ژکیدەرە بینن ؟ -وا ، وایە هلا دەرێ دکانا بووکلیا ڤەکریە ، ئەم هەرن دوو بوولکیا بستینن .

دوورڤە هەردوو مهنیێ میر کو گرێ داینێ (زمان - ٥٠)

چاکەتا من هلاوستی‌یە (کامەران - ١٥)

ئەز چووم ، لێ دەری داخستی بوو .

من چووم ، بەڵام دەرگا داخرابوو - سۆرانی .

گوند ب مێرگینە فرەهـ دۆر گرتبوو (هاوار -٤٧-١٩٤٢)

مەلا دجزیریێ دە چوویە رەحمەتێ . (مەدرەسا جۆر دەڤەشارتییە (هاوار ، ٦ ، ١٩٣٢)
کووچەو کۆلانێن باژێر ب بەرمیێ داگرتی بوو (هاوار-٤ ،١٩٣٢)

## دەمکانی ئیلزامی

٢٩٢ – ان (دن) کە بە پاشگرێکی ئێرانی گشتی دەژمێردرێت لە زمانی ئەمرۆی کوردی‌دا بە شێوەیەکی فراوان بەکاردێت ، بە رادەیەك زۆربەی کارەکان بە یارمەتی ئەوەوە دادەرێژرێن ، لەکاتی رانەبردوودا تەنێ لەگەڵ کاری تێپەردا بەکاردێت ، بەلاّم هێندیك کار واتای ئیلزامیان پاراستووە :

خەوتن – خەوتاندن ، فرین – فراندن ، نالّین – نالاّندن ، نڤیسین –نڤیساندن ، هێران – هێراندن ، سۆتن – سوتاندن .

لە زمانی کوردی‌دا بەهۆی شی‌کردنەوە دەتواندرێت دارشتنی ئیلزامی رۆبهێڵدرێت ، کە لە چاوگی کارەکەو کاری یارمەتی‌دەر (دان) دادەرێژرێت ، لێرەدا (دان) دەکەوێتە پێش چاوگەکەوە . لە دیالێکتی خوارووا دارشتنی ئیلزامی هەر بەم جۆرەی سەرەوە دادەرێژرێت ، بەلاّم ئامرازی پێوەندی بۆ // بە (×) دەکەونە پێش چاوگەکەوە :

لە کاتی رانەبردوودا

ئەز نامێ ددم نڤیساندن / من نامە دەدەم بۆ نووسین

تو نامێ ددی نڤیساندن تو نامە دەدەی بۆ نووسین

لە کاتی داهاتوودا

ئەزی نامێ ددم نڤیساندن / من نامە دەدەم بۆ نووسین .

تویێ نامی ددی نڤیساندن / تو نامە دەدی بۆ نووسین

لە کاتی رابردووی سادەدا لە دارشتنی تۆپێکتی‌دا

ژنێ ئەز دام نڤیساندن .

ژنێ تو دابی نڤیساندن .

لەکاتی رابردووی سادەدا لە دارشتنی بێ تۆپێکتی‌دا .

من دا نڤیساندن .

تە دا نڤیساندن .

---

(×) – لە دیالێکتی کرمانجی خوارووا ئەم جۆرە دارشتنە بە یارمەتی بزوێنی (ە)ش رۆدەهێڵدرێت ، من نامە دەدەمە نووسین تۆ نامە دەدەیە نووسین ، وەرگێر .

له هەموو کاتەکانی ئیلزامی تەنیٚ شێوەی کاری یارمەتی دەری (دان) دەگۆریٚت :--
پێتا ڤی ئاگری ژ مەرا هەر تشتێن ملەت ددە حەزکرنیٚ (زمانی کوردی ، ١١ ، ٢٤٦)
هەلاوی ئەم ئاگرە هەموو شتێکی وولاتمان لیٚ خۆشەویست ئەکا – سۆرانی .
ئەوی دخوەست هەر تشتی بدە زەلال‌کرنیٚ (جگەرخوێن – ٥٤)
ئەو دەیەویست هەر شتیکی بۆ جوانی پیشان‌بدا – سۆرانی
شەرەف ددەکوشتن‌و ئەمارەتا وی دکە دەستیٚ خوە ( مەمیٚ ئالان – ١١١ ×)
شەرەف ئەدا بە کوشتن‌و ئەمارەتی داگیردەکا – سۆرانی)

### دەمکاتی خۆیی

٢٩٣ – دەمکاتی خۆیی هیچ هۆیەکی مۆرفۆلۆژی نییە ، بەڵکو بەهۆی بەکارهێنانی جیٚناوی خۆیی خوە ( خو – سۆرانی)
لەگەلٚ کاری تێپەردا ، کە هیچ ناگۆریٚت‌و لەرستەدا دەوری بەرکار دەگێریٚت ، کاری تێپەر لەم بارەدا زۆر تایبەتێتی خۆی لە دەست‌داوە و هەموو شێوەکانی کاتی هەروەکو جۆری کاری تێپەرە .
خۆی کردە ئەشکەوتەکەوە (مەکەتری – ٢٦)
خوە کرە شکەفتیٚ .
خوە ئاڤیتە بێسیرا مێر (شڤانیٚ کورد –١٩)
خۆی هاویشتە باوەشی مێرد – سۆرانی
لە ئاخری‌دا سی‌و سیٚ ژنی دیندار خۆیان تەسلیم کرد (زادیج – ١٠٩)
دئاخرێیدا سی‌و سیٚ ژنە دیندار خوە تەسلیم‌کرن .
بۆ ماڵی دنیا خۆم بە شەل‌و کوێر نافرۆشم (زادیج – ١١٠)
بو مالی دنیا ئەز خوە نافرۆشم شلان‌و کۆران .
قەلەندەر خوە گران گرت (شڤانی کورد –٦٧)
قەلەندەر خۆی گران گرت .

٢٩٤ – کاری تێپەر لەگەلٚ جیٚناوی هەڤدوو (یەکتر ، یەکدو)
پێکەوە کارکردن‌و رووداان دەگەیەنێت . ئەم جۆرە پێوەندییە لەم کاتەدا دەبێت ، کە لەنێوان چەند کەسێك رووداوەکە روودەدات‌و لە هەمان کاتیش‌دا بە ئۆیێکتی رووداوەکە دەژمێردرێن .

ئەو کارانەی ، کە لەگەڵ جیٚناوی هەڤدوو ، یەکتر ، یەکدوو بەکاردێن واتای خۆیان لەدەست دەدەن ، بەڵام لەشێوەی رابردووی‌دا وەکو تێپەرە .

هەردوو دلێری نەبەرد یەکتریان ئەهێناو ئەبردە دەستیان کرد بەرمبازی ، رمی کوشتنیان دەوەشاندە یەکتری (زادیج – ١٥٤)

هەردوو دەلیرێ قوچاو هەڤدوو دانین‌و دبرن ، وان دەست ب رمبازێی‌کر ، رمێ کوشتنێ وانا دەوەشاند ، هەڤدوو

٢٩٥ – شێوەی کاری ئیلزامی لەلایەن نووسەرانی ڕێزمانی کوردی‌یەوە زۆر باسکراوە :

لە بەرهەمی ف . یوستی (٦٩ ، ١٨٧)دا شێوەی ئیلزامی‌و داخوازی بەدی‌دەکرێت ، ئەز دی‌کەنین بام ، ئەگەر ئەز چێبکم‌و ئەگەر من چێکری‌یا .

ر . جاردن (٦٨ ، ٢٦ –٢٧) شێوەی Present Subjunctiv پێشان دەدات ، وەك : ئەز بخوەزم‌و شێوەی Perfect Conditional , Future Conditional ، وەك :

هەکە زوو نەهاتیبان ئەو درەفت .

ئێ . سۆن بۆ دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژووروو شێوەی conditional ئەکەوم ، subjunctive بکەوم ، Subjunctive Past بکەتم ، subjunctive Future دبکەوم‌و بکەوم .

هێنانەوەی کاری بکەوم‌و دبکەوم شێوەی دەمکانی ئیلزامیش دەگەیەنێت .

گەردانکردنی کاری کەتن (کەوتن) لەکاتی رابردوودا وەکو کارێکی تێنەپەر جیاوازە لەچاو گەردانکردنی کاری تێپەردا .

ئی . سۆن (٨٠ ، ٤٩ –٥٠ ، ٥٨) لە دیالێکتی کرمانجی خوارووا جیٚناوی لکاوی لەگەڵ بەکار دێنێت بەرای ئێمە کەرەستەی کرمانجی خواروو ئەمە ناچەسپێنێت . گەردانکردنی ئەم کارە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا وەکو کارێکی تێپەرنابێ‌و راست نییە .

د .ن . مەکەنزی‌و ئی . ماکاروس لە بەرهەمەکانیان‌دا زۆر فراوانترو درێژتر باسی ئەم شێوەی ئیلزامی‌یەیان کردووە .

ئی . ماکاروس لە ریزمانەکەی‌دا ، کە سەر بە بەشە دیالێکتی سلێمانییە گەردانکردنی کاری تێپەری بۆ هەر چوار شێوەکەی ئیلزامی‌یەکەی کردووە ، کە ئەمانەن Present Subjunctive – بخۆم ، Preterite Subjunctive – بم‌خواردایە ،

Present Perfect Subjunctive – خواردبم ،

Past Perfect subjunctive – بم‌خواردباوایە .

د .ن . مەکەتری لە بەرهەمەکەیدا گەردانکردنی کاری تێنەپەری ئیلزامی لە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا دەخاتەروو :

Present subjunctive – بکەوم ،

Past conditional – بکەوتمایە ،

Perfect subjunctive – کەوتبم .

١ – Perfect conditional – (ب) کەوتبام .

١١ – Perfect conditional – (ب) کەوتبمایە .

١١ – Perfect conditional – (ب) کەوتباماپە .

هەر لەهەمان بەرهەمدا وێنەی بۆ کاری تێنەپەری ئیلزامی لە دیالێکتی بادینانیشدا هێناوەتەوە :–

Present subjunctive

– بکەڤم ،

Past conditional – بکەتاما ،

Perfect subjunctive

–کە (ڤ) تبم ،

Perfect conditional

– کە (ڤ) بتام[1]

لەگەڵ ئەوەی کەرەستەیەکی زۆری ئەم بابەتە لە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا هەیە ، نووسەر لەکاتی گەردانکردندا جیاوازی لەنێوان ئۆبێکتیو نائۆبێکتی کاری تێپەری دانەناوە .

هەروا ئەم بارە لە بەرهەمەکانی نی . مەکاروسیشدا بەرچاو ناکەوێت ، تەنیٚ لە بەرهەمی رێزمانی نووسەرانی کورد

(ك .ا . بەدرخان ، نوری عەلی ئەمینو هیدی)دا نەبیٚ ی .ی تسوکرمان لە بەرهەمەکەی خۆیدا ، کە دەربارەی زمانی کوردییە (٥٣) بەدووورو درێژی باسی دوو شێوەی ئیلزامی دیالێکتی کرمانجی ژووروی کردووە ، لەباری بکەڤم (بکەتاما) . نووسەر چوار شێوەی ئیلزامی ئەم جۆرە کارانەی لە دیالێکتی ژووروودا پیشانداوە ، بەڵام شێوەی کەتبمو کەتبووما لە بەرهەمەکەیدا باسنەکراوە .

٢٩٦ – بەراوردکردنی کەرەستەی هەردوو دیالێکتەکە بوونی هەر چوار جۆری ئیلزامی

بەگشتی روون دەکاتەوە دووانیان شێوەی رانەبردوو – داهاتووە هی سادەو نەسادەی دووانەکەی دی شێوەی رابردووە هی‌سادەو نەسادەی .

هەموو شێوەکانی ئیلزامی هیڤی ، خواست‌و پێویستی روودانی رووداو لەباری دیارخراودا پێشان دەدات .

## شێوەی سادەی کاری ئیلزامی

۲۹۷ – شێوەی سادەی کاری ئیلزامی رانەبردوو – داهاتووی لەباری تێپەرو تێنەپەری‌دا بە رێگەی پێوەلکانی پێشگری (ب –) بە بناخەی کاری رانەبردووەوە لەگەڵ کۆتایی کەسی جۆری یەکەمدا (۲٦۱) دەبێت .

| کەس | باری چەسپیو کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی‌تاك | ئەگەر ئەز بکەڤم | ئەگەر من بکەوم |
| دووەمی‌تاك | تو بکەڤی | ئەگەر تۆ بکەوی |
| سێیەمی‌تاك | ئەگەر ئەو بکەڤە | ئەگەر ئەو بکەوێ |
| یەکەمی‌کۆ | ئەگەر ئەم بکەڤن | ئەگەر ئێمە بکەوین |
| دووەمی‌کۆ | ئەگەر هین بکەڤن | ئەگەر ئێوە بکەون |
| سێیەمی‌کۆ | ئەگەر ئەوان بکەڤن | ئەگەر ئەوان بکەون |

باری نەچەسپیوی بەیارمەتی پیتی (نە –) دادەرێژرێت ، کە دەکەوێتە پێش بناخەی کارەکەوەو لەو کاتەدا پێشگری (ب –) لەنێو دەچێت :

ئەگەر ئەز نەکەڤم . (ئەگەر من نەکەوم – سۆرانی )هتد

۲۹۸ – شێوەی سادەی کاری ئیلزامی تێپەر لە دیالێکتی کرمانجی خوارووو ژووروودا بەیەك جۆرە رێگەرۆ دەهێلدرێت ، بەلاّم جۆرەکە بۆکاری تێنەپەر زێتر بەکاردێت لەچاوکاری تێپەر .

۲۹۹ – شێوەی سادەی کاری رابردووی تێنەپەری ئیلزامی لە هەردوو دیالێکتەکەدا لە بناخەی کاری رابردوو بە یارمەتی پێشگری (ب –) وپێشگری (ا–) (ایە – سۆرانی) دادەرێژرێت

لە دیالێکتی ژووروودا کۆتایی کەسی جۆری دووەم (۲٦۱) بە (ا–) پتەوترو بەهێزتر

دەکرێت‌و لە دیالێکتی خوارووەدا کۆتایی کەسی جۆری دووەم بە بناخەی کارەوە دەلکێت‌و (–ا–)ش بەهێزدەکرێت .
کاری ئیلزامی لە دیالێکتی ژووروودا ، کە بە یارمەتی پاشگری (–ا) پێك‌دێت‌و هەر لە دوای کۆتایی کەسی م ،ن دا بەکاردێت .
پیتی ناکردنی (نە) شوێنی پێشگری (ب –)ی دەگرێتەوەو بە کارەوە دەلکێت :–

**باری چەسپیو**

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئمز بکەتاما | ئەگەر من بکەوتمایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تە بکەتایی | ئەگەر تۆ بکەوتیتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو بکەتا | ئەگەر ئەو بکەوتایە |
| | کۆ | |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم بکەتانا | ئەگەر ئێمە بکەوتینایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر هون بکەتانا | ئەگەر ئێوە بکەوتنایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەو(ان) بکەتان | ئەگەر ئەوان بکەوتنایە |

**باری ناکراو**

| | | |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئمز نەکەتاما | ئەگەر من نەکەوتمایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تە نەکەتایی | ئەگەر تۆە نەکەوتیتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو نەکەتا | ئەگەر ئەو نەکەوتایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم نەکەتانا | ئەگەر ئێمە نەکەوتینایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر هون نەکەتانا | ئەگەر ئێوە نەکەوتنایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەو (ان) نەکەتانا | ئەگەر ئەوان نەکەوتنایە |

٣٠٠ – شێوەی سادەی کاری تێپەری رابردووی ئیلزامی (بێ تۆبێکتی) بە یارمەتی پاشگری (–ا) (–ایە – سۆرانی دادەرێژرێت ، کە بە بناخەی کاری رابردووەوە دەلکێت ، پێشگری (ب –)لە دیالێکتی ژووروودا بە بناخەی کارەوە دەنوسیت ، بەلام لە دیالێکتی ژووروودا جێناوی لکاو دەکەوێتە نێوان ئەم پێشگرەو بناخەی کارەکەوە :–

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر من بدیتا | ئەگەر من بم دیتایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تە بدیتا | ئەگەر تۆ بت دیتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو بدیتا | ئەگەر ئەو بدیتایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر مە بدیتا | ئەگەر ئێمە بمان دیتایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر وە بدیتا | ئەگەر ئێوە بتان دیتایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر وان بدیتا | ئەگەر ئەوان بیان دیتایە |

لە شێوەی ناکراوی دیالێکتی خواردوودا جێناو بە (نە)وە دەلکێت :–

ئەگەر من نەمکردایە .

ئەگەر تۆ نەتکردایە .

٣٠١ – لە رستەی تۆیێکتی دیالێکتی خواروودا جیٓناوی لکاو بە بەرکارەوە دەلکێت کاریش سەبارەت بەهەموو کەسەکان یەك جۆرە شێوەی دەبێتو پێشگری (ب –)یش لە هەردوو دیالێکتەکەدا بە بناخەی کارەوە دەنووسێت :–

باری چەسپیو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر تە ئەز بدیتاما | ئەگەر تۆ منت بدیتایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر من تو بدیتایی | ئەگەر من تۆم بدیتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەوی ئەو بدیتا | ئەگەر ئەو ئەوی بدیتایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر تە ئەم بدیتانا | ئەگەر تۆ ئێمەت بدیتایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر من هوون بدیتانا | ئەگەر من ئێوەم بدیتایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوی ئەو (ان) بدیتانا | ئەگەر ئەو ئەوانی بدیتایە |

باری ناکراو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر تەئەز نەدیتاما | ئەگەر تۆ منت نەدیتایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر من تونەدیتایی | ئەگەر من تۆم نەدیتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەوی ئەونەدیتایە | ئەگەر ئەو ئەوی نەدیتایە |

| | | |
|---|---|---|
| یەکەمی کۆ | ئەگەر وە ئەم نەدیتانا | ئەگەر تۆ ئێمەت نەدیتایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر مەهون نەدیتانا | ئەگەر من ئێوەم نەدیتایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوی ئەو (ان) نەدیتانا | ئەگەر ئەو ئەوانی نەدیتایە |

٣٠٢ – دەمکاتی شێوەی سادەی ئیلزامی بەزۆری بەکاردێت ، ئەم شێوەیە توانین ، هیڤی داری ، پێویستی‌و مەرجی رووداو لە رابردوو و رانەبردوودا پێشان دەدات . ئەم رستانەی خوارەوە بەڵگەی ئەم واتایانەی کاری ئیلزامین ، کە سەرەوەدا باسمان کرد :–

١ – وێنە بۆ واتای مەرج :–

ئەگەر بەردەکە بکەوتایە بەدەستا ، دەستم ئەشکا ( رۆژی نوێ ، ١ ، ٥٣)

ئەگەر کەڤر ل دەستێ من (ب)کەتا ، دەستێ منێ بشکەستا – کرمانجی

ئەگەر یەکتری بێ سەربەستی ئەبێ (رۆژی نوێ – ١ ، ٦١)

ئەگەر یەکتری ببە ، سەربەستی ببە – کرمانجی .

ئەگەر ئەمت بترسامایە لە مەملەکەتی رۆمێ بەتەنێ نەدەهاتم بۆ ناو دوژمنان (مەکەتری – ١٩٨)

ئەگەر ئەز بتر سیباما ، ژ مەملەکەتێ رۆمێ ب تەنێ نەدهاتمە ناڤ دژمن – کرمانجی .

ئەگەر حەزم بکردایە ، هەموو مەتەڵەکانم دەرئەهێنان (زادیج – ١٨٠)

ئەگەر من حەزبکرا ، منێ هەموو مەسەلە دەربانینا – کرمانجی .

ئەگەر ئەم جانەوەرە هەزارە سەرخۆش نەبوایەو ئەوەندە ترسنۆك نەبووایە لێم ئەدا (گەرداوەکە – ٧٩)

ئەگەر ئەوا جانەوەرێ زار سەرخوەش نەبوویاو ترسنۆك نەبوویا منی لێدا – کرمانجی .

٢ – وێنە بۆ واتای هیڤی‌داری

کاکە گیان من بۆ ئەوە هاتووم وولاٌخەکانتان بۆ بگرم (مەکەتری – ٤٤)

کاکێ‌جان ئەز بونا وێ هاتمە ، کو وولاخان بۆتە بگرم – کرمانجی

گەلی کورد ئەیەوێ بە سەربەستی بژی (رێزمانی کوردی – ٦١)

ملەتێ کورد دخوەزە ب سەربەستی بژی – کرمانجی

دژمن ئەیەویست ئێمە لەناو بیات (چوون – ٢٥٠)

دژمن دخوەست ئەم ژ ناڤێ ببرانا – کرمانجی .

گۆت – ئەز دەخوەزم تو بێی خوشکا من (حکایەتید کوردی)

ووتی : من ئەمەویٚ تو بی خوشکی من – سۆرانی .

٣ – ویٚنە بۆ واتای پێویستی

هاوین بوو ، ئەبوایە لەسەربان بنووستینایە (مەکەتری – ٧٤)

هاڤین بوو ، گەرەکی ئەم ل سەربان رازانا – کرمانجی

بۆچ دەبیٚ خۆم بەدەستی خۆم لە ستارتیە دوورخەمەوە ؟ (زادیج – ٩٩)

بۆناچ گەرەك ئەز خوە ب‌دەستی خوە ژ ستارتێ دوورخەم – کرمانجی

گەرە ئەویٚ فۆرڤافۆرق بکوژە . برا چاڤیٚ وی نەکەڤە (حکایەتیٚد کوردی – ١١ ، ٧٤)

٤ – ویٚنە بۆ واتای توانایی

کەس نیە لە جیهانا بتوانیٚ ووتەی زمانی خۆی بزانیٚ (فەرهەنگی خالٚ – ١٥)

ل‌دنیایێ کەس تونە بکارە خەبەریٚد زمانی خوە بزانە – کرمانجی .

کچەکەی شیٚت بووە ، وا لەژێر زەمینە ، هیچ کەسێك ناویٚریٚ بچیٚ بەلای (مەکەتری – ٢٤)

کەچکا ویٚ دین بوویە ، ڤا ل‌زندانیٚدایە ، کەسەك نەویٚرە هەرە جەم ویٚ – کرمانجی .

٥ – ویٚنە بۆ واتای پیٚشنیاز

رۆژێك وەکو من سەرکەوی‌و بگەیتە ئەندازەی من (زادیج – ١١٨)

## شیٚوەی نەسادەی کاری ئیلزامی

٣٠٣ – شیٚوەی نەسادەی کاری ئیلزامی بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری بوون لە باری ئیلزامی‌دا دادەریٚژریٚت .

بەپیٚ شیٚوەی کاری (بوون)ی شیٚوەی کاری نەسادەی ئیلزامی دابەش دەبیٚتە سەرکاری نەسادەی ئیلزامی داهاتوو و کاری نەسادەی ئیلزامی رابردوو .

٣٠٤ – شیٚوەی نەسادەی ئیلزامی‌کاتی داهاتوو لەناوی بکەری کارو شیٚوەی داهاتووی کاری یارمەتیدەر (بوون)دا رۆدەهیٚلدریٚت . ئەم جۆرە دارشتنە ئەنجامی روودان پیٚشان دەدات بیٚ ئەوەی بەکاتیٚکی دیار خراوەوە پیٚوەست بیٚت ، هەروا جیاوازی نیٚوان ئەو ماوانەش دەست نیشان دەکات بە یارمەتی ئەو ووشانەی ، کەتیٚیان‌دا بەکار دیٚن .

لە دیالیٚکتی ژووروو خوارووشدا ئەم جۆرە شیٚوە دارشتنەی ئیلزامی بەزۆری لەکەسی سیٚیەم‌دا بەرچاوەدەکەویٚت .

گەردان کردنی کاری تێنەپەری نەسادەی کاتی داهاتوو بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت :-

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئەز کەتم | ئەگەر من کەوتبم |
| دووەمی تاك | ئەگەر تو کەتی | ئەگەر تۆ کەوتبیت |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو کەتبە | ئەگەر ئەو کەوتبێت |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم کەتبن | ئەگەر ئێمە کەوتبین |
| دووەمی کۆ | ئەگەر هوون کەتبن | ئەگەر ئێوە کەوتبن |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان کەتبن | ئەگەر ئەوان کەوتبن |

وێنە :-

ئەبێ لە شارەزایانی مێژووزانو هونەری هەموو ناوچەکانی کوردستانی پێك هاتبێت ، نەك تەنها تاقە شوێنێك . (زمانی ئەدەبی کوردی - ۳۱)

دڤیت شارەزایانی (تاریخ‌ناس‌و هونەرەڤانیٚ هەموو ناحیید کوردستانیٚ پێك‌هاتبن ، نەك تەنیٚ بیٚ‌چ‌و وارەکی - کرمانجی

بەلاٚم من پەشیمان نیم لەوەی ، کە ئەگەر گیانی خۆم کردبیٚ لە پێناوی سزای کورما . . هەر نەترسابیٚ ، ئازاری نەبیٚ منیش هیچی کەم ناویٚ (هیوا - ژ -٥ - ۱۹٥۳)

لیٚ ئەز پوژمان نینم ژویٚ ئەگەر روحیٚ من قوربانیٚ کوریٚ من سزا کربە هەر ئەو نەترسە ، ئازار نەبە ، ئەز قەت تشتەکی ناخوەزم - کرامانجی .

ناچار نەیتوانی ستارتیە نەیەتەوە بیر بەبیری دەهات ، کە ئێستە زۆر لە خەتەر دایە رەنگ بیٚ ئێستە مردبێت (حکایەتی زادیج - ٦۳)

نەچار نکاری ستارتێ نەینە بیراخوە ، دهاتە بیریٚ کو نەکا خەدەرا گران‌دایە ، دبە نیکا مربی - کرمانجی

بەلکو ئار کەتبە کادینا وانە (مەمیٚ ئالان - ۱۲۰)

بەلکو ئاگر کەوتبێتە ناوکادینیان - سۆرانی .

۳۰٥ - کاری نەسادەی ئیلزامی بۆ دارشتنی کاتی داهاتوو بە پێچەوانەی کاری سادەی ئیلزامییە ، ئەوەی یەکەمیان لە کاری رابردووی تێپەرەوە دادەرێژرێت‌و شێوەی ئۆێنکتی‌و بیٚ ئۆێنکتی هەیە (بروانە بەندی ژمارە ۲۸۳ - ۲۸۳)

## «گەردان کردنی تێپەری ئیلزامی کاتی داهاتوو»
### (شێوەی بێئۆبێکتی)

| کەس | کرمانجی | سورانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەگەر من گرتبە | ئەگەر من گرتبم |
| دووەمی تاك | ئەگەر تە گرتبە | ئەگەر تۆ گرتبت |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەوی گرتبە | ئەگەر ئەو گرتبێت |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر مە گرتبە | ئەگەر ئێمە گرتبین |
| دووەمی کۆ | ئەگەر وە گرتبە | ئەگەر ئێوە گرتبن |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر وان گرتبە | ئەگەر ئەوان گرتبن |

### (شێوەی ئۆبێکتی)

| کەس | کرمانجی | سورانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەگەر لاوك ئەز گرتبم | ئەگەر لاوك منی گرتبێ(ت) |
| دووەمی تاك | ئەگەر لاوك تو گرتبی | ئەگەر لاوك تۆی گرتبێ(ت) |
| سێیەمی تاك | ئەگەر لاوك ئەو گرتبە | ئەگەر لاوك ئەوی گرتبێ (ت) |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر لاوك ئەم گرتبن | ئەگەر لاوك ئێمەی گرتبێ(ت) |
| دووەمی کۆ | ئەگەر لاوك هوون گرتبن | ئەگەر لاوك ئێوەی گرتبێ(ت) |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر لاوك ئەوان گرتبن | ئەگەر لاوك ئەوانی گرتبێ(ت) |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر وە ئەز گرتبم | ئەگەر ئێوە منتان گرتبێ(ت) |
| دووەمی کۆ | ئەگەر مە تو گرتبی | ئەگەر ئێمە تۆمان گرتبێ(ت) |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان ئەو گرتبە | ئەگەر ئەوان ئەویان گرتبێ(ت) |

وێنە :

مە نەدی یەك کو بهێتییە بازارێ سزێ ب گوهانە ، ئان ریا وێ دیتبە ب چاڤانە (مەکەتری–٢٥)

دیا وی خوە نالاند گۆ : تە زەبەش حووتا ژمرە ئانین ئەزێ رەحەت بم گۆ تە زەبەشی حووتا ژمرە نانیبن ئەزێ بمرم (تێکستی کوردی –٥٨)

دایکی خۆی نالاندی ووتی : ئەگەر تۆ شووتی حووتت بۆم هێنا من هێمن دەبم ، کە تۆ شووتی حوتت بۆم نەهێنابن من دەمرم – سۆرانی .

هیچ بۆی نەدەچوو پیرۆت مرۆتی هەڵگرتبێ (رەحیمی قازی – ٥٠)
قەت نەددا هشیێخوە ،کو پیرۆت مرۆت رەڤاندە – کرمانجی
تو حەقت چییە ، کە منداڵی هیچ خراپەی لەگەڵ تۆ نەکردبێت ، بێی بیکوژی ؟ (زادیج – ١٧١)
هەقە تە چییە کو تو بێی وی زارو بکوژی ، بێ کو ژ تەرا خراپی نەکربە – کرمانجی .
بەلأم لەگەڵ ئەوەش ئەبێ دراما دەستوورە – بنچینەکانی پاراستبێ (هیوا ، ژمارە – ٣٤ . ١٩٦١)
لێ تەڤی ویێ دبە درامێ دەستوورێد بنیات پاراست بە – کرمانجی ئەگینا وەنەبێ ئەمانیش فکری ئەو رزگار بوونەیان نەکردبێت (شۆرشەکانی کورد – ٣٤)
٣٠٦ – شێوەی کاری نەسادەی ئیلزامی لە کاتی رابردوودا لە بناخەی کاری رابردووی دووری ئیخباری دادەرێژرێت و (–ا) (–ایە– سۆرانی) پێوە دەلکێت لەپاڵ ئەوەش دا لە کرمانجی خوارووودا پێشگری (ب –) بۆی هەیە بە پێش کارەکەوە بکەوێت کاری نەسادەی ئیلزامی لەکاتی رابردوودا تەنێ شێوەی بێ ئۆتێکتی هەیە .

(کاری رانەبردوو) (باری چەسپیو)

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یکەمی تاك | ئەگەر ئمز کەتبووما | ئەگەر من (ب) کەوتبوومایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تو کەتبوویایی | ئەگەر تۆ (ب) کەوتبوویتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو کەتبوویا | ئەگەر ئەو (ب) کەوتبوویایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم کەتبوونا | ئەگەر ئێوە (ب) کەوتبوونایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان کەتبوونا | ئەگەر ئەوان (ب) کەوتبوونایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئمز نەکەتبووما | ئەگەر ئێمە نەکەوتبوومایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر تو نەکەتبوویایی | ئەگەر ئێوە نەکەوتبووتایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەو نەکەتبوویا | ئەگەر ئەوان نەکەوتبوویایە (×) |

(×) – لەگەڵ ئەم دارشتنانەی سەرەوەدا جۆری دارشتنی دیش هەیە کە هەمان واتا دەبەخشن ، بۆ وێنە لە ناوچەی سلێمانی‌دا شێوەی (ب) کەوتبامایە ، (ب) کەوتابام ، (ب) کەوتبام ، لە بەشە دیالێکتی ئەرمەنستان‌دا لەگەڵ شێوەی کەتبووما شێوەی (کەتبوویاما) یش بەکاردێت . ئەم شێوانە لە رووی واتاوە یەکن ، بەلأم جیاوازی فۆنەتیکیان بۆ کاری (بوون) دەگەڕێتەوە (بوویاما ، بووما ، باما ، بام – بەراوردبکە) لەگەڵ لەنێو چوونی (–ا) (–ایە – سۆرانی) (بکەوتبامایە ، بکەوتابام ، بکەوتبام بەراوردبکە)

## کاری تێپەر

١ – لە رستەی بێ ئۆبێکتی‌دا شێوەی نەسادەی ئیلزامی لە دیالێکتی ژووروو و خوارووداگشتی نییە . لە دیالێکتی خوارووداجیِ ناوی لکاو دەکەوێتە نێوان (ب) یِ‌ۆ بناخەی کارەکەوەو لە شێوەی ناکراوی‌دا پیتی ناکردنی (نە) دەکەوێتە جێگەی (ب) یەوە :–

### باری چەسپیو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر من کربوویا | ئەگەر من بم کردبووایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تە کربوویا | ئەگەر تۆ بت کردبووایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەوی کربوویا | ئەگەر ئەو بی کردبووایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر مە کربوویا | ئەگەر ئێمە بمان کردبووایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر وە کربوویا | ئەگەر ئێوە بتان کردبووایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان کربوویا | ئەگەر ئەوان بیان کردبووایە |
| یەکەمی تاك | ئەگەر من نەکربوویا | ئەگەر من نەم کردبووایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تە نەکربوویا | ئەگەر تۆ نەت کردبووایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو نەکربوویا | ئەگەر ئەو نەی کردبووایە |

٢ – لە دیالێکتی خوارووداد لە رستەی ئۆبێکتی‌دا لەگەلْ شێوەی کاری رابردووی نەسادەی ئیلزامی‌دا جیِ ناوی لکاو بە کۆتایی بەرکارەوە دەلکێت‌و نیشانەی (ب)‌ێی بە پێش کارەکەوە دەلکێت :–

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر تە ئەز دیتبووما | ئەگەر تۆ منت بدیتبووایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر من تو دیتبایە | ئەگەر من تۆم بدیتبووایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەوی ئەو دیتبویا | ئەگەر ئەو ئەوی بدیتبووایە |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر تە ئەم دیتبوونا | ئەگەر تۆ ئێمەت دیتبووایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر من هوون دیتبوونا | ئەگەر من ئێوەم دیتبووایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوی ئەوان دیتبوونا | ئەگەر ئەو ئەوانی دیتبووایە |

له دارشتنی شێوەی ناکراویدا (نه) شوێنی (ب) یٚ دەگرێتەوە له سۆرانیدا ، بۆ وێنە :-
ئەگەر من تۆم نەدیتبووایە . ئەگەر تۆ منت نەدیتبووایە . هتد شێوەی کاری ئیلزامی رابردووی دووری تێپەر ، کە بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری (بوون) دادەرێژرێت ئەم جۆرە دارشتنەشی هەیە :-

ا - له سۆرانیدا : بتکردبا ، بیکردبا هتد . .

ب - له کرمانجیدا : کربیا ، کربیا ، کربوا .

وێنە :

هەرچ زادیج پەسەندی نەکردبا هیچ کەسێك قەبوولی نەدەکرد ( زادیج - ٤٥)

زادیج پەسنیٚ هەرچ نەکربوویا ، قەت کەسەکی قەبوول نەدەکر - کرمانجی .

گوتی : لێم ناگەرێی ئەمن وا لەگەلٚ خوای تێکەلٚ ببوم ، ئەوی بمگوتبایە بۆم دەرۆی ، دوعام قەبوول دەبوو (مەکەنزی - ١٥٢)

ئەوی گۆت : تۆ ژمن ناگەری ئەز گهیشتبووم خوە دیٚخوە ، ئەویٚ من گۆتوویا ویٚ بهاتا سەری دووامنیٚ قەبوول ببویا - کرمانجی .

ئەگەر له پێشدا بەمنت بگۆتبا سوژنەکەم بۆ دروست بکە سنعەتی

خۆم ئاسانتر دەزانیو زووترم تەواو دەکرد (مەکەنزی - ١٧٤)

ئەگەر له پیشدا گۆتبوویا من سوژنیٚ بو من چێکە سنعەتا منە من ئاسانتر دزانیو زووتر تەمام دکر - کرمانجی .

دەستی من دامەنی حەزرەتی سولێمانی بیٚ حوکمەکی بردایە لەسەر تەیرو تیواری ئەسمانی لەسەر بەژنێکی باریك بکەن سێبەری (مەکەتری - ٨٢)

دەستیٚ من لداوا حەزرەتی سلێمان بە حوکمەکی کربوویا سەر تەیرو تووێی ئاسمان لەسەر بەژنا زراف بکە سێبەر - کرمانجی

## کاری ئیلزامی دەمکاتی نادیار

٣٠٧ - دەمکاتی نادیار چوار شێوەی ئیلزامی هەیە ، دووانی هی داهاتووە سادەو نەسادە دووانەکەی دیشی رابردووە - سادەو نەسادەی .

٣٠٨ - شێوەی سادەی کاری ئیلزامی دەمکاتی نادیار له کرمانجیدا بۆ دەمکاتی داهاتوو کاری یارمەتیدەری (هاتن) بەکاردێت (٢٦٣) ئەم جۆرە شێوەیە له سۆرانیدا لەکاتی رانەبردووا بە یارمەتی پێشگری (ب) دادەرێژرێت .

باری چەسپیو

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئەز بێم نڤیساندن | ئەگەر من بنووسرێم |
| دووەمی تاك | ئەگەر تو بێی نڤیساندن | ئەگەر تۆ بنووسرێیت |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو بێ نڤیساندن | ئەگەر ئەو بنووسرێت |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم بێن نڤیساندن | ئەگەر ئێمە بنووسرێین |
| دووەمی کۆ | ئەگەر هوون بێن نڤیساندن | ئەگەر ئێوە بنووسرێن |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەو (ان) بێن نڤیساندن | ئەگەر ئەوان بنووسرێن |

پیتی ناکران دەکەوێتە پێش کارەکەوەو جێگەی (ب)ێ دەگرێتەوە لە هەردوو دیالێکتەکەدا :

ئەگەر ئەز نەبێم نڤیساندن — ئەگەر من نەنووسرێم – سۆرانی

ئەگەر تو نەبێی نڤیساندن — ئەگەر تۆ نەنووسرێیت – سۆرانی

٣٠٩ – لە کرمانجیدا شێوەی سادەی کاری رابردووی دەمکاتی نادیاری ئیلزامی بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری (هاتن) لە رابردووی ئیلزامیدا دادەرێژرێت . لە خوارووداو بەیارمەتی نیشانەی (ب –)ی ، کە دەکەوێتە پێش کارە نادیارە گەردانکراوەکەوە پێك دێت .

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئەز بهاتاما نڤیساندن | ئەگەر من بنووسرام |
| دووەمی تاك | ئەگەر تو بهاتایی نڤیساندن | ئەگەر تۆ بنووسرایت |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو بهاتا نڤیساندن | ئەگەر ئەو بنووسرا |
| یەکەمی کۆ | ئەکەر ئەم بهاتانا نڤیساندن | ئەگەر ئێمە بنووسراین |
| دووەمی کۆ | ئەگەر هوون بهاتانا نڤیساندن | ئەگەر ئێوە بنووسران |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان بهاتانا نڤیساندن | ئەگەر ئەوان بنووسران |

پێتی ناکردن لەم جۆرە دارشتنانەدا وەکو ئەوانەی پێشوو جێگەی نیشانەی (ب -)ی دەگرێتەوە لە هەردوو دیالێکتەکەدا :

ئەز نەهاتاما نڤێساندن . ئەگەر من نەنووسرام - سۆرانی .

ئەگەر تو نەهاتاپی نڤیساندن . ئەگەر تۆ نەنووسرایتی - سورانی .

۳۱۰ - شێوەی نەسادەی کاری داهاتووی ئیلزامی نادیار بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری (بوون) لە دەمکاتی نادیاردا دادەرێژرێت ،

شێوەی ناکراوی بە یارمەتی پێتی (نە) دروست دەبێت .

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئەز هاتبم نڤیساندن | ئەگەر من نووسرابم |
| دووەمی تاك | ئەگەر تو هاتبی نڤیساندن | ئەگەر تۆ نووسرابی |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو هاتبە نڤیساندن | ئەگەر ئەو نووسرابێت |
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم هاتبن نڤیساندن | ئەگەر ئێمە نووسرابین |
| دووەمی کو | ئەگەر هوون هاتبن نڤیساندن | ئەگەر ئێوە نووسرابن |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان هاتبن نڤیساندن | ئەگەر ئەوان نووسرابن |

ئەگەر ستاریتا لە شارا نەکوژرابێ ، ئێستە لەناو کە نیزیکی میری ئورکانیادا ئەدۆزێتەوە (حکایەتی زادیج - ۱۲۱)

ئەگەر ستارتیا ل شەهردا نەهاتبە کوشتن نکا لناڤ کەنیزەکێ میری ئورکان‌دا وێ بیێ دیتنە .

۳۱۱ - لە دیالێکتی کرمانجی‌دا شێوەی نەسادەی کاری ئیلزامی نادیار بە یارمەتی کاری (بوون)و (هاتن)ەوەش پێك دێت . لێرەدا (هاتن) لە شێوەی ناوی بکەردا دەبێت . لە سۆرانی‌دا شێوەی کاری رابردووی ئیلزامی کاری بوون بە بناخەی ئەو کارەوە دەلکێت ، کە ئەم جۆرە شێوەی نادیاری لێ دادەرێژرێت .

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| یەکەمی تاك | ئەگەر ئەز (بـ) هاتبوما نڤیساندن | ئەگەر (بـ) نووسرابوومایە |
| دووەمی تاك | ئەگەر تو (بـ) هاتبوویای نڤیساندن | ئەگەر تو (بـ) نووسرابووتایە |
| سێیەمی تاك | ئەگەر ئەو (بـ) هاتبویا نڤیساندن | ئەگەر ئەو (بـ) نووسرابووایە |

| | | |
|---|---|---|
| یەکەمی کۆ | ئەگەر ئەم (ب) هاتبوونا نڤیساندن | ئەگەر ئێمە بنووسرابوونایە |
| دووەمی کۆ | ئەگەر هوون (ب) هاتبوونا نڤیساندن | ئەگەر ئێوە بنووسرابوونایە |
| سێیەمی کۆ | ئەگەر ئەوان (ب) هاتبوونا نڤیساندن | ئەگەر ئەوان بنووسرابوونایە |

وێنە :

هەموو وەختێکی لە مەملکەتی وی‌دا هەر چییەکی بکرابا ئاگادار بوو (مەکەنزی – ١٧٦)

هەموو وەختی هەرچ لـمەملەکەتیێ وی‌دا بهاتا کرنیێ ئەو هەژ بیێهەبوو – کرمانجی .

کاری ئیلزامی دەمکاتی داخوازی

٣١٢ – دەمکاتی داخوازی چوار شێوەی ئیلزامی هەیە ، دووانی هی‌داهاتوون – سادەو نەسادە ، دووانیشی رابردوون – سادەو نەسادەی .

٣١٣ – شێوەی سادەی ئیلزامی کاری داخوازی لە شێوەی داهاتوو وەیا رابردووی ئیلزامی کاری یارمەتیدەری (دان) رۆ دەهێلدرێت :

شێوەی دەمکاتی داهاتوو

وێنە بۆ تاك :

| | |
|---|---|
| ئەگەر ئەز بوم نڤیساندن | ئەگەر من بدەم بۆ نووسین – سۆرانی |
| ئەگەر تو بدی نڤیساندن | ئەگەر تۆ بدەیت بۆ نووسین – سۆرانی |

وێنە بۆ کۆ :

| | |
|---|---|
| ئەگەر ئەم بدن نڤیساندن | ئەگەر ئێمە بدەین بۆ نووسین – سۆرانی |

(شێوەی سادەی کاتی رابردوو

لە رستەی بیێ ئۆبێکتی‌دا

وێنە بۆ تاك :

| | |
|---|---|
| ئەگەر من بدا نڤیساندن | ئەگەر من بمدایە بۆ نووسین – سۆرانی |
| ئەگەر تە بدا نڤیساندن | ئەگەر تۆ بتدایە بۆ نووسین – سۆرانی |

وێنە بۆ کۆ :

**ئەگەر مە بدا نڤیساندن** | **ئەگەر ئێمە بماندایە بۆ نووسین -- سۆرانی**

شێوەی ناکراو :

**ئەگەر من نەدا نڤیساندن** | **ئەگەر من نەم (ب) دایە بۆ نووسین – سۆرانی**

**ئەگەر مە نەدا نڤیساندن** | **ئەگەر ئێمە نەمان (ب) دایە بۆ نووسین – سۆرانی**

**(لە رستەی تۆبێکتیدا)**

وێنە بۆ تاك :

**ئەگەر تە ئەز بداما نڤیساندن** | **ئەگەر تۆ منت بدایە بۆ نووسین – سۆرانی**

**ئەگەر من تو بدایی نڤیساندن** | **ئەگەر من تۆم بدایە بۆ نووسین – سۆرانی**

وێنە بۆ کۆ :

**ئەگەر ئەوی ئەم بدانا نڤیساندن** | **ئەگەر ئەو ئێمەی بدایە بۆ نووسین – سۆرانی**

**ئەگەر من هوون بدانا نڤیساندن** | **ئەگەر من ئێوەم بدایە بۆ نووسین – سۆرانی**

٣١٤ – شێوەی نەسادەی کاری ئیلزامی دەمکاتی داخوازی لە شێوەی نەسادەی کاتی داهاتوو وەیا رابردووی کاری یارمەتیدەری (دان) هی دەمکاتی ئیلزامی دادەرێژرێت .

شێوەی نەسادەی داهاتوو لە رستەی بێ تۆبێکتیدا

وێنە بۆ تاك

**ئەگەر من دابە نڤیساندن** | **ئەگەر من دابم بۆ نووسین – سۆرانی**

**ئەگەر تە دابە نڤیساندن** | **ئەگەر تۆ دابت بۆ نووسین – سۆرانی هتد**

وێنە بۆ کۆ :

**ئەگەر مە دابەنڤیساندن** | **ئەگەر ئێمە دابن بۆ نووسین –سۆرانی . .**

لە رستەی تۆبێکتیدا

وێنە بۆ تاك

**ئەگەر تە ئەز دابم نڤیساندن** | **ئەگەر تۆ منت دابێ بۆ نووسین – سۆرانی**

**ئەگەر ئەوی تو دابی نڤیساندن** | **ئەگەر ئەو تۆی دابێ نووسین – سۆرانی**

وێنە بۆ کۆ :

**ئەگەر ئەوی ئەم دابن نڤیساندن ئەگەر ئەو ئێمەی دابێت بۆ نووسین –سۆرانی**

**« شێوەی نەسادەی رابردوو لە رستەی بێ ئۆبێکتیدا »**

**وێنە بۆ تاك :**

**ئەگەر من دابوویا نڤیساندن ئەگەر من دابوومایە بۆ نووسین –سۆرانی**
**ئەگەر تە دابوویا نڤیساندن ئەگەر تۆ دابووتایە بۆ نووسین – سۆرانی**

**لە رستەی ئۆبێکتیدا**

**وێنە بۆ تاك :**

**ئەگەر ئەوی ئمز دابووما نڤیساندن ئەگەر ئەو منی دابوویە بۆ نووسین –سۆرانی**
**ئەگەر ئەوی تو دابوو یانڤیساندن ئەگەر ئەو تۆی دابوویە بۆ نووسین –سۆرانی**

**وێنە بۆ کۆ :**

ئەگەر ئەوی ئەم دابوونانڤیساندن
ئەگەر ئەو ئێمەی دابووواية بۆ نووسین – سۆرانی
ئەگەر ئەوی هوون دابوونا نڤیساندن .
ئەگەر ئەو ئێوەی دابووواية بۆ نووسین – سۆرانی

شێوەی ناکراوی بە پارمەتی پیتی (نە) دادەرێژرێت ، کە دەکەوێتە پێش کاری یارمەتیدەری (دان)ەوە . لە سۆرانیدا جێناوی لکاو بەکۆتایی پیتی(نە)ەوە دەلکێت :

ئەگەر من نەدابوویا نڤیساندن
ئەگەر من نەم ادبووواية بۆ نووسین – سۆرانی
ئەگەر تە نەدابوویا نڤیساندن
ئەگەر تۆ نەت دابووواية بۆ نووسین – سۆرانی .

## دەمکاتی فەرمان

**٣١٥** – دەمکاتی فەرمان شێوەی کەسی دووەمی تاكو کۆی هەیە ، کە واتای داواکاری قسەکەر دەگەیەنێت و نیشانەی تایبەتێتی فەرمان کردنیشی هەیە ، لەگەلّ ئەوانەش‌دا شێوەی فەرمان بۆی هەیە واتای هیڤیداری ، ئامۆژگاری ، تکا بگەیەنێت ،

که هەمووی بۆ کاتی داهاتوو ، لەم رووەوە دەمکاتی فەرمان لەگەڵ دەمکاتی ئیلزامی دا نێزیك دەبنەوە . بۆ دارشتنی ئەم بابەتە جیاوازانە هۆی لێکسیکی جیاواز بەکاردێن .

٣١٦ – بۆ دارشتنی دەمکاتی فەرمان بۆ کەسی تاك پێشگری (ب –) دەکەوێتە پێش بناخەی کاری رانەبردووەوە و بزێنی (ە)ی فەرمانیش دەکەوێتە کۆتاییەوە :–

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| بکە | بکە |
| بنڤیسە | بنووسە |
| بفرۆشە | بفرۆشە |
| بکەڤە | بکەوە |

شێوەی کۆ بە یارمەتی پێشگری (ب –) ، کە دەکەوێتە پێش بناخەی کاری رانەبردووەوەو بە پێوەلکانی (ن) بە کۆتاییەوە :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| بکن | بکەن |
| بدن | بدەن |
| بنڤیسن | بنووسن |
| بکەڤن | بکەون |

٣١٧ – ئەو کارانەی ، کە بناخەی رانەبردوویان بە بزوێنی (–ە) ، –ۆ ، –وو) کۆتایی دێت ، لە باری تاکدا (–ە) وەردەگرن لەباری کۆدا (ن) بۆ دارشتنی شێوەی فەرمانیان :

| تاك | | کۆ | |
| --- | --- | --- | --- |
| کرمانجی | سۆرانی | کرمانجی | سۆرانی |
| بدروو | بدروو | بدروون | بدروون |
| بچوو | بچوو | بچوون | بچوون |
| | برۆ | | برۆن |
| بخوە | بخۆ | بخۆن | بخۆن |
| باژۆ | باژوو | باژۆن | باژوون |

له شێوەی دەمکاتی فەرماندا لە باری تاكدا لە هەردوو دیالێکتەکەدا بزوێنی (-ە) لەنێو دەچێت :-

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| بکوژ | بکوژ |
| بفرۆش | بفرۆش |
| بکر | بکر |

لە رستەی ناکراودا دەمکاتی فەرمان بەیارمەتی نە (مە -سۆرانی) دادەرێژرێت شوێنی (ب-) دەگرێتەوە :--

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| نەکە ، مەکە | مەکە |
| نەکن ، مەکن | مەکەن |
| نەفرۆشە ، مەفرۆشە | مەفرۆشە |

٣١٨ - لەگەڵ ئەم دارشتنانەی سەرەوەدا لەهەردوو دیالێکتەکەدا - کرمانجی و سۆرانی بۆ دارشتنی کاری فەرمان لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا شێوەیەکی دی تایبەتی هەیە ، کە بە یارمەتی پاشگری (-ەر)و نیشانەی فەرمانی (-ە) و (-ن) ، پاشگری (-ە) بە کۆتایی بناخەی رانەبردووە دەلکێت :-

| تاك | کۆ |
|---|---|
| بخۆرە | بخۆرن |
| بنووسەرە | بنووسەرن |
| مەخۆرە | مەخۆرن |
| مەنووسەرە | مەنووسەرن |

٣١٩ - لە کرمانجی دا پیتی ناکردنی (-مە)و (-نە) و پێشگری (ب -) دەکەونە سەرەتای بناخەی کارەوە :

باڤێژە . ناڤێژە لە برێتی مەئاڤێژە وەیا نەئاڤێژە وەی دی .

٣٢٠ – كاری فەرمان بۆ کەسی یەکەمی کۆ لەوانەیە واتای تکاکردن داخوازی بۆ رووداني رووداوەکە بگەیەنێت ، کە قسەکەرەکە خۆشی دەگرێتەوە :

بێینەوە سەرکاری برا بچکۆلە بزانین چی بەسەر هاتووە (مەکەنزی – ٥٠)
ئەم ڤەگەرنە سەرکاریٚ بریٚ بچووك ، بزانن چ هاتیيە سەر –کرمانجی
وەرە ئەزو تو بینە خوشك‌و بریٚ هەڤدوو (حکایەتید کوردی – ٧٧)
وەرە من‌و تۆ ببین بە خوشك وبرای یەکتر – سۆرانی .

٣٢١ – بۆ دەرخستنی جیاوازی کاری فەرمان بە یارمەتی پیتی ئیلزامی برادا (با–سۆرانی) ، چکا ،لە کا (کوا – سۆرانی) هەلا ، نوکا .

برا سیٚ زەڤاشا مەرا بشینە (حکایەتێد کوردی –٥٧)
باسیٚ شووتی بۆمان بهێنیٚ – سۆرانی
شیخو لعەرەب با بگەیێنینەوە ماڵی خۆیان ، کورە لێرەدا دانیشە (مەکەنزی – ١٢)
برا زارۆ بسەکنن ، ئەزیٚ هەرم (حکایەتێد کوردی – ٨٢)
چکا زوو بکن بنێرن ئەو چما نەهات (حکایەتید کوردی – ٧٤)
بازوو بکەن ، بنوارن ، ئەو بۆچ نەهات – سۆرانی
بابچمەوە بە داکم بڵێم (مەکەنزی – ١٧٨)
کا ئەز هەرم جەم دایکامن بێژمیٚ – کرمانجی
هەلا راڤە هەرە ، سیاربە وێدا بدە رکێڤا (حکایەتید کوردی – ١٦٤)

## گەردان کردنی کاری ناتەواو

٣٢٢ – لە زمانی کوردی‌دا هێندیك کار هەن ، کە لەکاتی گەردان کردن‌دا بەر تایبەتێتی کارای دیەوە ناکەون وەیا هەموو شێوەی کاتەکانیان نییە وەکو کاری (ویستن ، چوون ، کارن ، زانین ، هەیین // هەبوون ، هاتن ، زانبوون ، کاربوون ، توانین)

## کاری هەیین // هەبوون

٣٢٣ – کاری یارمەتیدەری هەیین // هەبوون بەر گرووپی کاری ناتەواو دەکەون .

شێوەی هەیین بە شێوەی یەکەم وەیا دێرین دەژمێردرێت ، لەرووی رەگەزەوە بەکاری یارمەتیدەری زمانانی دی ئێرانی پێوەستە ، لەوانە هستن . شێوەی هەبوون کارێکی لێکدراوە لە بناخەی ناوەوە (هە)و کاری (بوون) . کاری هەیین‌و هەبوون وەکو کارێکی سەربەخۆ

بەکاردێن و هەریەك واتای سەربەخۆی خۆی هەیە بەکارهاتنی هەر یەکەیان لە رووی ڕێزمانەوە جیاوازە بۆ وێنە کاری هەبین تەنێ شێوەی رانەبردووی هەیەو بە بێ یارمەتی دانی پیتی (—ە) د (دە . ئە —) دادەرێژرێت ، کە بۆ دارشتنی کاری رانەبردوو بەکاردێت .

کاری هەبوون شێوەی رابردوو داهاتووی هەیە . دەمکاتی خەبەری ، ئیلزامی ، فەرمانیشی هەیە . بۆ هەموو ئەرکە ڕێزمانییەکانی دی کاری بوون لە برێتی هەبین وهەبوون دەوردەگێرێت .

شێوەی رانەبردووی کاری هەبین لە بناخەی (هە—)بە پێوەلکانی کۆتایی کەسی گرووپی یەکەم (٢٦١) وە دادەرێژرێت .

شێوەی ناکراوی کاری هەبین بە یارمەتی پیتی ناکردن (نی) پێك دێت ، کە جێگەی (هە —) لە هەردوو دیالێکتەکەدا دەگرێتەوە . لەپاڵ ئەم یەکبوونی دارشتنە بۆ کاری هەبین لەباری ناکراودا لە هەردوو دیالێکتەکەدا ، لە دیالێکتی ژووروودا پیتی ناکردنی (نە —)ش بەکاردێت ، کە شوێنی (هە —)ش ناگرێتەوە :—

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەز هەمە | من هەم (٥) |
| دووەمی تاك | تو هەی | تۆ هەیت |
| سێیەمی تاك | ئەو هەیە | ئەو هەیە |
| یەکەمی کۆ | مە هەنە | ئێمە هەین |
| دووەمی کۆ | هوون هەنە | ئێوە هەن |
| سێیەمی کۆ | ئەوان هەنە | ئەوان هەن |

(لە باری ناکراودا)

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| ئەز نیم . نە هەمە | من نیم |
| تو نیی . نە هەی | تۆ نیت |
| ئەو نینە . نە هەیە | ئەو نییە |
| ئەم نین .نە هەنە | ئێمە نین |
| هوون نین ، نە هەنە | ئێوە نین |
| ئەوان نین ، نە هەنە | ئەوان نین |

٣٢٤ – کاتی کاری هەبین و هەبوون وەکو کاری پێوەستدا بەکاردێن ، (هە –) لەنێوەدەچێت و ئەو ناوەی لەگەڵی بەکاردێت ئەو شوێنی دەگرێتەوە . لەکاتی رانەبردوودا ناوەکە بەپێش بەشی ماوەوەی کاری هەبین و هەبوون دەکەوێت ، کە برێتیە لە کۆتایی کەسی (بروانە بەندی ژمارە – ٢٦١)

ئەز شڤانم (من شوانم – سۆرانی)

ئەز مامۆستامە (من مامۆستام –ە – سۆرانی)

شێوەی ناکراوی لە هەردوو دیالێکتەکەدا گشتیە ، کە برێتیە لە شێوەی ناکراوی کاری پێوەستدار نینم (نیم – سۆرانی)

ئەز شڤان نینم . من شوان نیم – سۆرانی

لە دیالێکتی ژووروودا پێتی (نە) دەتوانێ بەپێش گوزارە بکەوێت :

ەز نە شڤانم

ئەز نە مامۆستامە

وێنە :

منیش وەکو ئێوە غەریبم ، خەلکی ئەم شارە نیم ، ئەمە مانگە یا رۆژە (مەکەتری – ٧٨)

ئەز ژی میناوە غەریبم ، خەلکێ ڤی شەهری نینم ، نزانم ئەڤ مەهە یا روژە – کرمانجی .

تو لە من : واجوانتری (حکایەتی زادیج – ١٤٢)

تو ژمن جوانتری – کرمانجی

ئەوانە وا ئەزانن خۆیان خاوەن ماڵن (هیوا ، ١٠ ، ١٩٥٨)

ئەڤانا وا دزانن ئەو بـخوە خودان مالن – کرمانجی

ئەڤدێ خودێ ، روحێ من نەجەم منە (حکایەتی کوردی – ٩٤)

عەبدی خوا ، گیانی من لەگەڵ من نییە – سورانی

شێوەی رابردووی کاری هەبین // هەبوون لە دەمکاتی ئیخباری‌دا لە بناخەی کاری رابردووی هەبوون چی‌دەبێت و کۆتایی کەسی جۆری دووەمیشی پێوە دەلکێت (٢٦١) لە دیالێکتی ژووروودا هەبوون دوو شێوەی ناکراوی هەیە (نیبوون) بۆکاری هەبوون و (نەبوون) بۆ شێوەی بوون . بەلاّم لە دیالێکتی خوارووودا تەنێ یەك جۆرە شێوەی ناکردن هەیە ، کە لەگەڵ (بوون) رێك دەکەوێت

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| یەکەمی تاك | ئەز هەبووم | من هەبووم |
| دووەمی تاك | تو هەبووی | تۆ هەبوویت |
| سێیەمی تاك | ئەو هەبوو | ئەو هەبوو |
| یەکەمی کۆ | ئەم هەبوون | ئێمە هەبووین |
| دووەمی کۆ | هوون هەبوون | ئێوە هەبوون |
| سێیەمی کۆ | ئەوان هەبوون | ئەوان هەبوون |

(باری ناکراوی)

| | | |
|---|---|---|
| ١ – تاك | ئەز نیبووم | |
| ٢ – تاك | تو نیبووی | |
| ٣ – تاك | ئەو نیبوو | |
| ١ – تاك | ئەز نەبووم | من نەبووم |
| ٢ – تاك | تو نەبووی | تۆ نەبوویت |
| ٣ – تاك | ئەو نەبوو | ئەو نەبوو |

لە رستەی ناکراودا ، کە کارەکەی لەکاتی رابردوودا دەبێت یەکسەر لەدوای نیهاددا شێوەی پێوەندی ناکردن دێت .

لە کرمانجی‌دا بێ لەمەش پیتی ناکردنی (نە –) بۆی هەیە لە دوایی‌دا بێت بەواتە بکەوێتە پێش کارەکەوە . کاری رابردووی سادە :–

ئەز شڤان بووم — من شووان بووم – سۆرانی

ئەز شڤان نەبووم — من شووان نەبووم – سۆرانی

وێنە :–

ژوورەکەم گەرمو خۆش بوو . (هیوا ، ژمارە –١٠ ، ١٩٦٨)

ئوتاخا من گەرمو خوەش بوو – کرمانجی

لە شاری گوریشتە پاشایەك هەبوو ، برایم پاشا ، سێ کوری هەبوو ، کورەکی ناوی شێرزاد خان بوو ، کورەکی ناوی جهان شێربوو ، کورەکی ناوی ئەحمەد بوو (مەکەتری – ٢٠٠)

ل شەهرێ گوریشتە پاشاك هەبوو ،سێ كورێ وی بوون ناڤێ كورەكی شێرزادخان بوو ، ناڤێ كورەكی جهانشێر بوو ، ناڤێ كورەكی ئەحمەد بوو – كرمانجی .

لە زەمانی پاشای موبدار لە شاری بابل گەنجێ هەبوو ، ناوی زادیج بوو (حكایەتی زادیج – ١)

ل زەمانێ پاشاێ موبدار ل شەهرێ بابل خۆرتەك هەبوو ناڤێ وی زادیج بوو – كرمانجی .

ئەوی تریشیان گەنجێكی تەمەن لە دوانزە سالان پتر نەبوو (هیوا ، ژمارە – ١٠ ، ١٩٥٨)

ئەوێ دی ژ خۆرتەكی ئەمیرێ وی ژ دونزاە سالان زێدەتر نیبوو – كرمانجی .

٣٢٥ – كاری پێوەستدار دوو شێوەی ئیلزامی هەیە ، رابردوو و داهاتوو شێوەی داهاتووی ئیلزامی بە پێوەلكانی كۆتایی كەسی جۆری یەكەم بە بناخەی كاری رانەبردووەوە (ب –) لەكاری (بوون) ەو (هەب –) لە كاری (هەبوون)ە .

| كەس | كرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| ١ – تاك | ئەز هەبم ،بم | من هەبم ،بم |
| ٢ – تاك | تو هەبی ،بی | تۆ هەبیت ، بیت |
| ٣ – تاك | ئەو هەبە ،بە | ئەو هەبێت ، |
| | | هەبات ،بێ(ت) |
| ١ – كۆ | ئەم هەبن ،بن | ئێمە هەبین ،بین |
| ٢ – كۆ | هون هەبن ،بن | ئێوە هەبن ، بن |
| ٣ – كۆ | ئەوان هەبن ،بن | ئەوان هەبن ، بن |

شێوەی ناكراوی

| | | |
|---|---|---|
| ١ – تاك | ئەز نیم ، نەبم | من نەبم |
| ٢ – تاك | تو نیی ، نەبی | تۆ نەبی (ت) |
| ٣ – تاك | ئەو نیە ، نەبە | ئەو نەبێ (ت) |
| ١ – تاك | ئەز نەهەبم | |
| ٢ – تاك | تو نەهەبی | |
| ٣ – تاك | ئەو نەهەبە | |

شێوەی رابردووی ئیلزامی کاری هەبوون ، بوون بە یارمەتی نیشانەی (–ا–) لە کرمانجی و (–ایە) لە سۆرانی دا لەگەڵ پێوەلکانی کۆتایی کەسی بە بناخەی کاری رابردووەوە (هەبوو – بوو) دروست دەبێت :

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| ١ – تاك | ئەز هەبم ، بم | من هەبم ، بم |
| ٢ – تاك | تو هەبی ، بی | تۆ هەبیت ، بیت |
| ٣ – تاك | ئەو هەبە ، بە | ئەو هەبێت ، هەبات ، بێ(ت) |
| ١ – کۆ | ئەم هەبن ، بن | ئێمە هەبین ، بین |
| ٢ – کۆ | هون هەبن ، بن | ئێوە هەبن ، بن |
| ٣ – کۆ | ئەوان هەبن ، بن | ئەوان هەبن ، بن |

(شێوەی ناکراوی)

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| ١ – تاك | ئەز نیم ، نەبم | من نەبم |
| ٢ – تاك | تو نیی ، نەبی | تۆ نەبی (ت) |
| ٣ – تاك | ئەو نیە ، نەبە | ئەو نەبێ (ت) |
| ١ – تاك | ئەز نەهەبم | |
| ٢ – تاك | تو نەهەبی | |
| ٣ – تاك | ئەو نەهەبە | |

شێوەی رابردووی ئیلزامی کاری هەبوون ، بوون بە یارمەتی نیشانەی (–ا–) لە کرمانجی و (–ایە) لە سۆرانی دا لەگەڵ پێوەلکانی کۆتایی کەسی بە بناخەی کاری رابردووەوە (هەبوو – بوو) دروست دەبێت :

| کەس | کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|---|
| ١ – تاك | ئەز نەهەبووما ، بووما(*) | من هەبوومایە ، بوومایە |
| ٢ – تاك | تو هەبوویایی ، بوویایی | تۆ هەبوویتایە ، بووتایە |

(*) – لە دەمەکانی رابردوودا کاری بوون ئەم شێوانەی ئیلزامیشی هەیە : کەسی یەکەم : ببویاما ، ببوما ، ببیاما ، کەسی دووەم : ببوویایی . ببیای کەسی سێیەم : ببوویا ، ببیا ، بوا .

| | | |
|---|---|---|
| ٣ - تاك | ئەو هەبوویا ، بوویا | ئەو هەبوویایی ، بووایە |
| ١ - کۆ | ئەم هەبوونا ، بوونا | ئێمە هەبوونیایە ، بوونیایە |
| ٢ - کۆ | هوون هەبوونا ، بوونا | ئێوە هەبوونایە ، بوونایە |
| ٣ - کۆ | ئەوان هەبوونا ، بوونا | ئەوان هەبوونایە ، بوونایە |

(شێوەی ناکراوی)

| | | |
|---|---|---|
| ١ - تاك | ئەز نیبووما ، نەبووما | من نەبوومایە |
| ٢ - تاك | تو نیبوویایی ، نەبوویایی | تۆ نەبوویتایە |
| ٣ - تاك | ئەو نیبوویا ، نەبوویا | ئەو نەبوویایە |
| ١ - تاك | ئەز نەهەبووما | |
| ٢ - تاك | تو نەهەبوویایی | |
| ٣ - تاك | ئەو نەهەبوویا | |
| ١ - کۆ | ئەم نیبوونا ، نەبوونا | ئێمە نەبوونیایە |
| ٢ - کۆ | هوون نیبوونا ، نەبوونا | ئێوە نەبوونایە |
| ٣ - کۆ | ئەوان نیبوونا ، نەبوونا | ئەوان نەبوونایە |
| ١ - کۆ | ئەم نەهەبوونا | |
| ٢ - کۆ | هوون نەهەبوونا | |
| ٣ - کۆ | ئەوان نەهەبوونا | |

وێنە :-

ئەگەر مەردایەتیو دڵنەوازی نەبووایە ، ئێستە لەو رووبارەدا خنکابوو (حکایەتی زادیج - ١٢٩)

ئەگەر مەردیو دلنەوازی بیاتە نەبوویا ، ئەزێ دڤێ رووباریدا بخنقیباما - کرمانجی .

ئەگەر شەر نەبوویا ، باڤکێ من نەدهاتە کوشتنێ .

ئەگەر شەر نەبوویایە ، باوکی من بە کوشت نەئەچوو - سورانی .

ئەگەر تو کوشتی بوویایی مالا منی خراب بوویا .

ئەگەر تۆ کوژرا بوتیتایە مالی من خەراپ دەبوو - سورانی .

ئەگەر ئەو گرتی بوویا ، تە ئەو ئازا بکرا

ئەگەر ئەو حەپس کرابوویایە ، تۆ ئەوت ئازاد دەکرد - سۆرانی

٣٢٦ – له دیالێکتی خواروودا کاری هه‌بین‌و هه‌بوون دوو جۆره گه‌ردانکردنیان هه‌یه . له واتای تێنه‌په‌ری‌دا له‌گه‌ڵ دیالێکتی ژووروودا یه‌کن ، له تێپه‌ری‌دا وه‌کو کارێکی رابردوو گه‌ردانده‌کرێن . له شێوه‌ی رانه‌بردوو و داهاتوودا تایبه‌تێتی خۆی هه‌یه لێره‌دا جیاوازی رسته‌ی ئۆبێکتی‌و نائۆبێکتی به‌دیارده‌که‌وێت ، جی‌ناوی لکاو به‌کارو به به‌رکاره‌وه ده‌لکێت .

کاری هه‌بین‌و هه‌بوون له‌رووی‌کاته‌وه چوارجۆره ، رانه‌بردوو ، داهاتوو ، رابردووی ساده‌و نێزیك . له شێوه‌ی کاری رانه‌بردوودا جی‌ناوی لکاو ده‌چێته نێو کاره‌که‌وه ، له که‌سی سێیه‌می تاکدا نیمچه بزوێنی –ی به‌پێش جی‌ناوه لکاوه‌که (–تی) ده‌که‌وێت .

له رسته‌ی ناکراودا جی‌ناو به (هه–)ه ده‌لکێت‌و به یارمه‌تی پیتی ناکردنی (نه) و (نی) داده‌رێژرێت :–

| که‌س | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| ١ – تاك | من هه‌مه | ئێمه هه‌مانه |
| ٢ – تاك | تۆ هه‌ته | ئێوه هه‌تانه |
| ٣ – تاك | ئه‌و هه‌یه‌تی | ئه‌وان هه‌یانه |
| ١ – کۆ | من نیمه | ئێمه نیمانه |
| ٢ – کۆ | تۆ نیته | ئێوه نیتانه |
| ٣ – کۆ | ئه‌و نیه‌تی | ئه‌وان نیانه |

له رسته‌ی ئۆبێکتی‌دا جی‌ناو به به‌رکاره‌وه ده‌لکێت . کاری هه‌بین له هه‌ر سێ که‌سی تاك‌و کۆدا یه‌ك شێوه‌ی گشتی هه‌یه :–

| | |
|---|---|
| ماڵم هه‌یه | ماڵمان هه‌یه |
| ماڵت هه‌یه | ماڵتان هه‌یه |
| ماڵی هه‌یه | ماڵیان هه‌یه |

شێوه‌ی ناکراوی

| | |
|---|---|
| ماڵم نیه | ماڵمان نیه |
| ماڵت نیه | ماڵتان نیه |
| ماڵی نیه | ماڵیان نیه |

شێوەی داهاتووی دەمکاتی ئیخباری لە کاری (هەبوون) بە پێوەلکانی جیٚناوی لکاو بەپێش بناخەی کارەکەوەو پێش‌خستنی نیشانەی (ە)ی کاتی ئێستە چیٚدەبێت :-

| | |
|---|---|
| من دەمیٚ (ئەمیٚ) | ئێمە دەمانیٚ (ئەمانیٚ) |
| تۆ دەتیٚ (ئەتیٚ) | ئێوە دەتانیٚ (ئەتانیٚ) |
| ئەو دەییٚ (ئەییٚ) | ئەوان دەیانیٚ (ئەیانیٚ) |
| من نەمیٚ | ئێمە نەمانیٚ |
| تۆ نەتیٚ | ئێوە نەتانیٚ |
| ئەو نەییٚ | ئەوان نەیانیٚ |

شێوەی رابردووی سادە لە بناخەی کاری (هەبوون)ەوە رۆدەهێلدرێت . لە رستەی بیٚئۆبێکتیدا جیٚناو دەچێتە نێو کارەوە. لە رستەی ناکراودا جیٚناو بە پیتی (نە)کردنەوە دەلکێت ، کە هەردوویان بەپێش بناخەی کارەوە دەنووسێن .

کار لە هەموو کەسەکاندا چ تاکو چ کۆ شێوەیەکی گشتی هەیە :-

| | |
|---|---|
| من هەمبوو | ئێمە هەمانبوو |
| تۆ هەتبوو | ئێوە هەتانبوو |
| ئەو هەیبوو | ئەوان هەیانبوو |

**شێوەی ناکراوی**

| | |
|---|---|
| من نەمبوو | ئێمە نەمانبوو |
| تۆ نەتبوو | ئێوە نەتانبوو |
| ئەو نەیبوو | ئەوان نەیانبوو |

لە رستەی ئۆبێکتیدا جیٚناو بە بەرکارەوە دەلکێت‌و کاریش لە رستەی ناکراو و نانەکراودا شێوەیەکی گشتی دەبێت :-

| | |
|---|---|
| ماڵم هەبوو | ماڵت نەبوو |
| ماڵم نەبوو | تۆ ماڵت نەبوو |
| ئەو ماڵی نەبوو | ئێمە ماڵمان نەبوو |

جیٚناو له شێوەی کاری رابردووی نێزیك‌دا له رستەی بێ ئۆبێکتی‌دا به بناخەی کارەوه (هه -) دەنووسێت‌و (-ه)ش به کۆتایی شێوەی ناوی بکەرەوه (بوو) دەلکێت . پیتی (نه)ی ناکردنیش دەکەوێته سەرەتای کارەکەوه .

| | |
|---|---|
| من هەمبووه | ئێمه هەمانبوووه |
| تۆ هەتبوووه | ئێوه هەتانبوووه |
| ئەو هەیبوووه | ئەوان هەیانبوووه |

«شێوەی ناکراوی»

| | |
|---|---|
| نەم بوووه | نەمان بوووه |
| نەت بوووه | نەتان بوووه |
| نەی بوووه | نەیان بوووه |

له رستەی ئۆبێکتی‌دا جیٚناو به ئۆبێکتی دەلکێت‌و پیتی (نه)ی ناکردنیش شوێنی (هه-) دەگرێتەوه له رستەی ناکراودا :

| | |
|---|---|
| من ماڵم هەبوووه | ئێمه ماڵمان هەبوووه |
| تۆ ماڵت هەبوووه | ئێوه ماڵتان هەبوووه |
| ئەو ماڵی هەبوووه | ئەوان ماڵیان هەبوووه |

«شێوەی ناکراوی»

| | |
|---|---|
| من ماڵم نەبوووه | ئێمه ماڵمان نەبوووه |
| تۆ ماڵت نەبوووه | ئێوه ماڵتان نەبوووه |
| ئەو ماڵی نەبوووه | ئەوان ماڵیان نەبوووه |

۳۲۷ - کاری هەبین // هەبوون چوار شێوەی ئیلزامی هەیه ، دووانی داهاتوون - سادەو نەساده ، دووانیشی رابردوون - سادەو نەساده . شێوەی سادەی داهاتووی ئیلزامی له شێوەی سادەی داهاتووی ئیخیارییەوه وەردەگیرێت ، نیشانەی (ب -) شوێنی نیشانەی رانەبردوو (ده) دەگرێتەوه ، که بەجیٚناوی لکاوەوه دەنووسێت .

له رستەی ناکراودا پیتی (نه) کردن شوێنی (ب -)ی دەگرێتەوەو جیٚناوی لکاویشی پێوه دەلکێت .

أ – رستەی بێئۆبێکتی :–

**ئەگەر من بمێ**

**ئەگەر بمانێ . . .هتد .**

**ئەگەر من نەمێ**

**ئەگەر ئێمە نەمانێ . . .**

ب – لە رستەی ئۆبێکتیدا

لە رستەی نانەکراوو رستەی ناکراودا جێناوی لکاو بە بەرکارەوە دەنووسێت‌و نیشانەی نەکردنیشی دەکەوێتە پێش‌کارەوە :–

**ئەگەر ماڵم بێ ، ئەگەر ماڵم نەبێ**

شێوەی نەسادەی داهاتووی ئیلزامی کاری هەبوون لە بناخەی رابردووەوە (هەبوو –) دادەرێژرێت بە پێوەلکانی شێوەی کەسی سێیەمی تاك بۆکاتی داهاتووی ئیلزامی کاری (بوون) . بناخەی ناوی (هە –) ، کە لە (هەبوون)ەوە شوێنی (ب –)ی دەگرێتەوە ، کە جێناوی لکاوی پێوە دەلکێت لە شێوەی ناکردنیدا پیتی (نە) شوێنی (ب–)ی دەگرێتەوە :–

أ – لە رستەی بێئۆبێکتیدا

| | |
|---|---|
| **ئەگەر من بمبووبێ ،** | **ئەگەر ئێمە بمانبووبێ ،** |
| **ئەگەر من نەمبووبێ ،** | **ئەگەر تۆ نەتبووبێ** |

ب – لە رستەی ئوبێکتیدا

جێناوی لکاو بە بەرکارەوە دەلکێت . لە رستەی ناکراوو نانەکراودا پیتی (نە) کردن بەپێش کارەوە دەکەوێت .

ئەگەر من ماڵم (هە) بووبێ .

ئەگەر من ماڵم (نە) بووبێ .

شێوەی سادەی کاری رابردووی ئیلزامی لە شێوەی سادەی دەمکاتی ئیخباری (هەبوو) دادەرێژرێت ، لێرەدا پێشگری (ب –)ی شوێنی بناخەی کار (هە–) دەگرێتەوە ، نیشانەی (–ایە) بە بناخەی (بوو –) دەنووسێت .

أ – لە رستەی بێئۆبێکتیدا

**ئەگەر من بمبوو وایە .**

ئەگەر ئێمە بوو وایە
ئەگەر من نەم بوو وایە .
ئەگەر ئێمە نەمان بووایە .

ب - لە رستەی تۆبێکتیدا

ئەگەر من ماڵم (هە) بوو وایە .
ئەگەر من ماڵم نەبوو وایە .

٣٢٨ - بەکارهێنانی کاری هەبین // هەبوون بۆ بەخشینی واتای (هەبوون) لە کرمانجیدا بەکاردێت . لەم بارەدا هەروەکو دیالێکتی خواروو لە هەموو شێوەکانی رابردوو رانەبردوودا وەکو کارێکی تێپەر رەفتاردەکات . لە سۆرانیدا ئەم کارە لە هەموو شێوەکانیدا وێنەیەکی گشتی هەیە ، بەلاّم ل کرمانجیدا لەگەڵ ئۆبێکتدا رێك‌دەکەوێت . جیاوازی نێوان بەکارهێنانی ئەم کارانە (هەبین // هەبوون) لە سۆرانیو کرمانجیدا رەفتاریانە لەگەڵ بەرکاردا .

یەکەم جۆر ، کە زۆر بەکاردێت ، رێککەوتنی کارە لەگەڵ سوبێکتدا ، دژمنایەتی کۆنت هەیە . تایبەتێتی ئەم جۆرە قسەیە لە کرمانجیدا لەمەدایە ، کەوا بەرکار لە شێوەی تیاندا دەبیّو برێتی دەبێت لە جیّناوی کەسیو لە رستەش‌دا سوبێکتی رووداوەکەیە .

دوو ژاراڤاێین وی هەیە (خوەندنا کوردی- ٢٤)

جۆری دووەمی بەکارهێنانیکاری هەبین // هەبوون لە واتای (هەبوون)دا لە رووی دارشتنەوە بەتەواوی لەگەڵ پێکهاتنی ئۆبێکتی کاری تێپەرەوە رێك‌دەکەوێت . نیهاد لە شێوەی تیان‌دا دەبێتو بەپێش بەرکار دەکەوێتو لەگەڵ کاریش‌دا دەگونجێت :

من کتێب هەیە (فۆلکلۆرا کرمانجی - ٣٤)

ئەم جۆرە بەکارهاتنەی کاری هەبین // هەبوون بەزۆری لە بەشە دیالێکتی کوردی سوری هەیەو لە وێژەی کلاسیکی کرمانجیدا هەیە بەرچاودەکەوێت :

دژمنایەتی کۆنت هەیە (هیوا ، ١ ، ٤٩)

پاش‌دا ئەم شارە ئەم هەموو سامانو دەولەتی هەیە ، منداڵەکی نییە (مەکەتری - ٣٢)
بێوەژنەکە تەنها برازایەکی جووانی چواردە ساڵی هەبوو ، لەو منداڵە بەدەر کەسەکی تری نەبوو (حکایەتی زادیج - ١٧٠)

کتێبا من هەیە . قەلەمێن تە هەنە (فۆلکلۆرا کرمانجی - ٤٧)
وی برایەك‌و پسمامەك هەنە (فۆلکلۆرا کرمانجی - ٣٤)

من نەزارە نەئەزمانە ، تە نەدین نەئیمانە ( رۆژی نویٚ ، ٢٧ ، ٣٢)
تاژدین دوو برا هەبوون . (مەمو زین - ٥٠)

**«کاری ویستن»**

کاری ویستن لە دیالێکتی خواروودا بەکاردێت‌و لە شێوەی رابردوودا وەکو کاری تێپەر گەرداندەکرێت ، هەروا شێوەی رانەبردوو و داهاتووشی وەکو کاری تێپەر گەرداندەکرێت بە پێچەوانەی کارانی‌دی .

هەروا ئاشکرایە لە شێوەی کاری تێپەردا ، کە لە بناخەی رانەبردووەوە دارێژراوە جیٚناوی لکاو بەکارنایەت ، بەلاٚم (ویستن) لە کاتی گەردانکردنی‌دا بۆ کاتی رانەبردوو جیٚناوی لکاو دەکەوێتە نێوان نیشانەی (دە)ی کاتی ئێستەو بناخەی کارەکەوە :-

**«کاری ویستن بۆ کاتی رانەبردوو و ئێستە»**

| کەس | تاك | کۆ |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | من دەمەویٚ | ئێمە دەمانەویٚ |
| دووەم | تۆ دەتەویٚ | ئێوە دەتانەویٚ |
| سێیەم | ئەو دەیەویٚ | ئەوان دەیانەویٚ |

لە رستەی نەرێ‌دا پیتی (نا) شوێنی نیشانەی (دە ، د ، ئە)ی رانەبردووی دەگرێتەوە :-
من نامەویٚ ، تۆ ناتەویٚ ، ئەو نایەویٚ . . .

**«شێوەی داهاتووی ئیلزامی»**

| تاك | کۆ |
| --- | --- |
| ئەگەر من بمەویٚ | ئەگەر ئێمە بمانەویٚ |
| ئەگەر تۆ بتەویٚ | ئەگەر ئێوە بتانەویٚ |
| ئەگەر ئەو بیەویٚ | ئەگەر ئەوان بیانەویٚ |

لەکاتی دارشتنی باری ناکراودا پیتی (نە) شوێنی پێشگری (ب -) دەگرێتەوە :
**ئەگەر من نەمەویٚ ، ئەگەر تۆ نەتەویٚ ، ئەگەر ئەو نەیەویٚ .**

